رۆمان





فیۆدۆر
دۆستۆیڤسکی

# قومارچی



وەرگێڕانی:
فەیسەڵ خەلیل







ڕۆمان

فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

# قومارچی

وەرگێڕانی

فەیسەڵ خەلیل

AWER
Nawendi Awer

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٣٤٣

# قومارچی

## ڕۆمان

نووسینی: فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی
وەرگێڕانی: فەیسەڵ خەلیل
دەرهێنانی هونەری: عەلی خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
تیراژ : (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٧٠٠٠) دینار
شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٤٢٦) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان:هەولیر-پشت پاریزگا-بەرانبەر دەرگای قەلات

ژمارەی مۆبایل: 07504209495 - 07504242101

ئیمەیڵ : Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک: www.facebook.com/nawendi Awer

بیرۆکـەی نووسـینی ڕۆمـانی (قومارچـی) لـە سـاڵی ١٨٦٣ لای دۆستۆیفسکی گەلاڵە دەبێـت، ئەمـەیش لەسـەروبەندی ئـەو گەشـتە دەبێت، کە لەگـەڵ پاولینـا سۆسـلۆڤا بـۆ دەرەوە ئـەنجامی دەدات. کاتێك دۆستۆیفسکی لە ڕێگەی پاریس دەبێت، بۆ ئەوەی بچێتە لای خۆشەویستەکەی کە لە شـاری (فسـبادن)ی ئـەڵمانی ماوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی قومـاری ڕۆلێـت بکـات، ئـەویش ئـارەزووی یـاریکردنی ئـەم قومارەی بۆ دروست دەبێت، دەباتەوە. وا دەزانێ درکی بە ڕێساکان کردووە، بۆیە بە پەیڕەوکردنی ئەو ڕێسایانە دەتوانێ زامنی بردنەوە بکـات. دۆستۆیفسـکی خـۆی ئەمـە بـۆ (فـەرفارا)ی کۆنسـتانی خوشـکەژنی یەکـەمی دەگێڕێتـەوە و لەنامەیەکـدا نووسـیویەتی" بەڕاستی وام لێهاتووە، نهێنییەکە دەزانم، نهێنیەکی تـەواو سـادەیە، دەبێـت پیـاو ماوەمـاوە ڕێگـە بـەخۆی نـەدات، هـیچ بایـەخێك بـە قۆناخەکانی یارییەکە بدات، دەبێت بەسەر مێشکی خۆیدا زاڵ بێـت، ئەمە هەموو شتێکە، ئەگەر ئەم ڕێسایانەی پەیڕەو کرد ئەوا مەحاڵـە بـدۆڕێ". بـەلام دۆستۆیفسـکی هـەر خـۆی بـۆ خوشـکەژنەکەی دەگێڕێتەوە، لەیاریکردن چ بەدبەختیـەك بـەرۆکی گرتـووە، چـەندان نەهامەتی بینیوە. لەنامەیەکدا کە هەفتەیەك دوای نامـەی یەکـەم لـە بادنەوە بۆی ناردووە، دەڵێ" لەشاری فسبادن شـێوازێکی تایبـەتی





یاریکردنم بۆ خۆم داناوه، هەر زوو دە هەزار فرانکم بردەوە. کەچی بەیانییەکەی بەهۆی جۆش و خرۆشی خۆم، شێوازەکەم گۆڕی، یەکسەر دۆڕام، ئێوارە گەڕامەوە سەر شێوازی پێشووترم، بە وردی ڕێساکەیەم جێبەجێ کرد، سەرلەنوێ بەپەلە و بە کۆششێکی کەم، سێ هەزار فرانکم بردەوە. ئێستا پێم بڵێ: ئایا من لەسەرهەق نییم، پەرۆش بم و وابزانم بە جێبەجێکردنی شێوازەکەم بە ڕێکوپێکی، کامەرانیم خستووەتە سەر دەستی خۆم؟))

هەمان پێویستبوون بە پارە، توێنێتی دەوڵەمەندبوون بۆ دڵخۆشکردنی کەسوکاری، سەرچاوەی دەرکەوتنی وێنەی سوپەرمانە شکستخواردووەکە بوو: راسکۆلینکۆڤ کە پاڵەوانی ڕۆمانی (تاوان و سزایە)، بەڵام دۆستۆیڤیسکی بەر لەوەی وێنای ڕۆمانی (تاوان و سزا ) بکات، دەیەوێ قسە لەسەر بابەتێکی دیکە بکات، بۆیە دەبینین لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٨٦٣ نامەیەك بۆ ستراخۆڤ دەنووسێ و دەڵێ" ئێستا شتێکی ئامادەم نییە، بەڵام پلانێکی سەرکەوتووم بۆ چیرۆکێك داناوە، (بەبڕوای من) بابەتەکەی بەم شێوەیە: گەنجێکی رووسی لەدەرەوە.. کارەکتەرێکی زیندووە، ( وا هەست دەکەم لەبەر دەمم وەستاوە)... خاڵی سەرەکی ئەوەیە هەموو گەنجێك تەژییە لە ئاوی ژیان، تەژییە لەهێز، هەمووی هەڵدەقوڵێ، هەموو بوێری و جەربەزەییەکانی، بە ڕۆلێت لەناو دەچێ. ئەم گەنجە قومارچییە، بەڵام تەنها قومارچییەك نییە، وەك سوارچاکە قرچۆکەکە نییە کە پوشکین تەنها وەك قرچۆکێك وێنای کردووە ( من نامەوێ خۆم بە پوشکین

بەراورد بکەم، تەنها بۆ روونکردنەوە ئەمەم وت)، ئەمەیان شاعیرە لەجۆرێکی تایبەت، بەڵام هەست بەشەرمەزاری و نەنگی دەکات لەم شیعرە، ئەو هەست بە قووڵی هەست بە بچووکی خۆی دەکات، هەرچەندە تینووبوون بۆ جەربەزەیی وا دەکات بەرزتر لەخۆی بڕوانێ. تەواوی چیرۆکەکە ئەوەیە چۆن ئەو گەنجە لەماوەی سێ ساڵ بەرەو یەکێك لە قومارخانەکان دەڕوات. لەبەر ئەوەی کتێبەکەم ( خانەی مردووان) سەرنجی خەڵك بەوە راکێشا کەسێك پێشتر بەم شێوە زیندووە باسی زیندانییەکانی نەکردووە، بێگومان ئەم چیرۆکەیشم سەرنجی خەڵك بۆ وەسفێکی وردی رۆلێت رادەکێشێ. وەسفی دۆزەخێکە زۆر لە دۆزەخی گرتووخانە دەچێت". بەڵام روونە ئەم چیرۆکە لەرووی بەپێزی و مەزنییەوە هاوشانی (ماڵی مردووان) نییە، بێگومان نووسەر خۆی هەستی بەمە کردووە، تەنانەت تا سێ ساڵ دواتر باسی ئەم پرۆژەیەی نەکردووە.

لەڕاستیدا تەواوی ئەم ماوەیە دۆستۆیڤیسکی سەرقاڵی نووسینی ڕۆمانەکەی دەبێت (تاوان و سزا) ئەم ماوەیە بەردەوام پێداچوونەوەی بۆ دەکات و پاکنووسی دەکات و گۆڕانکاری تێدا ئەنجام دەدا. لەم ماوەیەدا هەڵێك دەقۆزێتەوە چیرۆکی ( یاداشتەکانی ژێر زەوی) دەنووسێتەوە، جارێك دیکەش دەگەڕێتەوە سەر ڕۆمانە گەورەکەی ئەویش (تاوان و سزا)یە، کە لە شوباتی ١٨٦٦ بڵاو دەکرێتەوە. لە ڕۆژی یەکەمی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ دۆستۆیڤیسکی ئەو گرێبەستەی بیردەکەوێتەوە کە لەگەڵ پەخشکاری چاوچنۆك ستیلۆڤسکی بەستوویەتی. بەپێی ڕێکەوتنەکە

دەبێت دۆستۆیڤیسکی لە رۆژی یەکەمی تشرینی دووەم رۆمانێکی نوێ بە دەزگاکەی ستیلۆفسکی بدات، پێشتر رۆمانەکە بڵاونەکرابێتەوە، بەلایەنی کەمەوە، بە دە مەلزەمەی لاپەڕەی گەورە نووسرابێتەوە. ئەگینا مافی لە چاپدانی سەرجەم نووسراوە کۆن و نوێیەکانی لەدەست دەدا. میلیۆکۆڤی هاورێی ئامۆژگاری دەکات رۆمانەکەی بۆ بخوێنێتەوە، (هێشتا یەك دێڕی نەنووسیوە) کچێکیش بەرێنووسی ئیختیزال( کورتکردنەوە) بینووسێتەوە، لەچواری تشرینی یەکەم کچێك بەناوی ئانا سنیتکین دێتەلای، دۆستۆیڤیسکی رۆمانەکە دەخوێنێتەوە، ئەویش دەینووسێتەوە، کارەکە بەباشی دەڕوات، تەنها بیستوچوار رۆژ دەخایەنێ، رۆمانەکە تەواو دەبێت، هەرچەندە پەلەی نووسینەوەی تێدا کراوە، بەلاَم رۆمانێکی چاکە. لەمیانەی خوێندنەوەی خوێنەر بەڕوونی هەست دەکات، دۆستۆیڤیسکی بەشێکی چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەمە رۆمانی چیرۆکێکی ئازاربەخشە، دۆستۆیڤیسکی لەگەڵ پاولینا سۆسلۆڤا تێدا ژیاوە (ناوەکەشی لە رۆمانەکە وەك خۆی ماوەتەوە).
پاڵەوانی رۆمانەکە گەنجێکە بەناوی ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ مامۆستای منداڵەکانی ژەنەڕاڵێکی رووسیە. ئەو گەنجە دەکەوێتە بەر بەرداشی دووخۆشەویستی پڕ سەرکێشی، یەکەمیان ئەو خۆشەویستیەیە کە بۆ پاولینا ئەلکسەندەرۆڤنای دڵڕەق و نامۆ هەیەتی، دووەم ئەو ئارەزووەیە کە بەردەوام دەیباتەوە سەر مێزی یاری رۆلێت.
خۆشەویستیەکەی بۆ پاولینا تێکەڵە لە ئەڤین و ڕق، ئەلێکسی ددان بەوە دەنێت لە کۆیلایەتی خۆی لەبەردەم پاولینا چێژێکی زۆر

وەردەگرێت، پێی دەڵێ لە ریسوا بوون و کەوت چێژێکی مەزن هەیە... بۆیە بە پاولینا دەڵێ: سوود لەکۆیلەیی من وەربگرە، سوودی لێوەربگرە.... دەزانی من رۆژێك لەرۆژان دەتکوژم؟

ئارەزووی قومارکردنیش لەدەروونی پاڵەوانەکە تێکەڵ بە ئارەزووی خۆشەویستی دەبێت. هەروەك چۆن ساتێك لەساتەکان لەدەروونی دۆستۆیڤیسکی تێکەڵ بووە. دۆستۆیڤیسکی لەم رۆمانە وێنای جۆرێك لە شەیدابوون، جۆرێك لە سیحر، جۆرێك لە ورێنە دەکات، تەنانەت جۆرێك لە بەرەنگاربوونەوەی قەدەر..! هنری لەبری دۆستۆیڤیسکی دەڵێ" رۆلێت ئەو هەلەی بۆ رەخساند یاری قەدەر بکات، وەك چۆن قەدەر یاری بەو دەکرد". هنری ترۆیا راست دەکا. بەهۆی رۆلێتەوە دۆستۆیڤیسکی (دیوار) دەبەزێنێ، دیواری لۆژیك، کە پاڵەوانەی چیرۆکی یاداشتەکانی ژێر زەوی خۆی دەداتە پاڵ، لێرەوە بۆ گۆڕانی رێکەوت و نالۆژێك دەچێت، دەڵێ" لێرەوە مانایەك بۆ ئەو قسەیەت نامێنێ، کە دەڵێی دوو کۆ دوو دەکاتە چوار، قومارکردن ئەزموونی یەکەمی ئازادییە لەجیهانی ماددییەتدا".

لەم رۆمانەدا دۆستۆیڤیسکی وێنەی چەندان کەسایەتی دیکە سەیر وسەمەرە دەکێشێ، لەوانەیە کارەکتەری پاپۆلنکای پیرەژنەکەیە کە ژەنەراڵ( پیاوە بوودەڵەکە) چاوەڕوانی هەواڵی مردنی ئەو پیرژەنە دەکات. وەسفی دیستۆیڤیسکی بۆ ئەو پیرەژەنە چەند نایابە، کە شەیدای قومار دەبێت، کەچی لەسەرەمەرگ دایە. ئەگەر نووسەر لەم رۆمانە وێنەیەکی نەخوازراو بۆ رووسەکان دەکێشێ، ئەوا وێنەیەی بۆ

غەیرە رووسەکانی کێشاوە، هێندە لەوان باشتر نییە، لەوانە خاتوو بلانش کە ژنێکی فەرەنسییە، خۆی دەبەخشێتە ئەو کەسەی پارەی زیاتری پێ بدات. هەروەها دی گرێو کە رۆڵی مشتەخۆرێکی هەیە، سەرەرای رقوکینەکانی، بارۆنی ئەڵمانی بەفیز وخۆبەزلزانە کەچی کەسێکی دەبەنگە، سێ پۆلۆنییەکە دزن، هەموو ئەمانە غەیرە رووسن، بەلآم کارەکتەرێکی پەسەندیان نییە. لێرەوە هەست بەو نائومێدییە دەکەین کە دۆستۆیڤیسکی لەبەرامبەر ئەوروپای رۆژئاوای هەبووە، ئەمەشیانی لە (یادگارییەکانی زستان لەهەستەکانی هاوین) باس کردووە. لێرەوە تەنها یەك جیاکردنەوە هەیە، ئەویش کەسایەتی مستەر ئاستلییە، پیاوێکی ئینگلیزە، بەلآم بێدەنگ و چاکەخوازە، خۆشەویستی بۆ پاولینا هەیە، ئەو هەستەشی دەردەبرێ، دەستی هاریکاری بۆ ئەلێکسی درێژ دەکات، جیا لەوەیش ئاستلی هەوڵ دەدا هەموو خراپانە چاك بکاتەوە، کە کارەکتەرە سەرەکییەکانی چیرۆکەکە ئەنجامیان داوە. مرۆڤ کە ورد دەبێتەوە، هەست دەکات یاری رۆڵێت بۆ رووسەکان داهێنراوە. ئەوان زۆر شەیدای یاریکردن و زێدەرۆیی تێدا دەکەن، دۆستۆیڤیسکی لێرە لەسەر زمانی مستەر ئاستلی باسی ئەم دوو بەدرەفتارییە دەکات، کە دواجار خۆیانی لێ پاك دەکاتەوە.





# بەشی یەکەم

دواجار، دوای دابڕانی پانزە ڕۆژ گەڕامەوە، هاوڕێکانم سێ ڕۆژ بوو گەیشتبوونە ڕۆلتنبێرگ. وا پێشبینیم دەکرد، ئەوان بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی من بکەن، بەڵام دەرکەوت هەڵە بووم. ژەنەراڵ زۆر لەسەرخۆ دیار بوو، بە فیزەوە هەنگاوی دەنا. بەلوتبەرزی هەندێك قسەی لەگەڵ کردم و دواتر منی ڕەوانەی لای خوشکەکەی کرد. وەك دەردەکەوێ ئەوان کەسێکیان دۆزیوەتەوە پارەی لێ قەرز بکەن. تەنانەت هەستم دەکرد ژەنەراڵ بە ئامادەبوونی من دڵتەنگ و نیگەرانە. ماری فیلیپۆڤینا پەشۆکاو بوو، تەنها چەند وشەیەکی لەگەڵ من درکاند، دواتر ئەو پارەیەی ژمارد کە بۆم هێنابوو. ئەوان هەموویان چاوەڕوانی ئێوارەخوانێك بوون، کە هەریەکە لە میزتنۆڤ و فەرەنسییەبچووکەکە و پیاوێکی ئینگلیزی تێیدا ئامادە دەبێت. ئەمە نەریتی خەڵکی مۆسکۆیە هەرکە پارەیان دەستکەوێ ئەوا خەڵك بانگهێشتنی ئێوارە خوانەکانیان دەکەن. کاتێك پاولینا ئەلیکسندەرۆڤنا منی بینی، پرسیاری ئەوەی لێ کردم



بۆ ماوەیەکی زۆرە دیار نییم، کەچی بەر لەوەی وەڵامی من ببیستێ، رۆیشت. زۆر دڵتەنگ بووم ، زۆر شت هەبوو دەبوایە ڕوونی بکەمەوە.

ژوورێکی بچووك لە نهۆمی چوارەمی هوتێلەکە بەمن دراوە. خەڵك دەزانێ من یەکێکم لە دەست و پێوەندەکانی ژەنەڕاڵ. ئەمەش وای کردووە سەرنجی خەڵکەکە رابکێشم، هەموو خەڵك لێرە وا دەزانن ژەنەڕاڵ یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی رووسیا، سامانێکی بێ شوماری هەیە. بەر لە ئێوارەخوانەکە ژەنەڕاڵ داوای کرد هەندێك کار ئەنجام بدەم، لەوانە دوو کاغەزی دراوی پێدام بۆ ئەوەی بیانگۆڕمەوە (هەر یەکەیان هەزار فرانك بوو)، منیش لە نووسینگەی هوتێلەکە گۆڕیمەوە. لەمەودوا، بۆ ماوەی دوو هەفتە خەڵك وەك ملیۆنێر سەیریمان دەکات. بەدوای میشا ونادیا دەگەڕام بۆ ئەوەی پیاسەیەکیان پێ بکەم. لە قاندرمەکان دادەبەزیم کاتێك ژەنەڕاڵ بەدوای ناردم. گوایە بەلای چاکتر بووە، بزانێ من ئەم دوو منداڵە بۆ کوێ دەبەم. ئەم پیاوە ناتوانێ ڕووبەڕوو لەگەڵم بدوێ، ئەم خوازیاری ئەوەیە، بەڵام من بەچاوەکانم، بێ شەرمانە لەڕووی ڕادەچمەوە، ئەمیش لەم کارە بێ ئۆقرە دەبێت.

دوای ئەوەی لەقسەکانی هێنا و بردی، بە تێکەڵ وپێکەڵی تێیگەیاندم، دەبێت لە باخچەی نزیك گازینۆکە پیاسە بەمنداڵەکان

بکەم. بۆئەوەی قسەکانی تەواو بکات بە تورەیی و بەزمانێکی رق وتی:

– یان ئەوا مندالآنە دەبەیتە رۆلێت؟ ببوورە ئەگەر ئەمە دەلێم، بەلآم دەزانم هەتا ئێستا سەرەڕۆیی، ملکەچی ئارەزووی قوماربازییت . بەهەرحالّ، من کەسێك نیم، بتوانم ڕێگەی راست بەتۆ نیشان بدەم، نامەوێ ئەم ئەرکەشم هەبێت. بەلآم مافی ئەوەم هەیە هیوای ئەوە بخوازم ناوبانگم لەکەدار نەکەی. ئەگە رێگەم پێ بدەی ئەم قسەیەم کرد.

من بەهێمنی وتم:

–بەلآم تۆ زۆر بە چاکی دەزانی من پارەم نییە، دەبێت پیاو پارەی هەبێت، تا لە قوماری بدۆڕێنێ.

ژەنەڕالّ تۆزێك سوور هەلّگەڕا و وتی:

–ئێستا پارەت پێ دەدەم

ئەم قسەیەی کرد، دواتر کەمێك لە نووسینگەکەی گەڕا، دەفتەرێکی دەرهێنا، بینی ئەو نزیکەی ١٢٠ رۆبلّی من قەرزارە.

دواتر وتی: چۆن ئەم پارەیەت لەگەلّ حیساب بکەم، دەبێت پارەکان بکەینە تالێر ، ئێستا ئەم سەد تالێرە بگرە دواتر ئەویتریان حیساب دەکەین. پارەکەی بەمن دا و وتی:



-له قسه‌كانی من توڕه مه‌به، به‌لاّم تۆ كابرایه‌كی به گێچه‌ڵی، بۆیه ئه‌و تێبنیه‌م به‌تۆ دا، وه‌ك ئاگاداركردنه‌وه، وا ده‌زانم ئه‌مه مافی خۆمه.

به‌ر له‌خوانه‌كه كاتێك منداڵه‌كانم ده‌گه‌ڕانده‌وه، له ڕێگه بینیم ئه‌و هاوڕێیانه‌م سواری گالیسكه‌كان بوون، به‌ره‌و بینینی هه‌ندێك شوێنه‌وار ده‌ڕۆیشتن. به دوو گالیسكه‌ی مه‌زن، چه‌ند ئه‌سپێكی چاك! خاتوون بلانش و ماری فیلیۆڤینا و پاولینا له یه‌كێك له گالیسكه‌كان بوون، فه‌ڕه‌نسیه بچووكه‌كه و پیاوه ئینگلیزه‌كه و ژه‌نه‌ڕاڵی هاوڕێمان له گالیسكه‌كه‌ی دیكه بووون. ڕێبواران سه‌یری ئه‌وانیان ده‌كرد. ئه‌مه كاریگه‌ری خۆی ده‌بێت، به‌لاّم كۆتاییه‌كی شوومی بۆ ژه‌نه‌ڕاڵ ده‌بێت. من وامزانی ته‌نها ئه‌و چوار هه‌زار فرانكه‌یان هه‌یه كه بۆیانم هێناوه، به‌لاّم له‌وه ده‌چێ هه‌ندێكی دیكه‌شیان قه‌رز كردبێت. ئێستا ئه‌وان حه‌وت تا هه‌شت هه‌زار فرانكیان هه‌یه، ئه‌مه‌یش بۆ خاتوو بلانش زۆر كه‌مه.

خاتوو بلانش له‌گه‌ڵ دایكی له هه‌مان هۆتێلن، كه ئێمه لێی دابه‌زیوین، هه‌روه‌ها فه‌ڕه‌نسیه‌كه‌ش له‌وێیه. خزمه‌تكاره‌كانی هۆتێله‌كه به پیاوه فه‌ڕه‌نسیه‌كه ده‌ڵێن به‌ڕێز كۆنت، به‌لاّم دایكی خاتوو بلانش به خاتوو كۆنتیسه بانگ ده‌كرێت. كێ ده‌زانێ له‌وانه‌یه هه‌ر به‌ڕاستی كۆنت و كۆنتێسه بن.

بێگومان بووم لەوەی لەکاتی خوانەکە کۆنت خۆی لەمن نەناس دەکات. وەك ڕوونە ژەنەڕاڵیش بۆ چرکەستاێکیش ئەوەی بەخەیاڵ نایەت بەیەکتریمان ناسێنیێ، یان بەلایەنی کەمەوە من بەوان بناسێنێ. کۆنت لە ڕووسیا ژیاوە، کەواتە دەزانێ ئاستی نزمی ئەو کەسانە چۆنە کە بە (ئۆتشیل– بەخێوکەر) ناودەبرێن. لەسەرووی ئەوانەشەوە کۆنت بەڕاستی من دەناسێ. من لە خوانەکە میوانی ناوەخت بووم، ژەنەڕاڵ ئەوەی لەبیرکردەوە من بانگهێشت بکات، من لەخۆمەوە هاتم، ژەنەڕاڵ کەمنی بینی، بە بێزاری نیگای کردم، هەر زوو ماری فیلیپۆڤینا شوێنێکی بۆ دەست نیشان کردم. گەیشتم بە مستەر ئاستلی، لە شەرمەزابوونەکە نەجاتی دام، ئێستا من یەکێکم لەمیوانەکان.

لە پروسیا بۆ یەکەم جار، بەم پیاوە سەیرو سەمەرەیە گەیشتم، کە بە مستەر ئاستلی ناودەبرێت، بەیەکەوە لەناو شەمەندەفەرێك بووین، ئەمە ئەو کاتە بوو کە سەفەرم دەکرد بۆ ئەوەی بەهاوڕێیانم بگەمەوە. جارێکی دیکەیش لە سنوورەکانی فەرەنسا، دواجاریش لە سویسرا مەستەر ئاستلیم بینی. واتە لەماوەی پانزە ڕۆژدا دوو جار بەدیداری گەیشتووم، ئەوەتا ئێستاش لە ڕۆلتنبێرگ بەدیدای ئەم پیاوە دەگەمەوە! لەهەموو ژیانم پیاوێکی هێندە شەرمنم نەدیوە. ئەو تا ئاستێکی سەیر شەرمنە. ئەو بەتەواوی ئەو خەسڵەتەی خۆی دەزانێ، ئەو هەرگیز پیاوێکی

دەبەنگ نییە. لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی پڕ ئاشتەوایی و رووخۆش بوو. هەر لە دیداری یەکەم هێنامە دواندن، باسی ئەوەی کرد لە هاوین بەرەو باکوور رۆیشتووە، زۆر ئارەزوو دەکات پیشەنگاکانی (نیگنی نۆڤگۆرود) ببینی. نازانم پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژەنەراڵ چۆنە، بەڵام خەیاڵی ئەوە دەکەم زۆر شەیدای پاولینا بێت، کاتێك من چوومە ژوورەکەوە رووی سوور هەڵگرا، زۆر پێداگری کرد لەوەی لەسەر خوانەکە لەتەنیشت ئەو دانیشم، وا هەستە دەکەم ئێستا ئەو مستەرە بەهاوڕێیەکی نزیکم دەزانێ.

پیاوە فەرەنسییە بچووکەکە زێدەڕۆیی لەوە دەکرد بارودۆخەکان تێکەڵ و پێکەڵ بکات، زۆر بە ڕق و بێباکانە مامەڵەی لەگەڵ خەڵك دەکرد. لەبیرمە ئەو لە مۆسکۆ خۆڵەمێشی دەکردە چاوی خەڵکەوە. ئەم شەوە لەباسی دارایی و سیاسەتی رووسیا، زۆر درێژدادڕی کرد. ژەنەراڵ جارێك دووجار رێگەی بەخۆی دا نارەزایی لەقسەکانی هەبێت، بەڵام ئەمەیش بە هێمنی و بەڕووخۆشی دەکرد، نەوەك هەیبەتی خۆی لەدەست بدات.

من لە بارودۆخێکی دەروونی سەیر دابووم، من لەنیوەی خوانەکە گەیشتبووم، هەر ئەو پرسیارە هەمیشەییەم لەخۆم دەکردەوە "چیی من بەدوای ئەو ژەنەراڵە رادەکێشێ؟ دەکرا لە زووەوە واز لەوانە بهێنم!". جارجارە نیگای پاولینا ئەلیکسەندەرۆڤنام دەکرد،

تێبینی ئەوەم کرد هیچ سەرنجێکم نادات. بۆنی خەرتەڵەکە بۆ لـووتم دەهات، بڕیارم دا سەرەڕۆییەك بکەم.

بـــۆ ئەمــــەیش دەبووایــــە، لــــەناکاو خــــۆم هەڵقورتێنمــــە نـــاو گفتوگۆییەکانـەوە. بێئـەوەی کەسێك ئیزنـی قسـەکردنم پـێ بـدات. بەدەنگێکی بەرز دەستم بەقسـان کـرد. دەمویسـت مشـتومڕ لەگـەڵ فەڕەنسییە بچووکەکە بکەم. ڕووم لە ژەنەڕاڵ کرد بێ پێشـەکی، (وا بزانم قسەم بـە ژەنـەڕاڵ بـڕی): خەریکـە ئـەوە مـەحاڵ دەبێـت ئـەم هاوینـە ڕووسـەکان ژەمـە خواردنـەکانیان بـە ئامـادەکراوی بخـۆن. کاتێـك ژەنـەڕاڵ ئەمـەی لـەمن بیسـت بەسەرسـامییەوە چـاوی لـێ داگرتم، منیش لەسەر قسەکانم ڕۆیشتم و وتم:

–ئەوەی ریزی خۆی بگرێت، بێگومان دەبێت ڕووبـەڕووی بێئـەدەبی و سووکاییەتی ببێتەوە. لەپاریس، لە نزیك ڕووباری رایـن، تەنانـەت لە سویسـراپیش، دەبینـی خـوان بـۆ پۆلۆنییـەکان و هاوشـێوەکانیان ئامادەکراوە، کە بێچووە فەڕەنسییەکانن، تۆش ئەگەر رووسی بیت، ناتوانی وشەیەك بدرکێنیٚ.

ئەمــــەم بــــە فەڕەنســــی وت، مــــیر بەسەرســــامی ســــەیری دەکــــردم، نەیدەزانی وەڵامم بداتەوە، یان تەنها بەسەرسامی سـەیرم بکـات، تـا خــۆم لــەبیر دەکــەم. فەڕەنســییە بچــووکەکە بــە زمــانێکی ڕق و بەفەرامۆشییەوە وتـی:

–لەوانەیە کەسێك تەمێ کردبی.

وەلآمم دایەوە:

– لە پاریس لەگەڵ پۆلۆنییەك کەوتەمە دەمەقاڵێ، دواتر لەگەڵ ئەفسەرێکی فەرەنسی، کە لایەنگری پۆلۆنییەکەی دەکرد، دواتر کاتێك باسی ئەوەم کرد تفم کردووەتە قاوەی یەکێك لە کاهینە گەورەکانی (مۆنسینیۆر) بەشێکی زۆری فەرەنسییەکان بوونە لایەنگری من.

– تفت کرد؟

هەروەها ژەنەراڵیش بەسەرسامی و بەفیزەوە ئەم پرسیارەی کرد، دواتر چاوی بەژوورەکە گێڕا، فەرەنسیەکەیش لێم وردەبووەوە.

منیش وتم:

–ڕێك ئەوها تفم کرد. بۆ ماوەی چلوهەشت سەعات مامەوە، دەبووایە بۆ بابەتەکەمان بچمە ڕۆما، لەبەرئەوە دەبوو ڤیزای باڵۆیزخانەکەی پاپا وەربگرم. لە باڵوێزخانەکە قەشەیەکی باڵا کورت پێشوازی لێ کردم ، تەمەنی نزیك پەنجا ساڵێك دەبوو، لاواز، دەموچاوێکی ساردوسڕی هەبوو. دوای ئەوەی گوێی لەقسەکانم بوو، بە زمانێکی پڕ ئەدەب و وشك تکای کرد چاوەڕوان بم، منیش بە پەلە بووم، بێگومان دانیشتم. ڕۆژنامەی (ئۆپینیۆن ناسیۆنال)م، لەگیرفانم دەرهێنا، دەستم کرد بەخوێندنەوەی یەکێك لە وتارەکانی کە هێرشێکی توندی دەکردە سەر ڕووسیا. لەو کاتەدا گوێبیستی

ئــەوە بــووم یــەکێك لــە ژوورەکــەی تەنیشــتمەوە دەچــێتە لای (مۆنسینیۆر ) قەشەکە جۆرەها رێـزی بـۆ ئـەم پیـاوە دەنواند. مـن دووبـارە داواکـەم لـەلای قەشـەکە نـوێکردەوە، دووبـارە تکـای کـرد چـاوەڕوان بم، بــەڵام ئــەمجارەیان بــەزمانێکی زبرتــر بــوو. هــەر چرکەساتێك بوو میوانەکـە وەژوور کـەوت، کاتێـك گـوێم لەقسـەکانی بوو دەرکەوت کەسێکی نەمسایییە. هەر یەکسەر بۆ سەرەوەیان بـرد، ئەوا کاتە هەستم بـەتوڕەیی کـرد، لەشـوێنی خـۆم هەڵسـامەوە و لـە قەشـــەکە نزیـــك بوومـــەوە، بـــەزمانێکی تونـــد وتم: مادەمـــەکی (مۆنسینیۆر) دەتوانێ پێشوازی لەکەسانی دیکە بکات، ئەوا دەتوانێ کارەکـانی منـیش تـەواو بکـات. قەشـەکە بەسەرسـامییەوە سـەیری کـردم، نەیـدەتوانێ ئـەوە لێـك بداتـەوە چـۆن رووسـییەك جورئـەت دەکات خۆی بە میوانەکانی مۆنسینیۆر بەراورد بکات، بۆیە لە تـۆقی سەرمەوە تا ژێر پێم سەیری کردم. بێ ئابڕوویانە هاواری کـرد، وەك ئـەوەی سـووکایەتیم پـێ بکـات و وتـی" ئەگـەر وا بێـت دەبێـت مۆنسینیۆر لەپێناو تۆ واز لـە فرکردنـی قاوەکـەی بهێنـێ". شـتێك نەمابوو ئەوە نـەبێت، منـیش دەبووایـە بـەرزتر هـاوار بکـەم و وتم" بزانـە منـیش تـف لـە قـاوەی مۆنسـینیۆرەکەی تـۆ دەکـەم، مـن بەسووکی دەزانم، ئەگەریش کاری پەساپۆرتەکەم تەواو نەکات، خۆم دەچمە دیداری".

– چۆن؟ هەر لەو کاتەی کە پێشوازی لە کاردیناڵێك دەکات؟



قەشەکە هاواری دەکرد و لەمن دوور دەکەوتەوە. بەرەو دەرگەکە دەڕۆیشت لە شێوەی خاچ باڵەکانی کردەوە دەرگاکەی لەمن گرت. دەیویست ئەوە بەمن بڵێ ئامادەیە لەناو بچێ، بەلاّم ڕێگەم نادات بچمە ژوورەوە. ئەو کاتە وتم من زەندیق و دڕندەم، من ڕێز لە ئەسقەف وکاردینال و مۆنسینیۆرەکان ناگرم، بەهیچ شێوەیەکیش مل دانادەم. بەچاوی قووڵی ڕقەوە سەیری کردم و پەساپۆرتەکەمی لەدەست راسەند و چووە سەرەوە، خولەکێك بوو گەڕایەوە، من ڤیزاکەم وەرگرت، ئێستا لەلامە، دەتەوێ سەیری بکەی.

پەساپۆرتەکەم لەگیرفانم دەرهێنا و ڤیزاکەم نیشان دا

جەنەڕاڵ ویستی دەست بەقسان بکات و تی:

–لەگەڵ ئەوەیش......

فەرەنسییە بچووکەکە، بە پێکەنینەوە قسەکانی بە جەنەڕاڵ بڕی و وتی:

– ئەوەی تۆی نەجات داوە، ئەوەیە وتووتە زندیق و دڕەندەم،( ئەمەیش پاساوێکی دەبەنگانە نییە).

– هەر چۆنێك بێت ، من ناتوانم وەك هاوڕێیە رووسەکانی تۆ بم، ئەوان دەست بەستراون، ناتوانن وشەیەك بدرکێنن. تەنانەت ئەگەر پێویست بکات، نکۆڵی لەنیشتیمانەکەیان دەکەن. بەهەرحاڵ کاتێك بەسەرهاتی دەمەقاڵێیەکەم لەگەڵ قەشەکە بۆ میوانەکانی

هۆتێلەکەی پاریس گێڕایەوە، ئەوان زۆر ڕێزیان گرتم، تەنانەت دەمشرەکەیان کە پیاوێکی پۆلۆنی نەقۆلا بوو. ڕووداوێکی دیکەم بۆ فەرەنسییەکان گێڕایەوە، کە خۆم بینیومە، دووسالّ لەمەوبەر لەسالّی ١٨١٢ ڕاوچییەکی فەرەنسی تەنها بۆ ئەوەی تفەنگەکەی خالّی بکاتەوە، مندالّێکی دە سالّانی پێکابوو، خێزانەکە نەیاندەتوانی مۆسکۆ جیّ بهێڵن.

فەرەنسییە بچووکەکە هاواری کرد:

–مەحالّە، سەربازێکی فەرەنسی ناتوانیّ تەقە لە لە مندالّێك بکات.

منیش وتم:

–لەگەلّ ئەوەیشدا ئەمە ڕوویدا، نەقیبێکی فەرەنسی خانەنیشین ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە، بەچاوەکانی خۆشم ئەو پەڵەیەم بینی کە گوللەکە لە ڕوومەتەکانی دروست کردبوو.

فەرەنسییەکە هەڵچوو بوو، دەیەویست بەپەلە قسە بکات، ژەنەڕالّ هەولّی دەدا لایەنگیری بکات. منیش لەلایەن خۆمەوە ئامۆژگاری فەرەنسییەکەم کرد بۆ ئەوەی بخوێنێتەوە، بۆ نموونە (یاداشتەکانی) ژەنەڕالّ پیرۆڤیسکی بخوێنێتەوە کە لەلایەن فەرەنسییەکانەوە لەسالّی ١٩١٢ زیندانی کراوە. دواجار ماری فیلیپۆڤینا بۆ ئەوەی بابەتەکە بگۆڕیّ، قسەی لەسەر بابەتێکی دیکە کرد. ژەنەڕالّ زۆر لەمن پەست بووبوو، لەبەر ئەوەی من و



فەڕەنسیەکە بەشێوەی جنێو ئامۆژگاری یەکترمان دەکرد، کەچی بۆم دەرکەوت دەمەقالێیەکەمان بەدڵی میستەر ئاستلی بوو، بۆیە کاتێك لە خوانەکە کشاینەوە پێشنیازی کرد پێکێك مەی لەگەڵ بنۆشم.

ئەم ئێوارەیە وەك ئارەزووم دەکرد، توانیم چارەکە کاتژمێرێك قسە لەگەڵ پاولینا ئەلسکەندرۆفنا بکەم، قسەکەی نێوانمان لەکاتی پیاسەیەك بوو، هەموو ئامادەبووانی خوانەکە لە ڕێگەی باخچەکەوە بەرەو گازینۆکە ڕۆیشتن. من و پاولینا لەسەر کورسییەکی بەردەم نافورەکە دانیشتن، ڕێگەم بە نادیادا بچێ بۆ ئەوەی لەگەڵ مندالانی نزیك خۆمان یاریی بکات، میشیاشم ناردە لای حەوزی ئاوەکە، من و پاولینا بەتەنیا ماینەوە.

وەك نەریتێك سەرەتا لەبارەی کاروبارەکانەوە قسەمان کرد، زۆر توورە بوو کاتێك ٧٠٠ فلۆرینم پێدا ! ئەو بڕوای وابوو لە بری دانانی ئەڵماسەکەی دەتوانم بەلایەنی کەمەوە ٢ هەزار فلۆرینی بۆ قەرز بکەم. پاولینا وتی:

– هەر چۆنێك بێت من زۆر پێویستم بە پارەیە، هەر دەبێت بەدەستی بهێنم، ئەگینا لەناو دەچم.

پرسیاری ئەوەم کرد لەکاتی ئامادەنەبوونی من چی ڕوویداوە، وتی:

–هیچ شتێك.. دوو هەواڵمان لە پترۆسبۆرگەوە بۆ هاتووە، یەکەمیان گوایە باری تەندروستی داپیرەمان سەختە. هەواڵی دووەم دوو ڕۆژە گەیشتووە، دەڵێن داپیرە مردووە.

دواتر پاولینا وتی:

–ئەو هەواڵەمان لە تیمۆتی پترۆڤیچ بیستووە، ئەو مرۆڤێکی وردە لەگواستنەوەی هەواڵەکان. ئێمەش چاوەڕوانی دەکەین لە دروستی هەواڵەکە دڵنیا ببینەوە.

وتم:

– هەموو لێرە چاوەڕوانن.

– بەڵێ هەموویان چاوەڕوانن، ئەوە شەش مانگمان تێپەڕاند، تەنها ئەو هیوایە دەخوازین.

– هەروەها تۆش ئەم هیوایەت هەیە؟

– من خوازیاری مردنی کەسێکی نزیك نییم، من تەنها کەسێکی نزیکی ژەنەڕاڵم، بەڵام دڵنیام لەوەی داپیرە لە وەسیەتنامەکەی لەبیرم ناکات.

بە زمانی دووپاتکردنەوە وتم:

– وا بزانم تۆ سامانێکی مەزنت بۆ دەمێنێتەوە.



– وا بزانم، ئەو منی زۆر خۆشدەویست، ئایا تۆ لەکوێ بەو باوەڕە گەیشتووی.

بەپرسیار وەڵامم دایەوە:

– پێم بڵێ: ئایا مارکیز هەموو نهێنییەکانی خێزانەکە دەزانێ؟

– ئایا مەبەستتە ئەمە بزانی؟

پاولیناش پرسیاری لێ کردم، سارد و دڵڕەقانە سەیری دەکردم.

–وا بزانم، ئەگەر مەزندەکەم هەڵە نەبێت، ژەنەڕاڵ توانیویەتی هەندێك قەرز لەو بکات.

– مەزندەکەت دروستە.

– ئایا ئەگەر چیرۆکی داپیرەی نەدەزانی قەرزی پێ نەدەدا؟ ئایا تێبینیی ئەوەت نەکردبوو، لەسەر خوانەکە سێ جار کاتێك باسی داپیرە دەکرا ئەو بە (باپۆلنکا) ناوی دەهێنا؟ ئای لەم خۆشەویستییە هەرزانە !

– بەڵێ، تۆ ڕاست دەکەی، ئەو کاتەیش خوازبێنی من دەکات، کە دەزانێ بەشم لە میراتەکە هەیە. تۆیش دەتەوێ ئەمە بزانی، ئەی وا نییە؟

– ئایا هێشتا بیر لە خوازبێنی تۆ دەکاتەوە؟ دەمێکە دەبووایە دەستگیرانی تۆ بێت.



پاولینا بە توورەیی وتی:

–تۆ دەزانی بابەتەکە بەم شێوەیە نییە.

دواتر لەناکاو وتی:

= لە کوێ بەدیداری ئەو پیاوە ئینگلیزە گەیشتووی؟

– دڵنیا بووم لەوەی ئەم پرسیارەم لێ دەکەی. منیش بەسەرهاتی دیدارەکانم لەگەڵ میستەر ئاستلی بۆ گێڕایەوە و وتم:

– پیاوێکی شەرمن و بەسۆزە، بێگومان شەیدای تۆ بووە.

– بەڵێ منی خۆش دەوێ.

– ئەو دە هێندەی فەرەنسییەکە دەوڵەمەندە. ئایا بەڕاستی فەرەنسییەکە سامانی هەیە؟ ئایا ئەمە بابەتێك نییە گومانی تێدا بێت؟

– هەرگیز.. کۆشکێکی مەزنی هەیە، دوێنێ ژەنەڕاڵ باسی ئەوە بۆ کردم. ئایا ئەوەندەت بەدڵە؟

– ئەگەر لەشوێنی تۆ دەبووم شووم بە ئینگلزەکە دەکرد؟

– بۆچی؟

– فەرەنسییەکە لاوێکی قۆزە، بەڵام بەدکار و تاوانبارە، ئینگلیزەکە پیاوێکی شەریفە. سەرەڕای ئەوەی دە هێندەی فەرەنسییەکە دەوڵەمەندە. بەزمانێکی دڵنیا ئەوەم پێ گوت.

بە هێمنی وتی:

– ئەمە ڕاستە. بەڵام مارکیز فەڕەنسییەکە، دڵێکی زێری هەیە، ڕەزای سووکترە.

بەهەمان شێوە منیش وتم:

– ئایا لەمە دڵنیای ؟

– بەڵێ، تەواو دڵنیام.

پرسیارەکانم پاولینای نیگەران دەکرد، تێبینی ئەوەم کرد دەیویست بە وەڵامەکانی تووڕەم بکات، هێندەی نەبرد، ئەمەم بۆ باس کرد، ئەویش وتی:

–ڕاستە دەمەوێ بە تووڕەیی و ئیرەیت سەرگەرم بم، دەبێت لەوەدا پاداشتم بکەی، کە ڕێگەت دەدەم هێندە پرسیار بکەی، ئەمە مەزندانە بکەیت.

بەهێمنی وتم:

– من ئەوە بەمافی خۆم دەزانم هەر پرسیارێکت لێ بکەم، چونکە ئامادەییم هەیە هەر شتێك لە پێناوی تۆ ببەخشم، لەبەرانبەر تۆ نرخێك بۆ ژیانی خۆم دانانێم.

پاولینا دایە قاقای پێکەنین و وتی:



– رۆژێکیان، کە ئێمە لەسەر شاخەکانی شیلانگ بێرگ بووین، بەمنت وت ئامادەم بە یەك وشەی تۆ خۆم هەڵدەمە خوارەوە، ئێمە نزیکەی هەزار پێ لە بەرزایی بووین. رۆژێك دادێ من بەم یەك وشەیە فرمانت پێ دەکەم، لەبەر هیچ شتێك نا، تەنها بۆ ئەوەی دڵنیا بم گوێڕایەڵم دەبی یان نا. دڵنیا بە من رۆژێك سەنگینی و مکووڕیی خۆم دەردەخەم. من بۆیە رقم لەتۆیە چونکە رێگەی ئەو شتانەم بەتۆ داوە. زیاتریش رقم لە تۆ دەبێتەوە لەبەر ئەوەی ناتوانم دەستبەردارت بم، هێشتا پێویستم بە تۆیە، بۆیە دەبێت تۆ بۆ خۆم پاشکەوت بکەم.

ئەمەی وت و هەڵسایەوە، وەك ئەوەی هەڵسوکەوتی گۆڕابێ، بەم دواییانە هەمیشە قسەکانی بەم شەڕانگێزی و رقە کۆتایی پێ دەهێنێ. ئەمەیش رقێکە نەهەڵچوونە نە نواندن.

پێم وت نابێت بێ ڕوونکردنەوە بڕوات:

– رێگەم پێ دەدەی لەبارەی خاتوو بلانشەوە پرسیارێکت لێ بکەم؟

– تۆ زۆر چاك دەزانی، هیچ شتێکی نوێ ڕووی نەداوە، خاتوو بلانش دەبێتە هاوسەری ژەنەڕاڵ، ئەمە هیچ گومانی تێدا نییە، بێگومان ئەگەرهاتوو داپیرە مرد. خاتوو بلانش و دایکی و مارکیزی ئامۆزای، هەموویان دەزانن ئێستا هیچ شتێکمان نییە.

- ئایا ژەنەڕاڵ زۆر پەرۆشیەتی؟

- ئێستا کاتی ئەو بابەتە نییە، گویٚ بگرە چیت پیٚ دەڵێم، بەتەواوی تیٚ بگە: ئەو حەفسەد فلۆرینە ببە، یاری رۆلێتی پیٚ بکە، تا دەتوانیٚ ببەرەوە، دەبێت هەر چۆنێك بێت من پارەم دەست بکەویٚ.

ئەم قسانەی کرد و بانگی نادیای کرد، بەرەو گازینۆکە رۆیشت تا فریای هاورێکانمان بکەویٚ، منیش لەیەکەم هۆڵی لای چەپەوە رۆیشتم، بیرم دەکردەوە سەرسام بووم، ئەو بابەتەی یاریکردن لە رۆلێت تووشی شۆکی کردم. سەیر ئەوە بوو هەرچەندە بە زۆر بابەتەوە سەرقاڵم، بەلاٚم نقومی شیکردنەوەی سۆزەکانم بووم بۆ پاولینا، ڕاستە من پانزە رۆژە دابڕاوم، ئەو کاتە لەبەرامبەر ئەو هەستم بەخورپەیەك دەکرد، ئێستا وانیم، بەلاٚم لەکاتی گەشتەکەم وەك کەسێك بووم عەقلٚم لەدەست دابێت: وەك ئەوەی شەیتان لەهەموو شوێنێك بەدوامەوە بێت، تەنانەت لە خەونەکانم هەردەم دەهاتە بەردەمم. جارێکیان لەسویسڕا بەدەنگێکی بەرزەوە هاوارم بۆی کرد، ئەوانەی لە شەمەندەفەرەکە بوون هەموو دایانە قاقای پێکەنین.

ئەمرۆ جارێکی دیکە ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکردەوە: ئایا من پاولینام خۆشدەویٚ؟ جارێکی دیکە نەمتوانی وەلاٚمێکم بۆ ئەو پرسیارە هەبیٚ، نا تەنانەت بلێٚ سەد جارێکە دەڵێم: نەخێر ڕقم لە

پاولینایە، بەڵی ڕقم لێیەتی. چرکەساتی ئەوتۆ هەبووە ( بەتایبەتی لەو کاتانەی کۆتایی بەقسەکانمان دەهێنین) خوازیاری ئەوەم نیوەی تەمەنم ببەخشم لەپێناو ئەوە بیخنکێنم. سوێند دەخۆم ئەگەر دەمتوانی خەنجەرێك بەهێواشی لەسنگی گیربکەم، ئەوا لەوانەیە هەست بەچێژێك بکەم. لەهەمان کاتیشدا سوێند دەخۆم بە پیرۆزترین شتەکانم، ئەگەر داوام لێ بکات لە شاخەکانی شیلانگ بێرگ، لەسەرەوەی ئەو لووتکەیەی خەڵك بۆی دەچن، خۆم هەڵدەمە خوارەوە، ئەوا یەکسەر ئەو کارە دەکەم، هەست بەئاسوودەیش دەکەم. من ئەوە دەزانم. دەزانم دەبێت ئەو بابەتە بەهەر جۆرێك بێت کۆتایی بێت، ئەویش بە نایابترین شێوە لەو بابەتە دەگات، ئەگەر ئەو بەتەواوی درك بەوە دەکات، مەحاڵە بتوانم دەستم بەری کەوێت. منیش بەتەواوی دەزانم هەموو ئارەزووەکانم بەر بادە و هیچ ئومێدێکی تێدا نییە، هەستم بە لەزەتێك کرد هاوشێوەی نییە. من تەواو لەو شتانە دڵنیام، ئایا ئەو بەهەموو سەنگینی و ژیریی خۆی بەم هۆگرییە و بەم راشکاوییە لەگەڵم دەدوێ؟ من تا ئەمڕۆ وا خەیاڵ دەکەم، ئەو وەك ژنە ئیمپراتۆرە کۆنەکان کاتێك لەبەردەم یەکێك لە کۆیلەکانی رووت دەبێتەوە، ئەویش وا سەیری من دەکات، وەك ئەوەی بەپیاوم نەزانێ، بەڵێ لەزۆر لایەنەوە بۆم دەردەکەوێ ئەو من بەپیاو نازانێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ بەڵێنی ئەوەم داوە: هەر چۆنێك بێت لە ڕۆڵێت ببمەوە. دەرفەتی ئەوەم نەبوو پرسیار بکەم بۆ دەبێت پارە بەرمەوە، ماوەکە دەبێ چەند بێت، ئەو حسێبە نوێیانە چەندە کە چرکە ساتێك واز لەزەینی من ناهێنێ! وەك ڕوونە چەندان ڕووداو لە ماوەی ئەم پانزە ڕۆژە روویان داوە، کە من لێرە نەبووم، هێشتا من نازانم ئەو ڕووداوانە چین، دەبێت هەموویان ڕوون بکەمەوە، دەبێت بەخێرایی هەموویان ڕۆشن بێتەوە، بەڵام ئەو ئەرکەی ئێستا لەسەر شانم ئەوەیە: بچمە یاری ڕۆڵێت.





# بەشی دووەم

ئەم ئەرکە نیگەرانی کردم، ڕاستت دەوێ: مـن بڕیـارم داوە قومـار بکەم، بەڵام هەرگیز پێشبینیی ئەوەم نەکردووە، قومار بۆ کەسێکی دیکە بکەم. تەنانەت هەستم بە سەرسـامیی دەکـرد، بـە سـیمایەکی گرژەوە چوومە هۆڵی یاریکردن، هەر کەسێکم دەبینی لەیەکەم نیگـا نیگـەرانی دەکـردم. مـن نـاتوانم بەرگـەی ئـەو وتارانـە بگـرم کـە لەسەرتاسەری دونیا لەبارەی قومـارەوە دەنووسـرێ، بەتایبـەتی لـە ڕۆژنامە ڕووسیەکانی خۆمان، لەسـەرەتای وەرزی بـەهار لەسـەر دوو بابـەت دەنووسـرێت: دەسـتبلاوی و ملـهوڕیی کـە لـە هۆڵـەکانی قورمـارکردن دەکرێـت لـە شـارەکانی ڕووبـاری ڕاینـەوە. دووەم ئـەو کۆمەڵە زێڕانەیە لەسەر خوانەکان کۆدەکرێنـەوە. سـەرەڕای ئـەوەی ئەم جۆرە نووسەرانە پاداشت لەبری وتارەکانیان وەرنـاگرن، کەچـی خۆبەخشانە بۆ مەبەستێك دەنووسن کـە سـوودی نییـە. ئـەو هۆڵانـە بەڕیوتن خاڵیین لەهەر خۆشـی و جوانییـەك. زێـڕ لەسـەر خوانـەکان



كۆناكرێتەوە، تەنانەت بە دەگمەن خوانی تێدا دەكرێت. هەندێك جار وا رێكدەكەوێ پیاوێك سەلقەیەكی ریزپەڕی هەبێت، ئینگلیز بێت یان ئاسیایی (یان تورك وەك هاوینی رابردوو روویدا) لەماوەیەكی زۆر كەم برە پارەیەكی ئەفسانەیی دەدۆڕێنێ، یان دەباتەوە، بەلاّم ئەوانی دیكە تەنها بە چەند درهەمێك یاری دەكەن، بۆیە لەسەر خوانەكان تەنها پارەیەكی كەم دەبینی.

بۆ یەكەمجار لە ژیانم كە چووم هۆڵی قوماركردنەوە، ماوەیەك دوودڵ بووم، بۆئەوەی خۆم یەكلا بكەمەوە. خەڵك لەسەر رێگەكەم وەستابوون، تەنانەت ئەگەر بەتەنیاش بووم، لەوانەبوو بڕۆم، بەر لەوەی یاری بكەم. من ددان بەوە دەنێم دڵم زۆر بەتوندی كەوتە خورپەوە، تەنانەت نەمدەتوانی ددان بەخۆمدا بگرم و هێور ببمەوە. لەمێژە باوەڕم بەوە هەبووە لەگەڵ هاتم بۆ رۆلتنبێرگ، شتێكی نوێ دێتە ژیانمەوە، لەم شارە وەك ئەوە ناڕۆم كە بۆی هاتبووم. دەبێت شتێكی سەرەكی یەكلاكەرەوە بێتە نێو ژیانەوە، هیچ چارەی دیكە نییە، دەبێت ئەمە رووبدات، ئەمە هەر روودەدا. هەرچەندە ئەو گرەوەی لەسەر رۆلێت كردوومە هیچ و پێكەنیناوییە،. من وای بۆ دەچم ئەو باوەڕی لەلای خەڵك هەیە، گوایە( هیچ وپووچییە مرۆ چاوەڕوانی شتێك لەقوماركردن بكات) ئەم باوەڕەیش هیچە و مایەی پێكەنینە. ئایا بۆ قوماركردن بەدترین هۆكارە بۆ كۆكردنەوەی پارە؟ بۆ دەكرێت بۆ نموونە قومار لە بازرگانی خراپتر بێت؟ ڕاستە



له سەد کەس، تەنها یەکێك دەباتەوە، بەڵام ئایا ئەوە بەلای منەوە گرنگە؟

هەر چۆنێك بێت، ئەم شەوە بڕیارم دا جددی نەبم، هەر شتێك ڕوودەدا، با وەك ڕێکەوتێکی ڕاگوزەر بێت. ئەوەی ئەم ئێوارەیە مەبەستم بوو، خودی قومارکردن تاوتوێ بکەم. هەر چەندە من زۆرم لەبارەی ڕۆلێتەوە خوێندۆتەوە، زۆر پەرۆش بووم بۆ خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی وەسفی ڕۆڵێت دەکات، کەچی ناتوانم لە هیچ ڕێسایەکی ئەم یاریکردنە تێ بگەم، تەنها ئەو کاتە نەبێ بەچاوەکانی خۆم سەیری دەکەم.

لە یەکەم چرکەساتدا، هەموو شتێك چەپەڵ دەردەکەوت، چەپڵ و نەگریس بەمانا ئەخلاقییەکەی. نامەوێ قسە لەسەر ئەو سیما برسی و نیگەرانانە بکەم کە بە دەیان یان سەدان دەوری مێزی قومار دەدەن. من زیانێك لەوە نادۆزمەوە، مرۆ بە خێراترین کات زۆرترین بڕ بباتەوە. بیرۆکەی ئەو واعیزە ناحاڵییەم بەبیرهاتەوە کە زۆرنەدار بوو، کاتێك باسی ئەوەیان بۆ کردبوو، گوایە کەسانێك بە پارەیەکی کەم قومار دەکەن، ئەو وتبووی" ئەمە خراپتر و بەدترە، چونکە ئەم دیاردەیە لە تەماعێکی بچووکەوە سەرچاوە دەگرێت". ئەو وادەزانێ جیاوازیی لەنێوان تەماعکاری بچووك و گەورە هەیە، وەك یەکتر نیین. ئەمە مەسەلەیەکی ڕێژەییە، ئەوەی بەلای ڕۆچیلدەوە بچووکە، بەلای منەوە دەوڵەمەندییە. کاتێك بابەتەکە



پێوەندیی بە دۆڕاندن و قازانجەوە هەبێت، نەوەك تەنها لە رۆلێت، بەڵکوو لەهەموو بوارەکانی دیکە، یەك پاڵنەر بۆ خەڵك هەیە: ئەوەیە قازانج بکەن شتێك لەدەستی کەسانی دیکە دەربهێنن. ئایا خودی قازانج و سوود نەنگیان تێدایە؟ ئەمەیان مەسەلەیەکی دیکەیە، لێرەدا شرۆڤەی دەکەم. من یەکێکم لەوانەی ئارەزوو هەیە تا ئەوپەڕی براوە بم، ئەوەیان تەماعکاری و چاوچنۆکییە، ئەگەر ئەم ناوەتان بەلاوە باشە من ناوی دەنێم خراپەکاری. ئەم ئارەزووە لەلای من هەیە، یان راستتر ئەو کاتەی چوومە هۆڵەکەوە لەلای من هەبووە. هیچ شتێك لەوە بەچێژتر نییە مرۆ لەبەرانبەر ئەوانی دیکە نەچەمێتەوە، بەڵکو دەبێت بە راشکاوی کارەکەی بکات، کەس رێگری لێ نەکات، بەڵام ئایا بۆچی مرۆ خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ؟ ئەمە زۆر هیچوپووچ و دەبەنگانە مرۆڤ خۆی پێوە خەریك بکات. شتێك کە لەیەکەم چرکەساتدا قێزەوەن دەردەکەوێ، ئاپۆرەی ئەو خەڵکەیە کە لەدەوری مێزەکانی قومار کۆدەبنەوە، کە هەندێکیان بە بایەخ و رێزێکی زۆر دەنوێنن. لێرەدا دەبێت دوو جۆر یاری لەیەکتر جیا بکەینەوە، یارییەك ئاستی نزمە، یارییەکی دیکە شایەنی پیاوی ماقووڵە. هەر لەبەر ئەمەیشە دوو جار قومار هەیە: قومارکردنی پیاو ماقولان، قومارکردنی رووت ورەجاڵەکان.

هێڵی جیاکردنەوەی نێوانیان زۆر روونە. نەنگییەك لەمەسەلەکەدا نییە. بۆ نموونە پیاوی بەرێز و ماقووڵ لەوانەیە

سەرکێشی بە پێنج یان دە لیرەی زێڕ بکات، زۆر دەگمەنە زیاتر سەرکێشی زیاتر بکات، لەوانەیە ئەگەر زۆر دەوڵەمەند بێت سەرکێشی بە هەزار فرانك بکات، بەلام تەنها لەپێناو یاری ئەم کارە دەکات، تەنها بۆ سەرگەرمی بۆ ئەوەی بەدوای یاری قازانج و دۆڕان بچیّ. کاتێك قازانج دەکات، ئەوا بەدەنگێکی بەرز پێدەکەنیّ، وا لەکەسێك دەکات لەتێبینییەکانی بەشدار بێت، لەوانەیە دوو هێندە پارە دابنیّ، بەلام ئەم کارە تەنها بۆ حەزی درك پیّ بردن دەکات، بۆ ئەوەی بزانیّ بەخت چۆن دەخولێتەوە. ئەو ئارەزوویەکی چەپەڵی نییە بۆ ئەوەی قازانج بکات، واتە چ لە رۆلێت و چ لە یاری( چل وسێییەکە) تەنها مەبەستی چێژ و سەرگەرمییە، بۆیە سەرکێشی بەهیچ شتەکانی دیکە ناکات. کاتێك کەسێکی گران و سەنگین قومار دەکات بەوپەڕی شیکی دەوەستیّ و بەچاوی ڕێزەوە تەنانەت سەیری ئەو بچووکانەش دەکات کە بۆ تاکە فلۆرینێك دەلەرزن، وا دەزانیّ ئەوانە هەمووی وەك ئەون، تەنها بۆ سەرگەرمی و کات بەسەربرد یاری دەکەن، بەلام ئەمە ساویلەکەیی و نەزانییە، کە ئەمەشیان لەبەرزترین شتەکانی ئەرستۆکراتییە.

دەمبینی دایکان کچەکانیان بەرەو پێشەوە دەهێنا، کچانی لاواز و بیّ گوناه لە تەمەنی پانزە یان شانزە ساڵی بوون، دایکان چەند پارەیەکی زێڕیان بەکچەکانیان دەدا و فێریان دەکردن چۆن یاری بکەن، کچەکانێش دەیانبردەوە یان دەیاندۆڕاند بە زەردەخەنەیە

دەکشانەوە دواوە، تەنها زەردەخەنەیەك بۆ دۆڕان و قازانج جیاوازی نەبوو.

ژەنەڕاڵەکەی ئێمە بەمتمانەوە لەسەر مێزی یارییەکە نزیك بووەوە، یەکێك لە خزمەتکارەکان ویستی کورسییەکی پێ بدا، بەڵام ئەو ئاگای لێ نەبوو. جزدانەکەی بە هێواشی دەرهێنا، سێسەد فرانکی دەرهێنا، لەسەر ڕەشی دانا بردییەوە، بەڵام پارەکەی نەبرد و لەشوێنی خۆی هێشتەوە، دووبارە ڕەش بردییەوە، دووبارە پارەکەی لەشوێنی خۆی هێشتەوە، بەڵام ئەمجارەیان سوور بردییەوە، ژەنەڕاڵ هەزار و دوو سەد فرانکی دۆڕاند. بە زەردەخەنەوە پاشەکشەی کرد، تەواو بەسەر خۆی زاڵبوو. من دڵنیام دڵی پەشۆکابوو. لەلایەکی دیکەوە فەڕەنسییەکە لە تەنیشتم بوو، بردییەوە، دواتر نزیکەی سێ هەزار فرانکی دۆڕاند. لەگەڵ ئەوەشدا سیمای بە هێمنی مایەوە، هیچ نیشانەیەکی هەڵچوونی پێوە دیار نەبوو. کەسی ئەرستۆکراتی بۆی نییە هەڵبچێ هەرچەندە هەموو سامانەکەی بدۆڕێنێ، تەنانەت ئەگەر هەموو پارەکەشی بڕوات ئەوا نابێت نیگەران بێت. یەکێك لە خەسڵەتەکانی دیکە ئەرستۆکراتیەت ئەوەیە ئەم چڵپاو و دیمەنی ئاپوورەی خەڵك فەرامۆش بکات، لەوانەیە ئەم هەڵوێستە پێچەوانەی هەڵوێستی پێشوو بێت: تۆ تێبینی دەکەین ئەم ئاپۆرەیە کۆبووەتەوە، بەچاوی جەربەزەیی خۆت سەیریان دەکەی، وەك نواندنێك بێت بۆ

ڕەواندنەوەی بێزاری جەنتڵمانەکە بێت. کاتێك دەچیتە ناو ئەم ئاپوورەیەوە دەبێت بەوە ڕازی بیت تۆ تەنها وەك بینەرێك دەربکەوی، نە تۆ لەوانی، نە ئەوان وەك تۆ. نابێت زۆر ئەملا و ئەولا بکەیت ودیقەت بدەیت، ئەگینا سیفەتی جەنتڵمانت نابێت. زۆر دەگمەنە دیمەنی ئەوتۆ هەبێت جەنتڵمان بە بەردەوامی دیقەتی خۆی بداتێ، کەچی من پێموابوو، هەموو شتێك لە قومارکردن شایەنی دیقەتکردنی نەپچڕاوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا شوێنی ئەوە نییە من تێبینیەکانم تۆمار بکەم، بۆچوونە ئەخلاقییەکانی خۆم دەربخەم، کە لە ناخی دڵمەوە حەشارم داوە. هەر چۆنێك بێت من ئەو قسانە دەکەم بۆ ئەوەی باری ویژدانی خۆم سووك بکەم، سەرەڕای ئەوەیش دەڵێم: بەم دواییانە هەست بە بێزارییەکی تەواو دەکەم، ناتوانم بیر و کارم ملکەچی هیچ پێوەرێکی ئەخلاقی بکەم، ئێستا من بە ئاڕاستەیەکی دیکە دەڕۆم.

بەڕاستی ئاپوورەی رووت و ڕەجاڵەکان بەشێوەیەکی چەپەڵ یاری دەکەن، تەنانەت دوور نییە دزی ئاسایی لەدەوری مێزەکانی قومارەوە دەکرێت. ئەوانەی لە دەوری مێزەکانەوە دانیشتوون چاودێری ئەو کەسانە دەکەن کە پارەکانیان دادەنێن، کارێکی پڕ ماندووبوون دەکەن، بۆئەوەی دزی بکەن، ئەوانیش زۆربەیان فەڕەنسیین! کاتێك من ئەو تێبینیانە دەنووسم مەبەستم ئەوە نییە وەسفی ڕۆڵێت بکەم، بەڵکوو دەمەوێ لەگەڵ بارودۆخەکە بگونجێم

بۆئەوەی بزانم لە ئایندە چی دەکەم. بۆ نموونە زۆرجار دەبینی دەستێك بۆ ناو مێزی قومارەکە درێژ دەبێتەوە، لەناکاو دەڵێن تۆ براوە نیت، بۆیە دەمەقاڵێ دروست دەبێت و هاوار بەرز دەبێت، لەو کاتەشدا چۆن دەتوانی بیسەلمێنی کە تۆ براوەیت یان دۆڕاوی.

بە تێڕوانینی من ئەمە گاڵتەجاڕییەکی دیکەیە، زۆر ئاڵۆزی تێدا زەحمەتە چارەسەر بکرێت. من بەجۆرێك لە جۆرەکان فێری ئەوە بووم، مرۆڤ گرەو لەسەر ژمارەکان دەکات (تاك یان جووت) یانیش لەسەر رەنگەکانی رۆلێت گرەو دەکات. ئەم شەوە ویستم بە سەد فلۆرینەکەی پاولینا ئەلکسەندەرۆڤنا سەرکێشی بکەم. ئەوەی نیگەرانی کردبووم ئەوەبوو من یاری بۆ کەسێکی دیکە دەکەم، نەوەك بۆ خۆم. ئەمە هەستێکی زۆر دژواربوو، دەمەویست زۆر بە پەلە خۆم لەو هەستە دەرباز بکەم. تەواوی کاتەکە هەست بەوە دەکرد، ئەگەر من بۆ حسێبی پاولینا یاری بکەم، ئەوا خۆم بەدبەخت دەکەم، ئایا مەحاڵ نییە مرۆڤ لە مێزی قومار نزیك بێتەوە و باوەڕیشی بە خورافات نەبێت؟

بۆ ئەوەی دەست بەیارییەکە بکەم پێنج فردیریکم دەرهێنا، واتە پەنجا فلۆرین، لەسەر ژمارەیەکی جووتم دانا، چەرخەکە خولایەوە، ژمارە سێزدە براوە بوو، کەواتە من دۆڕام، زۆر دڵتەنگ بووم، بەمەبەستی ئەوەی خۆم زوو لەکارەکە دەربازبکەم، پێنج فریدریکی ترم دەرهێنا لەسەر سوورم دانا، سوور بردییەوە، هەر دە فردیریکم

له سوور دانایەوە، دووبارە سوور براوە بوو، هەموو پارەکەم لە شوێنی خۆی هێشتەوە، بۆ جاری سێیەم سوور براوە بوو، چل فردریکەکەم هەڵگرت، دە دانەیانم لەسەر ژمارە دوانزە دانا، بێئەوەی بزانم ئەم ژمارەیە لەکاتی بردنەوە چی دەگەینێ، بردمەوە سێ هێندە پارەیان پێدام. بۆیە دە فردریکەکەم بوو بە هەشتا دانا، ئەو کاتە هەستێکی نامۆم بۆ دروست بوو بۆیە بڕیارم دا لە شوێنەکە بڕۆم، بەڵام جارێکی دیکە هەر هەشتا فردیریکم لە ژمارەیەکی جووت دانا، ژمارە چوار براوە بوو، جارێکی دیکە هەشتا فردریکم بردەوە. هەر سەدوشەست فردریکم لە گیرفانم دانا و کەوتە سۆراخی دۆزینەوەی پاولینا ئەلکسەندرۆڤنا.

هەموویان لە باخچەکە پیاسەیان دەکرد، نەمتوانی ببینم تەنها لەکاتی خوانی ئێوارە نەبێت. ئەمجارە فەرەنسییەکە لەوێ نەبوو، بۆیە ژەنەڕاڵ دەیتوانیێ بەتەواوی ئازادیی خۆی هەڵسوکەوت بکات. ئەوەی بە ئەرکی خۆی دەزانی کە جارێکی دیکە ئاگادارم بکاتەوە، لەوەی نابێت جارێکی دیکە لەسەر مێزی قومار من ببینێ. گوایە من ئەگەر زۆر بدۆڕێنم ئەوا ناوبانگی ئەو دەزڕێنم، بەفیزەوە وتی:

–تەنانەت ئەگەر زۆریش ببەیتەوە ئەوا ناوبانگی من لەکەدار دەکەی، هەڵبەتە مافی ئەوەم نییە بەسەر کردەوەکانی تۆ زاڵ بم، بەڵام دەبێت خۆت بەوە رازی بکەی......

وەك نەریتی خۆی ڕستەکەی بە ناتەواوی جێ هێشت.



منیش بەزمانێکی وشك وەڵامم دایەوە و وتم تەنها پارەیەکی کەمم هەیە، ئەگەر یاریش بکەم دۆڕاوێکی گەورە نابم. کاتێك بۆ ژوورەکەم سەرکەوتم هەڵی ئەوەم بۆ ڕەخسا پارەکە بە پاولینا بدەمەوە، پێم گوت هەرگیز ڕۆژێکی دیکە یاری بۆ ئەو ناکەم.

بەزمانێکی پڕ نیگەرانی وتی:

–بۆچی؟

من بەسەرسامی سەریم دەکرد و وتم:

–ئەو کارە نیگەرانم دەکات، من دەمەوێ بۆ خۆم یاری بکەم.

– کەواتە هێشتا باوەڕت بەوە هەیە ڕۆڵێت تاکە دەروازەی نەجاتبوونی تۆ بێت، تاکە ڕێگەی سەرکەوتنت بێت؟ ئەمەی بەزمانێکی گاڵتەپێکردنەوە وت.

بەڵام من بە مکوڕبوون وەڵامم دایەوە کە ئەمەیان ڕاستە، بەڵام سەبارەت بەوەی هەر دەبێت براوە بم، ئەمە کارێکی پێکەنیناوییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا" ئێوە وازم لێ بهێنن، ئەمە پێوەندی بەخۆم هەیە".

پاولینا پێداگری کرد لەوەی قازانجەکەی ئەمڕۆمان بکەین بە نیوە، هەشتا فردریکی بۆ من ڕاگرت، وتیشی بەم هاوبەشییە بەردەوام دەبین، بەڵام من ڕەتم کردەوە، سوور بووم لەسەر ئەوەی ناتوانم یاری بۆ کەسانی دیکە بکەم، چونکە من دڵنیام لە دۆڕاندن.



به پەشۆکاوی پاولینا وتی:

–لەگەڵ ئەوەشدا، منیش ئومێدێکم نەماوە رۆڵێت نەبێت، لەبەر ئەوەش دەبێت تۆ لە یارییەکە لەسەر بنەمای هاوبەشی بەردەوام بیت، ئەم کارەیش دەکەیت.. تێگەیشتی؟

ئەمەی وت، بێئەوەی گوێ بە پاساوەکانم بدات رۆیشت..









# بەشی سێیەم

لەگەڵ ئەوەشدا دوێنێ پاولینا تەنها بۆ جارێکیش قسەی لەبارەی یاریکردنەوە نەکرد. بەشێوەیەکی گشتی خۆی لەوە بەدوورگرت قسەم لەگەڵ بکات. ئەو شێوازی هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵ من نەگۆڕیوە. کاتێ دەبینم هەمان ئەو هێمنیە رەهایەی هەیە، لەگەڵ هەستێکی بێزراو بۆ من، هەرچۆنێك بێت هەوڵ نادات، ڕقەکەی بۆ من بشارێتەوە. من بەڕوونی هەست بەوە دەکەم. سەرەڕای ئەمەش ئەوە ناشارێتەوە پێویستی بە منە دەیەوێ پارێزگاری لەمانەوەی من بکات. پێوەندی سەیر و سەمەرە لەنێوانمان دروست بووە ناتوانم لەزۆرێکیان بگەم. ئەگەر چاوپۆشی لەوە بکەین بەشێوەیەکی گشتی پاولینا بە فیز و لوتەبەرزی و ڕقەوە سەیری خەڵك دەکات، کەچی دەزانێ من شێتانە خۆشم دەوێ، تەنانەت ڕێگەم دەدات باس لە پەرۆشی خۆم بۆ ئەو بکەم، ئایا هۆکارێك لەوە باشتر هەیە بۆ ئەوەی ڕقی خۆی دەربخات؟ چاکترین شێواز بۆ ئەوەی ڕقی خۆی بۆ من دەربخات ئەوەیە ڕێگە دەدات لەبارەی عەشقی خۆم بێ



پێچوپەنا بدوێم. وەك ئەوەی بڵێ" من هیچ بایەخێك بەو قسانەی تۆ نادەم، هیچ بایەخێکم بۆ سۆزی تۆ نییە".

لەرابردوودا باسی کاروباری خۆی بۆ من دەکرد، بەڵام رۆژێك لە رۆژان دڵسۆز وڕاستگۆ نەبووە، زیاتر لەمەیش سووکایەتیەکای بۆ من هەندێك کارامەیی تێدابوو: وا دابنێ، ئەو دەزانی من ئاگادار هەموو بارودۆخی ژیانی ئەوم، ئەگەری ئەوە هەیە تۆزێك ترسی لەلا دروست بێت: بۆیە لەخۆوە هەندێك رووداوی بۆ دەگێڕامەوە، کاتێك پێویستی بەوە دەبوو بە ئامانجێك بگات، ئەوا منی وەك کۆیلەیە بەکاردەهێنا، لەو کاتەش دەبووایە هەموو شتەکانم لەبارەی ئەرکەکەوە پێ بڵێ. تەنانەت ئەگەر زنجیرەی رووداوەکانی ئەو بەلای من ئاڵۆز بوویە، تێبینی دەکرد ئازاری ئەو، منیش ئازار دەدات و نیگەرانم دەکات، کەچی بەتەواوی و بەڕاشکاوی هاوڕێیانە دڵنیا و ئاسوودەی نەدەکردمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا من وام دەزانی ئەگەر ئەو ئەرکی قورس و ترسناك بەم دەسپێرێ ئەوا رۆژێك دێت ڕاشکاوانە بۆ من بدوێ. ئاخۆ دەبێ بایەخ بە سۆزی من بدات، بایەخ بەوە بدات من هاوخەمی ئەوم، سێ هێندەی ئەو نیگەرانم بۆ خەمەکانی!

دەزانم سێ هەفتەیە، نیازی ئەوەی هەیە یاری رۆڵێت بکات. داوای لەمن کردووە لەبری ئەو یاری بکەم، چونکە بۆ خۆی شیاو نییە یاری بکات. من لەزاری پاولینا درکم بەوە کردووە، بابەتێك هەیە سەرقاڵی دەکات، ئەمە تەنها پێوەندی بە ئارەزووی قومارکردنەوە

نییـه. خـودی سـامان بـەلای ئـەو گـرنگ نییـە، بێگومـان ئامـانج و بارودۆخێك هەیە دەتوانم مەزندەی بکەم، بەلاّم هێشتا نـازانم چییە. دیارە ئەو بارودۆخە سـوکایەتی و بەکۆیلەکردنـەی بـۆ منـی دروسـت کردووە، دەرفەتی ئەوەم پـێ دەدا (زۆر جـاریش دەرفـەتی پێـداوم) بێ پێچوپەنا هـەموو شـتێکی لـێ بپرسـم. مادەمـەکێ مـن کۆیلـەی ئـەوم، مادەمـەکێ مـن لەچـاوی ئـەو، بـوونم نییـە، کەواتـە هەسـت بەسووکایەتی ناکات ئەگەر پابەند نـەبم بـە سـنوورەکانی رێزگـرتن و ئەدەبەوە. ئەگەر من زۆر جار فزوولـی بکـەم، ئـەو رێگـەم پـێ دەدا هەندێك پرسیار بکەن، لەوانە وەلاّم نەداتـەوە، بـەڵکوو هەنـدێك جـار هـیچ سـەرنجی پرسـیارەکان نـادات! پێوەنـدی نێوانمـان بـەم شێوەیەیە!

دوێنێ زۆر قسەیان لەسەر ئەو بروسکەیە دەکرد، گوایە چوار رۆژە رەوانەی بترۆسـبۆرگ کـراوە هێشـتا وەلاّم نەدراوەتـەوە. زۆر روون بوو ژەنەراڵ پەشۆکاو بوو و خـەیاڵی ئـاڵۆز بـوو، بێگومـان بابەتەکـە پێوەندی بـە داپـیرەوە هەیـە. هـەروەها فەرەنسـییەکەش پەشـۆکاو بوو. کەچی دوێنـی دوای نـانی ئێـوارە بـە ماوەیـەکی زۆر ژەنـەراڵ و فەرەنسییەکە قسەیان بەیەکـەوە دەکـرد، قسەکانیاشـیان نیشـانەی جددی و رشتبوونی پێوە دیاربوو. کـابرای فەرەنسـی بەشـێوەیەکی لوتبەرزانـەی ئـەوتۆ مامەڵـەمان لەگـەڵ دەکـات عـەقڵ بـاوەڕی پـێ ناکات.رێگە ئـەو پەنـدەی بـۆ دەگـونجێ کـە دەڵـێ" داوەتـی سـەر

خوانەکەتی دەکەی، کەچی ئەو قاچی دەخاتە سەر خوانەکە".
تەنانەت لەگەڵ پاولیناش بە لوتبەرزی هەڵسوکەوتی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لە پیاسە و گەشتەکانی خێزانەکە بەشدار دەبوو کە لە باخچەکە ئەنجامیان دەدا، یان بە ئەسپ بەدەوروبەری شارەکە دەگەڕان. ماوەیەکی زۆرە، بەو بارودۆخانە دەزانم کە بووەتە هۆی پێوەندی نێوان ژەنەڕاڵ و پیاوە فەڕەنسیەکە، ئەوان پێشتر نیازیان هەبووە بەیەکەوە کارگەیەك لە رووسیا دروست بکەن، نازانم ئێستا ئەو پڕۆژەیەیان نەماوە یان هێشتا قسەی لەسەر دەکەن. جیا لەمەش من نهێنیەکی خێزانیم ئاشکراکردووە: سالّی رابردوو ئەو پیاوە، ژەنەڕاڵی لەتەنگەژەیان دەرباز کردووە، کە سێسەد روبڵی بەقەرز داوەتە ژەنەڕاڵ، چونکە لەکاتی خانەنشینەکەی پێویستی پێی هەبووە. ئێستا ژەنەڕاڵ لەنێو مشتی کابرای فەڕەنسی دایە، بەلاّم خاتوو بلاّنش ئەو رۆڵی سەرەکی لە هەموو کۆمیدیاکە دەگێڕێ، من لەو مەزندەکردنە تەواو بێگومانم.

خاتوو بلانش کێیە؟ لێرە لەلای ئێمە دەگوترێت ئەو ژنێکی فەڕەنسییە لە چینێکی بەرز، لەگەڵ دایکی سەفەر دەکات، سامانێکی زۆر و زەوەندی هەیە،هەروەها دەگوترێت پێوەندییەکی خزمایەتی لە گەڵ مارکیز هەیە، باس لەوەش دەکرێت پێوەندی نێوان بلانش و مارکیز بەر لە سەفەرەکەم بۆ پاریس جۆرێك لە نواندن و ریابازی تێدا بووە، بەلاّم ئێستا پێوەندی نێوانیان

گەرموگوڕ و بێ کوشکێشیە. لەوانەیە بارودۆخی ئێمە ئێستا بەلای ئەوانەوە وا پێویست بکات، زیاتر لەیەکتر نزیك ببنەوە و چاوپۆشی لەیەکتر بکەن. دوێنێ تێبینیی ئەوەم کرد چۆن مستەر ئاستلی دەیەوێ دەرفەت لە بلانش و دایکی وەربگرێت. وام هەست کرد دەیناسێ، تەنانەت لەو باوەڕەش دام هاوڕێ فەڕەنسییەکەمان پێشتر مستەر ئاستلی بینیوە. هەر چۆنێك بێت مستەر هێندە بە ئابڕۆ و بەشەرم وبێ دەنگە هیچ ئومێدێکی لێ چاوەڕوان ناکرێت: هەموو پیسیەکان لە ناو خێزانەکە دەشۆردرێنەوە. فەڕەنسیەکە تەنانەت سلاویشی لێ ناکات، یان هیچ سەرنجێکی پێ نادات. ئەمەش مانای ئەوەیە ترسی لە میستەر نییە. ئەمە بابەتێکە تێی دەگەم، بەلام بۆچی خاتوو (بلانش)یش مستەر فەرامۆش دەکات؟ بەتایبەتی دوێنێ مارکیز نازانم بە بۆنەی چ بابەتێکەوە بوو، لەدەمی دەرچوو وتی مستەر ئاستلی بێ ئەندازە دەوڵەمەندە. دەبووایە لەو کاتەدا بلانش سەیری مستەر بکات! ئەوەی گرنگە ژەنەراڵ نیگەرانە. بێگومان تۆ دەتوانی مەزندە ئەوە بکەی بابەتی گەیشتنی بروسکەیەك لەمۆسکۆوە دەربارەی مردنی داپیرە چ گرنگییەکی بۆ ئەو دەبێ!

سەرەڕای ئەوەی قەناعەتم هەبوو، پاولینا بە ئەنقەست خۆی لە گفتوگۆی نێوانمان بەدوور دەگرت، هەوڵی دەدات ساردوسڕی و کەم بایەخی بنوێنێ، بەلام دەمزانی لەناکاو بڕیار دەدات بێتە لام.

بەپێچەوانەوە دوێنێ و ئەمڕۆ هەموو سەرنج لەلای خاتوو بلانشە. داماوە ئەم ژەنەڕاڵە .... بێگومان گوم دەبێت، ژەنەڕاڵ شەیدای بلانشە ، ئەو تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵە، بێگومان ئەمەش کارەساتێکی دیکەیە. سەرەڕای ئەمەش مەینەتی دیکە وەك رەبەن بووەتەوە، منداڵەکانی، ئەو تێکشکانەی تێکەوتووە، قەرزەکانی..... دواجار ئەو ئافرەتە عەقڵ و هۆشی بردووە. خاتوو بلانش جوانە، بەلاّم نازانم خوێنەر تێم دەگات ئەگەر بڵێم سیمای لەو جۆرانەیە کە ترس دەخاتە دەروونەوە، یان بەلایەنی کەمەوە دەڵێم من هەمیشە لەو جۆرە ژنانە دەترسم. خاتوو بلانش تەمەنی بیست و پێنج ساڵە. بالاّی بەرز، نێوشانێکی جوان، گەردن و مەمکەکانی پڕ، رەنگی سیمای برۆنزی، قژێکی رەش وەك ئەبانۆس، قژی بەشێوەیە چڕوپڕە بەشی دوو سەر دەکات نەوەك یەك. دوو چاوی رەش، لەنیگادا بوێر، ددانەکانی سپی، دوو لێوی هەردەم گەشاوە. لەشی هەردەم بۆنێکی میسك ئاسای هەیە. جلەکانی جوان دەپۆشێ، سەلیقەیەکی بەرزی هەیە، دەست و پێیەکانی نایابن. دەنگێکی گڕی هەیە، کاتێك پێدەکەنی، زۆر جار قاقا دەکات هەموو ددانەکانی دەردەکەوێ، بەلاّم زۆر جار بێدەنگ، بێدەنگییەکەی جۆرێکە لە چەپڵی، بە تایبەتی ئەو کاتانەی پاولینا و ماری فیلیپۆڤینا ئامادە دەبن ( ئێستا دەنگۆیەکی سەیر هەیە گوایە ماری فیلیپۆڤینا دەگەڕێتەوە رووسیا). من خەیاڵی ئەوە دەکەم خاتوو بلانش هیچ رۆشنبیرییەکی نەبێت، تەنانەت لەوانەیە دەبەنگ بێت،بەلاّم

لەبەرانبەردا زۆر وریا و مەکەربازە. باوەڕیشم هەیە ژیانی خاڵی نییە لە سەرکێشی. لەوانەشە هیچ خزمایەتییەك لەنێوان ئەم و ماركيز نەبيت، تەنانەت لەوانەیە ژنەکەش دایکی نەبێت. کەچی ئێستا وەك دایکی دەردەکەویٚ من لە بەرلین ئەوانم بینی، پێوەندیەکی چاکیان هەیە، کەچی مارکیز ئێستاش گومان دەکەم ئەمە مارکیز بێت، سەبارەت بەوە لەچینێکی بەرزە، ئەوا لەمۆسکۆ و لەئەڵمانیا وا دەردەکەویٚ، ناشزانم لە فەڕەنسا چۆنە. دەگوترێت کۆشکێکی لە فەڕەنسا هەیە. ئەوە دەزانم لەماوەی ئامادەنەبوونم لەم پانزە ڕۆژە زۆر شت روویداوە. بەلاّم هێشتا بەوردی نازانم ژەنەڕاڵ و خاتوو بلانش قسەی کۆتاییان کردووە یان نا. هەرچۆنێك بێت ئەمە پێوەندی بەبارودۆخی دارایی ئێمەوە هەیە، واتە پێوەندی بە پارەکانی ژەنەڕاڵەوە هەیە. ئەگەرهاتوو زانرا داپیرە هێشتا لە ژیان ماوە، ئەوا بلانش یەکسەر بۆی دەردەچیٚ و ون دەبیٚ. من هەست بەخۆم دەکەم چەند پێکەنیناوی و سەیرە مرۆڤ تا ئەو ئاستەی من دوڕوو و دووزمان بێت، ئەمە زۆرجار مایەی قێزەوەنی دەروونمە. ئای کە دڵخۆش دەبم ئەو کاتەی هەموو ئەو خەڵکە جیٚ دەهێڵم، هەموو ئەو بابەتە بەجێدەهێڵم! بەلاّم دەتوانم لە پاولینا دوور بکەومەوە، ئایا دەتوانم واز لەوە بهێنم وەك سیخوڕێك بە دەوری بخولێمەوە؟ ڕاستە سیخوڕی کارێکی چەپەڵە.... بەلاّم بایەخ بەمە نادەم...





لەدوێنی و ئەمڕۆوە بۆم دەرکەوتووە، مستەر ئاستلی هەڵسوکەوتی نامۆ بووە. بەڵێ باوەڕم وایە عاشقی پاولینایە. ئەوەی بەزم و پێکەنیناوییە، پیاوێکی وەها بەعاشق وەسف بکرێت، کە تا ئاستی نەخۆشی شەرمنە، رەنگە لەتاریکی زەوی رووبچێ، بەڵام ناتوانێ بە وشەیەك یان نیگایەك گوزارشت لەناخی خۆی بکات. ئێمە زۆر جار بە مستەر ئاستلی دەگەین، لەکاتی پیاسە دەردەکەوێ زۆر پەرۆشە بێتە لامان، کاتێك داوای لێ دەکەین بێتە لامان بە پەلە دێت. لەو شوێنانەی پشوو دەدەین، لە گازینۆ، لە شوێنی مۆسیقا، بەردەم نافوورەکە، ئەوا مستەر لەکورسیەکەی ئێمە نزیکە. ئێمە لە هەر شوێنێك بین، لە باخچە، لەدارستان، لە شاخەکانی شیلانبێرگ، تەنها بەچاوگێڕانێك دەتوانین مستەر ئاستلی لە نزیك رێڕەوەکان یان لەپشت دارەکان ببینین. من وا خەیاڵ دەکەم ئەو بەدوای دەرفەتێك دەگەڕێ بەتایبەتی لەگەڵ من قسە بکات، ئەو بەیانیە بەمن گەیشت چەند قسەیەکمان کرد، ئەو هەندێك جار بە رستەی پچڕ پچڕ قسە دەکات، تەنانەت بەر لەوەی بەیانی باشم لێ بکات، هاواری کرد و وتی:

– خ... خاتوو بلانش... ئافرەتی زۆرم لەشێوەی خاتوو بلانش بینیوە.!

ئەمەی وت و بێدەنگ بوو، بە نیگایەکی پڕ مانای سەیری کردم. نەمزانی مەبەستی لەم قسەیە چی بوو، کاتێك پرسیم (دەتەوێ چ شتێك بڵێی؟) سەرلەقاند و فێڵبازانە پێکەنی، وتی:

–هەروەها.... ئایا خاتوو پاولینا زۆر حەزی لە گوڵە؟

وتم:

–نازانم

بەسەرسامی هاواری کرد:

–تەنانەت ئەوەش نازانی؟

– نا نەخێر نازانم... دیقەتم نەداوە، نازانم... ئەمە دووبارە کردەوە و پێکەنیم.

– ئمم... ئەمەش بیرۆکەیەکم پێ دەدا

ئەمەی گوت وبەجوڵەی سەری خواحافیزی کرد و ڕۆیشت. هەرچۆنێك بێ شادی لە سیمای دەردەکەوت. هەردووکمان ئەو قسانەمان بە فەرەنسییەکی بێسەروبەر کرد.





# بەشی چوارەم

تەواوی رۆژەکەم پێکەنیناوی و هیچوپووچ بوو. ئێستا کاتژمێر یانزەی شەوە، من لە ژوورە بچووکەکەی خۆمم دەمەوێ هەندێك لە بیرەوەرییەکانم رێك بخەمەوە. کارەکانی ئەمڕۆم بەم شێوەیە دەستی پێ کرد: دەبووایە بچمە رۆلێت بۆ ئەوەی یاری لە پێناو پاولینا ئەلکسەندەرۆفنا بکەم. نۆسەد فردییکم برد، بە دوو مەرج: یەکەمین لەسەر بنەمای هاوبەشی یاری ناکەم. واتە هەرچەند لەیارییەکە ببمەوە، هیچ شتێك بۆ خۆم ناگێڕمەوە، دووەم ئێوارە کە گەڕامەوە پاولینا بۆم روون بکاتەوە بۆچی هێندە پێویستی بەبردنەوە هەیە، پێویستی بەچەند پارە هەیە. نەمدەتوانی مەزندەی ئەوە بکەم، ئەو تەنها بۆ خۆی ئەو پارەیەی مەبەست بێت، وەك رۆشن بوو ئەو پێویستی بە پارەیەکی زۆر هەیە، نازانم مەبەستی چییە. ئەویش بەڵێنی پێ دام روونکردنەوەم لەم بارەیەوە پێ بدات. منیش رۆیشتم.



ئاپۆڕەی خەڵك لە هۆڵەكانی قوماركردن جمەیان دەهات، ئای چەند چەپڵ و چەندە چاوبرسی بوون! ڕێگەكەی خۆم بەناو خەڵكەكە بڕی و لەمێزی قوماركردن نزیك بوومەوە، دواتر بە ترسەوە دەستم بەیاری كرد.سەركێشی ناكەم تەنها بە چەند خوردەیەك نەبێت، دواتر چاودێری یارییەكە دەكەم و تێبینی دەكەم. خەیاڵی ئەوە دەكەم هەموو ئەو حسێب و لێكدانەوانە بەهایەكی لە قوماركردن نییە، هیچیش لە مەترسییەكان كەم ناكاتەوە، وەك یاریزانەكان پێشبینی دەكەن، ئەوانەی لەوێ دادەنیشین و كاغەزی دەستیان پڕیەتی لە ژمارە، كەڕەتەكان هەژمار دەكەن، پێشبینییەكان هەڵدەسەنگێنن، دواتریش حیسابی كۆتایی دەكەن، كەچی دوای هەموو ئەمانە دەدۆڕێن، وەك هەر كەسێكی سادە دەدۆڕێن كە خۆی بەو لێكدانەوانە سەرقاڵ نەكردووە، یاریش دەكەن. لەبەرانبەر هەموو ئەوانە بە ئەنجامێك گەیشتووم ڕاستگۆیانە دەردەكەوێ: لەڕاستیدا هاتنی بەخت بەدوای یەكەوە، جۆرێك لە ڕێكخستنی هەیە، ئەگەر جۆرێك لە سیستەمی نەبێت، ئەمەش تۆزێك سەیرە. بۆ نموونە دەركەوتنی دوانزە ژمارەكەی ناوەڕاست لەدوای دوانزە ژمارەكەی كۆتایی دەبێت. دواتر دەچێتە سەر دوانزە ژمارەكەی یەكەم، ئەگەرهاتوو كەوتە دوانزە ژمارەی یەكەم، ئەوا بۆ دوانزە ژمارەی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، دواتریش لە دوانزە ژمارەی كۆتایی دەردەچێتەوە، ئەمەیان تەنها جارێك دەبێت، بەڵام دەرچوونی دوانزە ژمارەكەی ناوەڕاست سێ جار بەدوای یەك



دەبێت. ئەم یارییە کاتژمێر و نیوێك یان دوو کاتژمێر بەردەوام دەبێت: یەك، سێ، دوو. یەك، سێ، دوو، بەم شێوەیە، بەڕاستی شتێکی سەیرە. لە بەیانییەك یان دەمەوئێوارەیەك دەبینی سوور و ڕەش بەنۆرە دەردەکەون، ئەمەیش بەشێوەیەکی نارێك، لەهەر ساتێك هەر ڕەنگێك دووجار یان سێ جار دەردەکەوێت، ئەگینا تا ئێوارە یان ڕۆژی دواتر دەبینی بۆ نموونە هەر سوور دەردەکەوێتەوە، تەنانەت ئەگەر بۆ بیست و دوو جاریش بەدوای یەکەوە بێت. ئەمە تاماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت، لەوانەیە تەواوی ڕۆژەکە بەمشێوەیە دەربکەوێ. من لەو تێبینیانە زۆر قەرزاری مستەر ئاستلیم کە تەواوی ڕۆژ لەنزیك مێزی قومارەکان بەسەر دەبات، بێئەوەی هەرگیز یاری بکات.

با بگەڕێینەوە، بزانین چی بەسەر من هات، تا دوایین فلس دۆڕام، ئەمەش بەماوەیەکی زۆر کەم. یەکەمجار بیست فردیریکم لە ژمارەیەکی جووت دانا، بردمەوە، دووبارە دامنایەوە بردمەوە، بەمشێوەیە دوو سێ جاری دیکە، وابزانم ئەو پارەیەی لەماوەی پێنج خولەك کۆم کردەوە، نزیکەی چوار سەد فریدریك بوو. لەو کاتە وا پێویستی دەکرد بڕۆم، کەچی هەستێکی نامۆم لەلا دروست بوو، دەمویست بەگژ قەدەر بچمەوە، دەست بەڕووی قەدەر بوەشێنم، زمانم لەبەرانبەری دەربهێنم، بۆیە سەرکێشیم کرد زۆرترین پارەم دانا، چوار هەزار فلۆرین، دۆڕام. سەرم گەرم بوو، ئەو پارەیەی لەلام

مـابوو هـەمووم لەشـوێنی پێشـووم دانـا، ئەویشـم دۆڕانـد. ئینجـا بەخەیاڵێکی ئاڵۆز و شڵەژاو، مێزەکەم جێهێشـت. نەمدەتوانی لـەوە بگەم چی ڕوویدا، بە پاولینام نەوت چیم بەسـەر هـاتووە، تـەنها بـەر لەنانی ئێوارە نەبێت، پێشتر لە باخچەکە بـە پەشـۆکاوی ئەمسـەر و ئەوسەرم دەکرد.

لەکاتی نانی ئێوارە هەر وەك سێ ڕۆژ لەمەوبەر، پەشۆکاو بـووم، هێشتا فەرەنسییەکە و خـاتوو بلانـش لەگـەڵ ئێمـە نـانی ئێوارەیـان دەخـوارد، وا ڕێکـەوت بەیانییەکـەی خـاتوو بلانـش لـە گـازینۆ بـوو، ئـەوەی بینـی کـە بەسـەرم هـاتبوو، بۆیـە ئـەم جـارە بـە بایـەخی زیـاترەوە قسـەی لەگـەڵ دەکـردم. کەچـی پیـاوە فەرەنسـیەکە بەهـەنگاوی خێراتـر بـەرەو مەسـەلەکە دەهـات و بـێ پـێچ و پـەنا پرسیاری ئەوەی لێکردم ئەو پارەیەی دۆڕاندم هی خۆم بـوو، وابـزانم ئـەو هەسـتی کـردووە پارەکـە هـی پاولینایـە. ( بەرنجەکـە پیـازی تێدایە) . منیش لەوەلاًمدا وتم ئەو پارەیەی دۆڕاندم هی خۆم بوو.

ژەنەڕاڵ بێ ئەندازە پەشۆکا بوو: ئەو هەموو پارەیەت لەکوێ بـوو؟ بۆم ڕوونکردەوە، گوایە من بە دە فردریك دەستم بـە قومـارکردەوە، دوای شەش جار یان حەوت پارەکە بەبردنەوە زیادبوو، تا وای لێهات پێنج هـەزار یـان شـەش هـەزار فلـۆرینم هـەبوو. دواتـر بـە دوو جـار هەمووم دۆڕاند. بێگومان دەکرێت ئەو قسانە جێی باوەڕپێکردن بـن. لەکاتی ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە سەیری پاولینام دەکرد، نـەمتوانی

هیچ ئاماژەیەك لە سیمای بەدی بکەم، بەلاّم نەهاتە ناو بابەتەکەوە بۆئەوەی قسەکانم تەواو بکەم. بۆم دەرکەوت دەبیّ درۆ بکەم بۆ ئەوەی ئەو مەسەلە پەردەپۆش بکەم کە بەپارەی ئەو یارییم کردووە. هەرچۆنێك بێت بەخۆم دەگوت: ئەم شەو دەبێت ڕوونکردنەوەم پیّ بدات، وەك بەیانی بەڵێنی پێداوم.

وام پێشبینی دەکرد، ژەنەراڵ تێبینییەك دەدات، بەلاّم بێدەنگ بوو. لەبەرانبەر ئەوە پەشۆکاوی و نیگەرانی لە سیمای دەردەکەوت. لەوانەیە وا هەست بکات خۆی کۆمەڵێك مەینەتی هەیە، کەچی ئێستا دەبیستیّ کەسێك بە چارەکە سەعاتێك کۆمەڵێك زێری دێتە بەردەست، کەچی هەمووی لەبەرەلاّیی دەدۆڕێنیّ. وا هەست دەکەم دوێنیّ ئێوارە مشتومڕێکی توند لەنێوان ژەنەڕاڵ و فەڕەنسی ڕوویداوە. دوای ئەوەی دەرگایان لەسەر خۆیان داخست قسەکانیان توندوتیژ بوو، فەڕەنسییەکە بەتۆڕەیی هاتە دەرەوە. ئەم بەیانییەش زوو گەڕاوەتەوە لای ژەنەڕاڵ... بێگومان بۆ ئەوەی قسەکانی دوێنیّ شەو تەواو بکەن.

کاتێك کابرای فەڕەنسی بە دۆڕانەکەی منی زانی، هەوڵی دا بەزمانێکی گاڵتەپێکردن، بەجۆرێك لەمەکربازی و چەپڵیّ، ئاگادارم بکاتەوە، لەوەی مرۆڤ دەبێت ژیر و عاقڵ بێت، نازانم بۆچی باسی ئەوەشی کرد ڕووس ناتوانن قومار بکەن، هەرچەندە زۆریش قومار دەکەن.



کەچی من وتم:

-بە بڕوای من ڕۆلێت تەنها بۆ رووس داهێنراوە.

کاتێك بینیم فەرەنسییەکە بە پێکەنینەوە گوێم لێ دەگرێ، بە واتایەکی ڕق وکینەوە گوێم لێ دەگرێ. سەرنجی ئەو راکێشا بۆ ئەوەی من لەسەر هەقم، کاتێکیش رووسەکان بە قومارباز وەسف دەکرێن، ئەمە ستایشکردن نییە، بەڵکوو سەرزەنشتکردنە، بۆیە دەبێت لەگەڵ بۆچوونەکانم تەبا بێت.

فەرەنسییەکە پرسی:

-لەسەر چ بنەمایەك ئەم ڕایەت هەیە؟

- لەسەر ئەو بنەمایەی بەهرەی سەرمایە کۆکردنەوە لە مێژوودا، بووەتە یەکێك لە چاکەکانی مرۆڤی ڕۆژئاوایی، تەنانەت بووەتە برگەیەکی سەرەکی لەتۆماری ئەوان، کەچی رووسەکان لە کۆکردنەوەی سەرمایە کەم توانا نین، بەڵکوو لێرە و لەوێ، بێئەوەی هەست بکەن لەچاکە و خراپە پارەکەیان پەرشوبڵاو دەکەن. ئەمەش وای کردووە ئێمەی رووس هەردەم پێویستمان بەپارە بێت، بۆیە دەبینی چاوبرسێن بەدوای ڕۆلێت و ئامێرەکانی دیکە دەگەڕێین. دەتوانین لەم ڕێگەیەوە بێئەوەی کار بکەین، لەماوەی دوو کاتژمێر پارەیەکی زۆر و زەوەند کۆ بکەینەوە. ئەمەیش تەفرەمان دەدات و



شەیدامان دەكات، كاتێك بێ بیركردنەوە هەڕەمەكی یاری دەكەین، بێگومان دەدۆڕێین.

فەڕەنسیەكە بەسەر سامییەوە لەگەڵم هاوڕا بوو، وتی:

–بەشێك لە قسەكانت دروستە.

ژەنەراڵ بەزمانێكی زبر و بە فیزەوە وتی:

= بەڵكوو هەڵەیە. نەنگییە بۆ تۆ ئەم جۆرە قسانە بۆ نیشتمانەكەت هەڵدەبەستی.

منیش وەلاّمم دایەوە و وتم:

–ببوورە... ئێمە دەتوانین بپرسین كامیان خراپترە: سەرەڕۆیی رووسەكان، یان شێوازی شەرفەمەندانەی ئەڵمانەكان كە بەكاركردنی سەخت پارە كۆدەكەنەوە!

ژەنەراڵ هاواری كرد:

–بیرۆكەیەكی زۆر بێ ئابڕوویانەیە!

فەڕەنسییەكەش وتی:

–بەڕاستی بیرۆكەیەكی رووسییە!

منیش پێدەكەنیم. زۆر تێنووی ئەوە بووم برینداریان بكەم و تووڕەیان بكەم، بۆیە وتم:



– ئامادەم هەموو ژیانم لە چۆڵ و بیابان بـژیم، لـەژێر ڕەشمـالآن بم، بەلآم ئامادە نییم بتێکی ئەڵمان بپەرستم.

توڕەبوونەکەی ژەنەڕاڵ زۆر توندتر دەردەکەوت، پرسی:

–کامە پەرستراو؟

– مەبەسـتم شـێوازی ئەڵمانەکانـە لـە کۆکردنـەوەی سـامان. مـن ماوەیەکی کورتە لێرەم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ماوە کورتـە دەرفـەتی ئەوەی بۆ رەخساندووم، هەنـدێك تێبینـی ئـەوتۆ بکـەم، کە خـوێنی تەتـەرییم تێـدا ببزوێنـێ و گیـانی یـاخیبوونم تێـدا زینـدوو بکاتـەوە. سوێند دەخۆم من ئەم جۆرە چاکەخوازییەم نـاوێ. دوێنـێ نزیکـەی دە فەرسەخێك بەم دەوروبەر گەڕام، ئەوەی بینم هەر ئەو شتانە بوو لەکتێبە ئەڵمانیانە خوێندومانەتەوە کە باس لە ئەخلاق دەکەن و بـە وێنە رازێندراونتەوە. لە هەر ماڵێك ڤاتـەرێك هەیـە، زۆر پابەنـدە بـە چاکەخوازییەوە. تەنانەت مرۆ دەترسێ لێی نزیك بێتەوە، من ناتوانم بەرگەی ئـەو شـەڕەفەمەندانە بگـرم و لێیـان نزیـك ببمـەوە. ڤاتـەری خێزانـە هـەموو ئێوارەیـەك ئەندامـەکانی خێزانەکـەی کۆدەکاتـەوە کتێبی رۆشنبیری بـە دەنگی بـەرز دەخوێننـەوە، لـە سـەرووی مـاڵ بچـووکەکانیان، دەنگـی لـەرزینی درەختـەکان دەبیسـترێ. دەمـەو ئێـواران باڵنـدە لەسـەر بانەنـەکان... هـەموو ئەمانـە تـا ئەوپـەڕی شیعرانە و هەست بزوێنن... ژەنـەڕاڵی گـەورەم تـوڕە مەبـە، ڕێگـەم بدە با قسە لەسەر ئەو شێوازە بکەم کە بەسەر دڵانەوە کاریگەرە.

من باوکی کۆچکردووم وەبیر دێتەوە کە ئێواران، لەژێر دارەکانی باخچە بچووکەکەمان کتێبی لەم جۆرەی بۆ من و دایکم دەخوێندەوە. کەواتە من دەتوانم لە بارودۆخەکە بگەم. لێرە هەر خێزانێك ڤاتەرێکی هەیە، بەتەواوی ئەم کەسە دەپەرستن، هەموویان وەك مانگا کار دەکەن و وەك جولەکەش سامان کۆدەکەنەوە. با گریمانەی ئەوە بکەین باوکەکە پیشە و زەوییەکەی بە میرات بە کوڕە گەورەکەی دەدات، ئەو ناتوانێ مارەیی بۆ کچەکەی دابین بکات کاتێك شوو دەکات. کوڕە بچوکەکەش وەك خزمەتکار یان وەك سەرباز دەفرۆشن، بەهاکەی ئەویش دەخەنە ناو میراتەکەوە. ئەمە ڕاستە، لێرە پرسیارم کردووە، بەمشێوەیە. هەموو کارەکانیش سەرچاوەکەی لە دڵسۆزییەوەیە. دڵسۆزییەك زۆر زێدەڕۆیی تێدا کراوە. تەنانەت ئەو کوڕە بچووکەکەی کە فرۆشراوە، باوەڕی وایە بە پاڵنەری شەرەفمەندی ودڵسۆزییەوە فرۆشراوە، بۆیە بەوە دڵخۆش دەبێت کە دەبێتە قوربانی! دواتر چی ڕوودەدا؟ کوڕە گەورەکە خۆشی لە ژیانی خۆی نابینی، چونکە ناتوانێ ئەو کچە بخوازێ کە خۆشی ویستووە، چونکە هێشتا فلۆرینەکانی تەواو نەکردووە، بۆیە هەردووکیان بە چاکەخوازی و دڵسۆزییەوە چاوەڕوان دەکەن و بەزەردەخەنەوە لە ئایندە دەڕوانن، تا کچەکە کوڵمەکانی سیس دەبێت، ئاوی هەردووکیان وشك دەبێت، دواجار دوای بیست ساڵ بە دڵسۆزی و چاکەوە فلۆرینەکان تەواو کۆدەبێتەوە، ئەوکاتە ڤاتەر پیرۆزبایی لەکوڕەکانی دەکات کە تەمەنی بۆتە ٤٠ ساڵ و کچەکە

تەمەنی بۆتە ٣٥ ساڵ، مەمکەکانی هەڵۆەریوە و لووتی سوور هەڵگرەوە، باوکە لەم بۆنەیەدا دەگری و باس لە چاکییەکانی ئەخلاق دەکات... دوا وتەکانی ...

بەمەش کورەگەورە دەبێتە ڤاتەرێکی دیکە، بەم شێوەیە چیرۆکەکە دووبارە دەبێتەوە، تا پەنجا ساڵ یان شەست ساڵ تێدەپەرێ، دەبینی نەوەی ڤاتەری یەکەم سەرمایەکی قەبەیان کۆکردووەتەوە، ئەوەیان بۆ کورەکەی جێهێشتووە، کورەکەشی بۆ ئەویتر، دوای پێنج پشت یان شەش دەبینی بارۆن رۆچیلد یان هۆ و هاوبەشەکانی دەردەکەوێ، یان نازانم چ شەیتانێکی دیکە دەردەکەوێ! ئایا ئەمە دیمەنێکی نایاب نییە: سەدەیەك یان دوو سەدە: لە کارکردنی سەخت، سەبرێکی بەردەوام، زیرەکی و چالاکی، دڵسۆزییەکی تەواو، وزەیەکی بەردەوام، مکورپبوونێکی توند، تێروانین لە ئایندە.. لەمە زیاتر چیتان دەوێ؟ هیچ شتێك لەمە نایابتر و بەرزتر نییە. بە پێی ئەم بۆچوونە ئەوان حوکمی هەموو دونیا دەکەن، سزای گوناهبارەکانیش دەدەن، واتە ئەو کەسانەی بچووکترین جیاوازیان لەگەڵ ئەوا هەیە! کەچی بەلای منەوە گاڵتەکردن بە شێوازی رووسی و کۆکردنەوەی پارە بە رۆلێت خۆشەویست و کاریگەری زیاتر بەسەر منەوە هەیە. نامەوێ لەکۆتایی پێنج نەوە بەدوای یەك ببمە هۆ و هاوبەشەکانی. من بۆ خۆم پێویستم بە سامانە، هەرگیز

خۆشم بەسامان پێوانە ناکامە، دەزانم من قسەی پڕوپوچووم زۆر کرد، بەلاّم زیانێکی نییە، ئەمانە بۆچوونی منن.

ژنەڕاڵ حەپەسابوو بیری دەکردەوە، وتی:

–نازانم قەسەکانت ڕاستییان تێدایە یان نا، بەلاّم ئەوەی لێی دلّنیام، تۆ زۆر لەخۆبایی بوویت و جڵەوی خۆت......

ژەنەڕاڵ وەك نەریتی خۆی ڕستەکەی تەواو نەکرد، ئەو هەروایە کاتێك قسە لەسەر ئەو بابەتانە دەکات تۆزێك نائاسایین، هیچ کاتێك ڕستەکان تەواو ناکات. کابرای فەڕەنسیش تێی دەڕوانیم و گوێبیستی من بوو، وەك ئەوە بوو بایەخ بە قسەکانم نەدات، بەلاّم پاولینا لوتبەرز بوو، وەك ئەوە بوو هیچ قسەیەکی نەبیست بێ کە لەسەر خوانەکە کرابوو.







# بەشی پێنجەم

پاولینا وەك نەریتی خۆی دانیشتبوو، بیری دەکردەوە. هەر کە لەسەر خوانەکە هەڵساین، داوای لێکردم پیاسەیەکی لەگەڵ بکەم. منداڵەکانمان برد، لەلای نافورەکەوە بەرەو باخچەکە ڕۆیشتین. من زۆر پەرۆش بووم، گێلانە و بە پەلە پرسیاری ئەوەم لێکرد بۆچی مارکیز دی گریۆ( فەڕەنسیەکە کورتەکە)ی لەگەڵ نابینم. نەوەك تەنها یاوەری ناکات لە چوونە دەرەوە، بەڵکوو تەواوی ڕۆژ وشەیەکیشی لەگەڵ نادرکێنێ.

بەدەنگێکی نامۆ وتی:

–چونکە دڵڕەقە.

هەرگیز پێشتر بەمشێوەیە باسی دی گریۆی نەکردووە، بێدەنگ بووم دەمویست هۆکاری ئەو دڵڕەقی و توڕەییە بزانم، دواتر وتم:

–تێبینی ئەوەت کردووە، ئەمڕۆ لەگەڵ ژەنەڕاڵ ناتەباییە.

بەزمانێکی وشك، بە توڕەیی وتی:



–تۆ دەزانی ئەو قەرزی داوەتە ژەنەراڵ، ژەنەراڵیش هەموو موڵکەکانی خۆی وەك بارمتە داناوە، ئەگەر داپیرە نەمرێت ئەوا هەموو شتەکان بۆ فەرەنسیەکە دەبێت، ئەو دەبێتە خاوەنی.

– ئایا ئەمە ڕاستە ژەنەراڵ شتەکانی بە بارمتە داناوە؟ من ئەو بابەتەم بیستووە، بەڵام باوەڕم نەکردووە.

–بەڵێ ڕاستە.

وتم:

–کەواتە ماڵئاوا ئەی خاتوو بلانش، ئەو نابێتە هاوسەری ژەنەراڵ. ئایا دەزانی، من خەیاڵی ئەوە دەکەم ژەنەراڵ زۆر شەیدای خاتوو بلانش بووە، ئەگەر ئەو کچە بڕوات، ئەوا ژەنەراڵ لەوانەیە خۆی بکوژێ. دڵدارییەکی سەخت لەم تەمەن بۆ ئەو ترسناکە.

پاولینا ئەلکسەندەرۆڤنا خەیاڵی پەرتەوازە بوو:

–منیش باوەڕم وایە شتێکی لەم جۆرە ڕوویدات.

منیش هاوارم کرد:

– ئای لەمە نایابتر نییە! بەهێزترین بەڵگە ئەوە بوو ئەو کچەی بە هاوسەرگیری ژەنەراڵ ڕازی نەدەبوو تەنها لەبەر سامانەکە نەبێت. ئەوان تەنانەت ڕەچاوی گونجان و نزیکیان نەکردبوو، هیچ شتێك لەنێوانیان هاوبەش نەبوو. ئەمە زۆر نایابە! دواتر ئەمە چییە کە لەبارەی داپیرەوە ئەنجامی دەدەن. ئایا هیچ شتێك لەمە



پڕوپووچتره، برووسکه بنێـری: ((ئایـا مـردووه؟ ئایـا مـردووه؟ ئایـا بەڕاستی مردووه؟)) پاولینا ئەلکسەندەرۆڤنا تۆ بووچوونت چییه؟

به قێزەوه قسەکانی پێ بڕیم و وتی:

–هەموو ئەم قسانه پڕوپوچی و دەبەنگییه! مـن سەرسـامم بـەوەی تـۆ تـا ئـەو رادەیـه شـادومانی، چ شـتێك شـادومانت دەكـات؟ ئایـا پارەكەی من كه دۆڕاندت؟

– بۆچی پارەت پێ داوم تا بیدۆڕێنم؟ من پێم وتی ناتوانم قومار بـۆ كەسێكی دیكه بكەم، بەتایبـەتی نـاتوانم بـۆ تـۆ یـاریی بكـەم! مـن گوێڕایەڵی هەموو فرمانێكی تۆم. لەگەڵ ئەوەش تۆم ئاگادار كردەوه كه كۆتاییەكەی خێر نابێ. ئێستا پێم بڵێ: ئایا بـەوه كاریگـەربووی كه ئەم پـاره زۆرو زەوەنـدەت دۆڕانـدووه؟ ئـەو پارەیـه چ سـوودێك بەتۆ دەگەیێنێ؟

– بۆچی ئەم پرسیارانه؟

– تۆ بـەڵێنت بـەمن داوه ئـەو بابەتـەم بـۆ ڕوون بكەیتـەوه.. گـوێ بگره: من باوەڕم وایه بۆ خۆم یاری بكەم ( لەسـەر دوانـزه فردریـك) دواتر دەبەمـەوه، ئـەو كاتـه هـەر چـەندەت پـاره دەوێ مـن بـەتۆی دەدەم.

به ڕق وكینەوه سەیری كردم، منیش لەقسەكانم بەردەوام بووم:



–له من توره مه‌به که ئه‌م پێشنیازه‌ت بۆ ده‌که‌م. هه‌ستم ته‌ژییه له‌وه‌ی تۆ وه‌ك (سفرِ) سه‌یری من ده‌که‌ی، که‌واته ده‌توانیێ پاره‌شم لێ وه‌ربگری، هیچ زیان و سوکایه‌تیه‌کت پیێ ناگات، وه‌ك دیاری وه‌ری بگره. دواتر من پاره‌ی تۆم دۆڕاندووه.

خێرا نیگای کردم ، تێبینی ئه‌وه‌ی کرد من به‌تووڕه‌یی و گاڵته‌پێکردنه‌وه ئه‌م قسانه ده‌که‌م، جارێکی دیکه بابه‌ته‌که‌ی گۆڕی.

–هیچ شتێکم نییه پێوه‌ندی به تۆوه هه‌بێت، ئه‌گه‌ر سووری له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی بزانی، ئه‌وا من قه‌رزێکی زۆرم له‌سه‌ره، من پاره‌م قه‌رز کردووه، ده‌بێت بۆ خاوه‌نه‌که‌ی بگێڕمه‌وه. بیرۆکه‌یه‌کی شێتانه‌م بۆ دروست بووه، گوایه ده‌کرێت ئه‌و پاره‌یه له قومار به‌ده‌ست بهێنم، بۆچی ؟ نازانم. به‌ڵام باوه‌ڕم وایه براوه ده‌بم، کێ ده‌زانیێ؟ له‌وانه‌شه ئه‌و هیوایه‌م له‌وه‌وه بۆ دروست بووبیێ، که قومار تاکه به‌خته په‌نای بۆ ببه‌م.

– یان له‌به‌ر ئه‌وه‌یه هه‌ر ده‌بێت ببه‌یته‌وه جا ئه‌نجامه‌که‌ی هه‌ر چییه‌ك بێت، تۆیش وه‌ك ئه‌و مرۆڤه‌ی که له نقوم بووم په‌نا بۆ پووش وپه‌ڵاش ده‌بات، وا ده‌زانیێ قه‌دی دارێکه، وا ده‌زانیێ به‌و پووش و په‌ڵاشه نه‌جاتی ده‌بێت؟

سه‌رسامی به پاولیناوه دیار بوو، پرسیاری کرد:

–چۆن ؟ ئەی تۆش هەمان ئومێدت نییە؟ پانزە ڕۆژ لەمەوبەر باست کرد، درێژدادڕیت لە باسەکە کرد، گوتت دڵنیای لە رۆلێت قازانج دەکەی، تکات لیٚ کردم وەك شێت سەیرت نەکەم، ئایا تۆ گاڵتەت دەکرد؟ بەڵام لەبیرمە قسەکانت بەجۆرێك جددی بوون، مەحاڵ بوو مرۆڤ بە گاڵتە و گەپ وەری بگریٚ!

بیرم کردەوە و وتم:

–ڕاستە. ئێستاش بڕوام هەیە براوە دەبم، تەنانەت ددان بەوە دەنێم ئێستا تۆ بەرەو ئەو ئاڕاستەیەم دەبەی ئەم پرسیارە لە خۆم بکەم: بۆچی ئەم دۆڕاندنە سەیرەی ئەمڕۆ، لە ناخم گومانی دروست نەکردووە؟ هێشتا باوەڕم بەوە هەیە براوە دەبم، بەڵام ئەگەر بۆ خۆم یاری بکەم، نەوەك بۆ کەسێکی دیکە.

– بۆچی ئەم بڕوایەت هەیە؟

– بەڕاستی نازانم، بەڵام دەزانم دەبێت براوە بم، ئەم بردنەوەیە تاکە دەروازەی نەجاتبوونمە، لەوانەشە هەر ئەمە وا بکات بڵێم مەحاڵە دەبێت ببمەوە.

– کەواتە دەبێت هەر چۆنێك بێت براوە بیت، کاتێك متمانەکەت هێندە قایم بێت.

– کەواتە من پێداگری دەکەم، تۆ گومانت لەوە هەیە، لەوانەیە من هەست بکەم پێویستی زۆرم بەپارە هەبێت؟



– ئەمە بەلای منەوە گرنگ نییە، بەلام کە تۆ پرسیار دەکەی منیش دەلێم: بەڵێ. من گومانم هەیە لەوەی تۆ شتێك هەبێت بە قووڵی ئازارت بدات. لەوانە هەندێك ئازارت هەبێت، بەلام ترسناك نییە. لەگەڵئەوەش تۆ مرۆڤێکی سەرگەردانی لەسەر بارێك جێگر نابی. تۆ چ پێویستیت بە پارە هەیە؟ من باسی هۆکارەکانم بۆ کردی، شتێکی دیکە نادۆزمەوە گرنگی هەبێت...

نەمهێشت قسەکانی تەواو بکات و وتم:

–هەر بەو بۆنەیەوە، تۆ وتت پێویستم بەوە هەیە قەرزێك بدەمەوە، قەرزێکی گەورە، خەیاڵی ئەوە دەکەم، فەڕەنسییەکە خاوەن قەرزەکە بێت؟

– ئەمە چییە؟ ئەمرۆ پاڵەوانی، ئایا تۆ سەرخۆشی؟

– تۆ دەزانی من ڕێگە بەخۆم دەدەم هەموو شتێك بڵێم، تەنانەت هەندێك جار ڕاستەوخۆ پرسیار دەکەم، من کۆیلەی تۆم، مرۆ لە کۆیلەکەی خۆی شەرم ناکات، لە بەرانبەری هەست بە سووکایەتی و کەموکوڕیی خۆی ناکات.

– چەندە پڕوپووچە! من بەرگەی ئەم تیۆرەی کۆیلایەتی ناگرم کە تۆ باسی دەکەی.

–تێبینی ئەوە بکە، من قسە لەسەر کۆیلایەتی خۆم ناکەم ، گوایە ئارەزوو بکەم مـن کۆیلـەت بم، بەڵکوو ئەمە شتێکە لەدەرەوەی ویستی منە.

– بە ڕاشکاوی بڵێ: تۆ بۆ پێویستت بەپارەیە؟

– ئایا تۆ بۆچی دەتەوێ بزانی؟

بە لووتبەرزی وەڵامی دایەوە و سەری لەقاند و وتی:

–تۆ ئازادی

منیش وتم:

–تۆ تیۆری کۆیلایەتی قبووڵ ناکەیت، دەتەوێ مرۆ خۆی بکاتە کۆیلەی تۆ ( وەڵام بدەوە ، بێنەوەی بیانو بگری)، ئەمە زمانی تۆیە، بە هەرحاڵ ئەوەی تۆ دەتەوێ: بۆچی من پێویستم بە پارەیە؟ ئەمە پرسیاری تۆیە، ئای لەم پرسیارە، ئەمە پارەیە... ئەمە هەموو شتێکە...

– لەمە تێگەیشتم، بەڵام نابێت مرۆڤ بەم شێوە شێت بێت هەموو ئارەزوویەکی لە سامان بێت! من وای دەبینم تۆ بەرەو وڕێنە دەڕۆی.. بەڵام شتێکت هەیە، ئامانجێك هەیە، بێ پێچوپەنا، دەمەوێ ئەم ئامانجە بزانم.

خەریك بوو تەواو توڕە دەبوو، من شەیدای ئەوە بووم دەمبینی بە توڕەیی پرسیارم لێ دەکات.



وتم:

-بێگومان ئامانجێکم هەیە، بەڵام نازانم چۆن ئەم ئامانجەت بۆ ڕوون بکەمەوە، بەکورتییەکەی من بە سامان دەبمە پیاوێکی دیکە، تەنانەت لە تێڕوانینی تۆش، من وەك كۆیلە نامێنمەوە.

– چۆن ؟ چۆن بەمە دەگەیت؟

-چۆن بەوە دەگەم؟ تۆ تەنانەت ناتوانیٚ لەوە بگەیت، کەم دەتوانم بگەمە ئەو ئاستەی تۆ وەك مرۆڤ سەیرم بکەی، نەوەك كۆیلە ! بەتایبەت وای لێهاتووە ئەمەشم نەوی. ئێستا وام لێهاتووە ئەم شۆك و سەرسامییەی تۆم ناویٚ!

– دەتگوت ئەم كۆیلایەتییە چێژ و شادی بەتۆ دەبەخشیٚ. منیش ئەم قسەیەم باوەڕ دەکرد.

ڕاستم وتووە، من هەستم بە چێژێکی سەیر و دەگمەن دەکرد:

-ئایا تۆ باوەڕت دەکرد؟ ئای لەم ساویلکەییە جوانە ! بەڵیٚ ئەو كۆیلایەتییەی بۆ ئەوم هەبوو، بەلای منەوە چێژێکی بێگەردی هەبوو. مرۆ لەوانەیە لەوپەڕی ملکەچی و داکەوتن چێژ وەربگریٚ.(بەردەوام هوریێنەم دەکرد). کیٚ دەزانیٚ؟ لەوانەیە مرۆڤ چێژێکی زۆر لەوە ببینیٚ کاتێك نەگبەتیەك بەسەری دەکەوێت، پشتی دادەمالیٚ. بەڵام من خەریکە هەست بە چێژی دیکە دەکەم... ماوەیەکی لەمەوبەر، میر لەبەردەم تۆ تووشی نیگەرانی

کردم، لەبەرئەوە ڕۆژێك حەفسەد ڕۆبل وەردەگرم، مارکیز دی گرییۆ بڕۆکانی هەڵدەتەکێنێ، لەهەمان کات نکۆڵی لە بوونم دەکات، ئەمە لەکاتێکدا لەوانەیە من ئارەزووی ئەوەم هەبێ لەبەردەمی تۆ لووتی مارکیز بگرم.

—وەك هەرزەکارێك قسە دەکەی! مرۆڤ دەتوانێ لە هەر بارودۆخێك بێت، بەشێوەیەك هەڵسوکەوت بکات، ڕێزی کەرامەتی خۆی بپارێزێت، کۆششکردن پلەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە نزمی ناکاتەوە.

— ڕستەی ئەزبەرکراو و قسەی نەستەق، بەم شێوەیە قسە دەکەی! وا دەزانی من ناتوانم بە سەنگینی هەڵسوکەوت بکەم، من ڕێزی خۆم هەیە، بەڵام نازانم چۆن هەڵسوکەوت بکەم کە کەرامەتەکەم پارێزراو بێت. وا هەست دەکەی مەسەلەکە بەمشێوەیەیە! کەچی هەموو رووس بەمشێوەیەن. رووسەکان لەگشت بەهرەکان دەوڵەمەندن، بە پەلە بەبەهرە جۆراوجۆرەکان دەگەن، تەنانەت نازانن کام بەهرە بۆیان دەگونجێ. کەچی لێرە ڕوواڵەت گرنگە. ئێمەی ڕووس، ئێمە بە هەموو بەهرەکان دەگەین، بەڵام پێویستمان بە بلیمەتییە بۆ ئەوەی شێوەیەکی گونجاو بۆ خۆمان هەڵبژێرین. بەشێوەیەکی گشتی ئێمە پێویستمان بە بلیمەتییە، بەشێوەیەکی گشتی بلیمەتی شتێکی دەگمەنە. ڕوواڵەت بەلای فەڕەنسییەکان و ئەورووپییەکانی دیکە، تا ئەوپەڕی بایەخی پێ دەدرێت، لەوانەیە تۆ کەسێك لەوان ببینی، بەڕوواڵەتی کابرایەکی بەڕێز و سەنگین دەربکەوێ، کە



لەڕاستیدا لەوانەیە لەهەموو کەسێك زیاتر لە کەڕامەت بەدوور بێت. هەر ئەمەش وایکردووە تەواوی رووخسار و رووالەت بەلای ئەوانەوە گرنگ بێت. لەوانە فەرەنسییەکە بەرگەی جۆرێك لەجۆرەکانی سووکایەتی قووڵ بگرێت، هەرچەندە سووکایەتیەکی ڕاستەقینەش بێت، تەنانەت نیوچەوانیشی گرژ ناکات، بەڵام بەرگەی ئەو ناگرێت سەرە پەنجەیەك بەلووتی بنێیت، چونکە ئەمەیان پێچەوانەی ئادابی گشتی و رووالەتە باوەکەیە. هەر لەبەر ئەمەشەوە دەبینی فەرەنسییەکان لەلای کچانی ئێمە بەختیان هەیە و سەرکەوتوون، چونکە شێوەیەکی جوانیان هەیە. کەچی بەلای خۆمەوە هیچ شێوەیەکی جوان نابینم، بەڵکوو کەلەشێرێك لە کەڵەشێرەکانی گالیا دەبینم. بەهەرحاڵ من ناتوانم لە رووخسار بگەم، چونکە من ژن نیم، لەوانەیە لەکەلەشێرێکیش نەزانم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قسە پڕوپووچانە دەکەن، تۆش لەقسەکردن ناموەستێنی. تۆ زیاتر بموەستێنە. کاتێك قسە بۆ تۆ دەکەم، حەز دەکەم هەموو شتێك بڵێم، هەموو... توانای ئەوەم نییە رەچاوی رواڵەت بکەم. ئیعتراف بەوە دەکەم نەوەك تەنها رووخسار بەڵکوو هەموو تایبەتمەندییەك لەدەست دەدەم. ئێستا هەموو شتێك لەناخی مندا دەبێتە بەستەڵەك لەوانە تۆش هۆکارەکەی بزانی. شتێك لە زەینم نەماوە، تەنها بیرۆکەیەك نەبێت، ئێستا وام لێهاتووە، نازانم چ شتێك لەدونیا، لەرووسیا، تەنانەت لێرەش روودەدا. بۆ نموونە بەشاری درسدن تێپەڕیم، نازانم ئەو شارە لە چی دەچێ. تۆ دەزانی چ شتێك

سەرقاڵم دەکا. ئەگەر هیچ هیواییەك بۆ من نەبێت، ئەگەر من لەپێش چاوی تۆ سفرِ بم، ئەوا من قسەکانم ڕاشکاوانە دادەڕێژم: من لە هەر شوێنێك جگە لە تۆ هیچی دیکە نابینم، جگە لە تۆ هەموو شتەکانی دیکە بۆمن وەك یەکە. بۆ تۆم خۆشدەویٚ؟ چۆن تۆم خۆشدەویٚ؟ نازانم. لەوانەیە هیچ جوانییەکت نەبێت، ئایا وێنای ئەوە دەکەی، من نازانم تۆ جوانی یان نا، تەنانەت جوانی ڕووخساریش؟ سەبارەت بەدڵت ئەوا بێگومان خراپەکارە، بیرکردنەوەشت لەوانەیە خاڵی بێت لەهەر بەرزی و خەسڵەتێکی خانەدانی.

– لەوانەیە باوەڕ نەبوونت لە خانەدانی من وای کردووە، بتەویٚ بە پارە من بکڕی؟

بەپەلە وتم:

–کەی پەنام بۆ پارە بردووە، تۆ بکڕم؟

– ڕێگەی خۆت ونکردووە، عەقڵت لەدەست داوە، ئەگەر هیوای ئەوەشت نەبوویٚ بە پارە بمکڕی، ئەوا من بەم شێوەیە لەتۆ دەڕوانن کە دەتەویٚ بە پارە بمکڕی.

– بابەتەکە تەواو بەمشێوەیە نییە. بەتۆم گوت ئەستەمە بتوانم ئەوەی دەروونم بۆ تۆ شی بکەمەوە. تۆ ورد و خاشم دەکەی، زۆربڵێی من تۆڕەت ناکات. تۆ دەزانیٚ بۆچی نابێت لەمن تورە بی. من شێتم، ئەمە تەواوی بابەتەکەیە، ئەمەشم بەلاوە گرنگ نییە،

ئەگەر دەخوازی تورە بە. من تەنها ئەوەندەم بەسە، لە ژوورە بچووکەکەم لە سەرەوە دابنیشم، تەنها خەریکی بیروەرییەکانت بم، یان خەیاڵم لەلای خشپەی کراسەکەت بێت، نەوەك پەنجەکانم بگەزم و بیر لەوە بکەمەوە، تۆ لەچی تۆراوی؟ لەگەڵئەوەش رایدەگەینم من کۆیلەی تۆم؟ سوود لەکۆیلەیی من ببینە، سوودی لێ ببینە! ئایا دەزانی من رۆژێك تۆ دەکوژم؟ نەوەك لەبەر ئیرەیی یان لەبەر ئەوەی ئەوینت لەلای من کۆتایی دێت! نەخێر دەتکوژم تەنها لەبەر ئەوەی چەند رۆژێکە ئارەزوو دەکەم قوتت بدەم. ئەوە پێدەکەنی؟

بەزمانێکی تورەوە وتی:

–پێناکەنم، بەڵکوو فرمانت پێ دەکەم، کە بێدەنگ بی.

من وەستام، ئەویش لەتورەییان هەناسەی نەدەهات. خوا دەزانێ، من نازانم جوانە یان نا، بەلاّم کاتێك بەمشێوەیە دەوەستێ حەز دەکەم سەیری بکەم، لە پێناو ئەوەش تورەی دەکەم، لەوانەشە ئەو تێبینی کردبێ، بۆیە بەئەنقەست خۆی تورەدەکات. ئەمەشم پێ گوت، بە قیزەوە هاواری کرد:

–ئای لەو چەپەڵییە!

دەستم بە قسەکانم کردەوە و وتم:

–ئەوەم لەدەست دێ... دواتر بزانە زۆر ترسناکە بە یەکەوە پیاسە بکەین: زۆرجار ئارەزوویەکی توند هەیە لێت بدەم، سیمات بشێوێنم،



بتخنكێنم. ئایا مەزندە دەكەی بگاتە ئەم ئاستە؟ تۆ تورەم دەكەی: ئایا وادەزانی من لە ئابڕووچوون دەترسم؟ من لە تورەیی تۆ هیچترم ! من بێ هیوا تۆم خۆشدەوێ، دەشزانم ئەم خۆشەویستییەم هەزار هێندە زیاد دەكات. ئەگەر ڕۆژێك تۆ بكوژم ئەوا دەبێت خۆشم بكوژم، بەلاَم من تا بتوانم دەبێ كوشتنی خۆم دوا بكەم، بۆ ئەوەی هەست بە ئازاری دابڕانی تۆ بكەم كە بەرگەی ناگرم ! ئایا باوەڕ بەو شتە دەكەی كە هەرگیز باوەڕ ناكرێت: من ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تۆم زیاتر خۆشدەوێ، ئەمەش كارێكی مەحاڵە! ئایا دەتەوێ دوای ئەمە باوەڕ بەقەدەر ناكەم! بیرت بێتەوە: دوێنێ كاتێك لەسەر بەرزاییەكانی شیلانگ بێرگ بووین بەچرپەوە وتم: تەنها یەك وشە بڵێ ، خۆم هەڵدەدەمە خوارەوە" ئەگەر تۆ یەك وشەكەت دەدركاند ئەوا خۆم هەڵدەدایە خوارەوە. تۆ باوەڕ بەمە دەكەی، ئەی وا نییە؟

هاواری كرد و وتی:

– هەڵەشەیەكی دەبەنگانە.

– لەوانە من دەبەنگ بم یان وا نەبم. من دەزانم كاتێك لەگەڵ تۆ دەبم پێویستم بەوە هەیە ، قسە بكەم، قسە بكەم. هەر قسە بكەم، كاتێك لەگەڵ تۆ دەبم خۆشەویستی خۆم لەدەست دەدەم، ئەمەم بەلاوە گرنگ نابێت.

بەزارێكی زبر و بە نەغمەی سووكایەتی وتی:



–هیوای ئـەوە مـەخوازە مـن داوات لـێ بکـەم لـە لوتکەکـە خـۆت هەڵدەیتە خوارەوە؟ چونکە ئەمە هیچ سوودێکی نییە.

بە هەڵپەوە هاوارم کرد:

–نایابە ! ئـەم گوزارشـتـەت بـەکارهێنا مەبەسـتت سـووککردنی مـن بوو: (سوودی نییە). ئاشکرام کردی، دەڵێی (سـوودی نییـە)، بـەڵام چێژ هەردەم بەسوودە، ئەو دەسەڵاتە رەهایەی کـە سـنووری نییـە، جۆرێکــە لــە چــێژ، تەنانــەت ئەگــەر دەســەڵاتەکە بەســەر مێشوولەیەکیشەوە بێت. مرۆڤ بە سروشتی خۆی ستەمکارە، حەز لە ئەشکەنجەدان دەکات، تۆ زیاتر لە هەر شتێکی دیکە حەزت لەمەیە.

وەبــیرم دێتــەوە ئــەو بەنیگایــەکی تایبــەت ســەیری دەکــردم. بەتایبەتیش کاتێك هەمرو هەستە نامۆ و هەسـتە هـیچ و پووچـەکانم بە سیمامەوە دیـار بـوو، هـەتا ئێسـتا وەبیرمـە، گفتوگۆکـەمان بـەم شێوەیە بـوو کـە ئێسـتا لێـرەدا دەیگێڕمـەوە. چاوەکانم پـڕ بـوون لەخوێن، دەمم کەفی دەکرد، بەڵام سەبارەت بە چیرۆکی شـاخەکانی شیلانگ بێرگ، ئەوا سوێند بە شەرەفی خۆم دەخـۆم، تـا ئێسـتاش، ئەگـەر داوام لـێ بکـات، ئـەوا خـۆم هەڵـدەدەم، ئـەم کـارە دەکـەم تەنانەت ئەگـەر بـە گاڵتـەپێکردن یـان بەسـووکایەتی و تفکـردن داوا بکات.

وتی:



–نەخێر ، بۆچی ؟ من باوەڕت پێ دەکەم.

ئەمەی بە زمانێك گوت، کە تەنها خۆی دەزانێ بەکاری بهێنێ، بە زمانێك ڕقبوونەوە، مەکربازی، فیزی تێدایە، ئەمەش لەو ساتەدا وەك ئەوە بوو هانم بدات، بیکوژم، خۆی وا دەرخست ئەو کارە بکەم، تەنانەت درۆشم لەگەڵ نەکرد ئەو قسەیەم پێ گوت.

لەناکاو پرسی:

–ئایا تۆ ترسنۆك نیت؟

– نازانم. لەوانەیە وا بم، لە مێژە ئەم پرسیارەم لەخۆم نەکردووە.

– وا دابنێ من فەرمانت پێ دەکەم: ئەم پیاوە بکوژە...ئا تۆ دەیکوژی؟

–کێ؟

–نازانم.

–کابرای فەرەنسی؟

–پرسیارم لێ مەکە، وەڵامم بدەوە. ئەو کەسەت پێ بڵێم دەیکوژی؟ دەمەوێ بزانم تۆ ڕشت لەوەی تازە چرکەساتێك لەمەوبەر گوتت.

زۆر بە بایەخ و بێ ئۆقرە چاوەڕوانی وەڵامی من بوو، تەنانەت منیش تووشی سەرسوڕمان بووم. بەهەڵپە وتم:

–ئێستا دەرتخست چی لێرە روودەدا؟ تۆ لەمن دەترسی؟ من لێرە هەموو ئەو ئالۆزییانە دەبینم کە وەك گێژەنێك دروستتان کردووە، تۆ نزیکی لە پیاوێکی وێرانکەر و شێت، پەرۆشییەکانی خۆی بەو شەیتانە لەناو دەبات... خاتوو بلانش. دواتر کابرای فەرەنسی هەیە، دەسەلاتێکی شاراوەی بەسەر تۆوە هەیە، ئەوا تۆش ئەم پرسیارە دەکەی. بەلایەنی کەمەوە ئەم شتە بزانە، من شێت دەبم کارێکی توندوتیژی ئەنجام دەدەم جا نازانم ئەنجامەکەی چۆن دەبێت! ئەگەریش بەوە شەرمەفمەند نابی لەگەڵ راستگۆ بی؟ ئەوا پێویست ناکات لە بەرانبەر من شەرم بکەی.

– هەرگیز لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵت نادوێم. من پرسیارێکم لێ کردووی، چاوەڕوانی وەلامم.

بەرووی تەقینەوە و وتم:

–هەڵبەتە هەر کەسێکت گەرەك بێ، دەیکوژم. بەلام دەکرێت...
ئایا لەوانەیە شتێکی وەهام لێ داوا بکەیت؟

–مەزندە مەکە، بەلام من تۆ بۆ خۆم پاشکەوت دەکەم! من فەرمانی خۆم دەردەکەم، لەدوور دەمێنمەوە، ئایا دەتوانی بەرگەی ئەمە بگری؟ من پێموانییە.... تۆ کەسێکی وەها نییت. لەوانەیە بگەڕێیتەوە لام و بمکوژی، لەبەر ئەوەی من جورئەتی ئەوەم کردووە تۆ بۆ ئەنجامدانی تاوانێك بنێرم.

قسەکانی بۆ من وەك هەورە تریشقە بوون. بێگومان تا ئەو کاتە نیوەی قەسەکانی ئەوم بەگاڵتە وەردەگرت، بەڵام ئەمجارە زۆر رشت بوو، زۆر مکوڕ بوو. تووشی شۆکی کردم کاتێك بەمشێوەیە قسەی دەکرد، جەختیش لەسەر ئەوە کردەوە مافی بەسەر منەوە هەیە، ئیعترافی بەوە دەکرد ئەم دەسەڵاتی بەسەر منەوە هەیە، بە ڕاشکاوی وتی:" تۆ سەرگەردان دەبی، منیش لەدوور دەمێنمەوە".
ئەم جۆرە قسانە لە سوکایەتیکردن و ڕاشکاوی بەدەرە، تەنانەت لەهەموو مەبەستێکیش تێدەپەڕێ. دواتر چۆن مامەڵەم لەگەڵ دەکات کاتێك فرمانەکەی جێبەجێ دەکەم؟ ئەمە تێپەڕاندنی سنووری کۆیلایەتەییە. ئەم شێوازە من بۆ ئاستی ئەو بەرز دەکاتەوە. هەر چۆنێك بێت مشتومڕەکەی نێوانمان بە هیچ و پووچی بەڕێوە دەچوو، هەستم کرد دڵم دادەخورپێ.

لەناکاو، بە پێکەنین بەڕوومدا تەقییەوە، هەردووکمان لە بەرانبەر منداڵەکان لەسەر کورسییەك دانیشتبووین، منداڵەکانیش یارییان دەکرد، ڕێك لە بەرانبەر ئەو شوێنەی خەڵکەکە لە گالیسکەکانیان دادەبەزن و بۆ ناو گازینۆکە دەچن.

بە هەڵپە وتی:

- ئەم ژنە بارۆنە نقوڵایە دەبینی؟ ناوی فۆرمۆ هێلمە. ئەمە سێ ڕۆژ زیاترە لێرەیە. سەیری مێردەکەی بکە، ئەم پیاوە پرووسییە لاواز و شرە، کە گۆچانەکەی بەدەستەوەیە. دەزانی چۆن دوێنێ خۆیان



لەئێمە مەلاس دابوو، برۆ خۆتی بۆ دەربخە و شتێکی بە فەرەنسی پێ بڵێ.

–بۆچی؟

– سوێندت خوارد، خۆت لە بەرزایەیکان دەخیتە خوارەوە ئەگەر من فەرمانت پێ بکەم. ئەمڕۆش سوێند دەخۆی ئەگەر فرمانت پێ بکەم کەسێك دەکوژی، جا لەبری ئەو تاوان و کارەساتانە، دەمەوێ ئەمرۆ تۆزێك شۆخی بکەین و سەرگەرم بین، دەمەوێ ئەو پیاوە بارۆنە ببینم کە چۆن لێت دەدا.

– ئایا ئاڵەنگارم دەبیەوە؟ وا دەزانی ئەم کارە ناکەم؟

– بەڵێ.. دەی برۆ لای ژنەکە، دەمەوێ ئەو کارە بکەی.

–باشە. دەچم: ئەمە لاسارییەکی زۆر سەیرە. دەبێت ئەم بابەتە شتی نەخوازراو بۆ تۆ یان ژەنەراڵ دروست نەکات. سوێند دەخۆم من اەخۆم ناترسم ، بەڵکوو لەتۆ و ژەنەراڵ دەترسم، بیرۆکەیەکی زۆر سەیرە: دەچم سوکایەتی بە ئافرەتێك دەکەم!

بەرق و کینەوە وتی:

–وەك دەبینم تۆ تەنها کەسێکی زۆربڵێی. بەر لەئێستا چاوەکانت تەڕ ببوون، لەوانەیە ئەمە تەنها هی ئەوە بێت لەکاتی نانخواردن زۆرت شەراب خواردۆتەوە. من دەزانم ئەم داوایە چەپڵ و هیچ و پووچە، تەنانەت ژەنەراڵیش تورە دەبێ، بەلام من حەز دەکەم



هەندێك رابوێرم، هەموو بابەتەکە هەر ئەوەیە، نەوەك سوکایەتی کردن بە ئافرەتێك. بەرلەوەی کارەکە بکەی خۆت گێژ بکە.

هەڵسامەوە و ڕۆیشتم بێئەوەی وشەیەك بدرکێنم، دەبوو کارەکەم ئەنجام بدەم. ڕاستە ئەم کارێکی پڕوپووچە، بەلاّم نەمدەتوانیّ خۆم لەو کارە نەجات بدەم. وەبیرم کاتێك لە ژنە باڕۆنەکە نزیك دەبوومەوە، هەستم بە ئارەزووی ئەنجامدانی کارێکی دەبەنگانەوە ولاسارانە دەکرد. تەنانەت لە پەرۆشیم وەك سەرخۆشێك وابووم.





# بەشی شەشەم

ئەم ڕووداوە دوو ڕۆژ لەمەوبەر بوو، ڕۆژێکی دەبەنگانە بوو! ئای هاواری تێدا کرا، دەنگ و هەرای تێدا بوو، گۆتە گۆت! هۆکاری سەرەکی ئەم بینەوبەردە و هەرا و زەنایە من بووم! بابەتەکە گاڵتەجاری بوو، بەلایەنی کەمەوە من پێموابوو مایەی پێکەنین بوو. نازانم چی بەسەرمن هات: ئایا من لەحاڵەتی پەرۆشی و سەرمەستی بووم، یان من مرۆڤێکم عەقڵم لەدەست داوە، بۆیە لاساریی لەدوای لاساریی چاوەڕوانی زیندان دەکەم؟ هەندێك جار خەیاڵی ئەوە دەکەم من بەرەو شێتی دەچم، هەندێك جاری دیکەش وا هەست دەکەم سەردەمی منداڵییم تێنەپەڕاندووە، وەك ئەوەی هێشتا لە قوتابخانە بم، بەهۆی هاندانی منداڵانەوە هەندێك کاری هەرزەکارانە بکەم.

هەڵەکە هەڵەی پاولینا بوو، هەموو خەتاکە هی ئەو بوو، لەوانەیە ئەو لەوێ نەبووایە من ئەو کارەم نەکربا. بەهەرحاڵ کێ دەزانێ؟ لەوانەیە من لەبەر نائومێدی ئەو کارەم کردبێ



(سەرەڕای ئەوەی لێکدانەوەی بابەتەکە بەمشێوەیە دەبەنگییە) تێ ناگەم.، نازانم ئەو چ خەسڵەتێکی هەیە، ئەو جوانە، یان بەلایەنی کەمەوە من پێم وایە ئەو جوانە، تاکە کەسێکیش نیم شێتی ئەو بم. پاولینا بالآیەکی زۆر بەرزی هەیە، ئادگاری جوان، زۆر لاواز، هێندە لاوازە وا خەیاڵ دەکەم مرۆڤ دەتوانێ ئەو وەك ملوانەکەیەك بچەمێنێتەوە. شوێن پێیەکانی باریك... ئازاربەخش، بەڵێ زۆر ئازاربەخش.. ئەم وشەیە بۆ وەسفی ئەو دەبێت. قژی ڕەنگدانەوەی سوور باوێك هەیە، چاوەکانی بەڕاستی وەك پشیلەیە... لەوەش زیاتر دەتوانێ لوتبەرزی و فیز لەچاوەکانی دەربخات! چوار مانگێك لەمەوبەر کە تازە هاتبوومە خزمەتیان، ئێوارەیەکیان، لەهۆڵەکە گفتوگۆیەکی دووروودرێژ لەنێوان ئەو دی گریۆ ، بەهەڵچوون و گەرموگوڕی قسەیان دەکرد، بەنیگایەکی توند سەیری کابرای فەڕەنسی دەکرد. کاتێك بۆ ژووری خەوتنەکەم سەرکەوتنم هەستم کرد زلەیەکی لێ داوە، ئەو تازە لێی دابوو کەچی لەبەردەم وەستاوە، ئەویش کەوتبووە عەشقی پاولیناوە.

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان.

لە لاڕێیەکی بچووك وەستام کە دەچووە سەر ڕێگە سەرەکییەکە، هەر کەس بارۆن و خێزانەکەی دەرکەوتن، منیش لە ناوەڕاست وەستابووم، نزیکەی پێنج هەنگاوێك خۆم لەوان



نزیك كردەوە و سلاّوم لیّیان كرد. ئیّستایش وەبیرمە خاتوونی بارۆن كراسیّكی ئاوریشمی بەڵەكی پۆشی بوو، بەشیّوەیەك فراوان بوو سەرت سوڕدەما، بەچەندان نەخش چنرابوو. ئەو ژنیّكی زۆر كورتەبالاّ و قەڵەو بوو، مووەكانی چەناگەی تا روومەتی رۆیشتبوو، دەموچاویّكی سوور، دوو چاوی بچووك دەردەكەوت، هیّواش و لەسەرخۆ دەڕۆیشت. كەچی بارۆن پیاویّكی دریّژ و وشك، دەموچاوی چرچ و لۆچی هەبوو، هەروەك نەریتی ئەڵمانەكان چاویلەكەی لەچاو بوو، تەمەنی نزیكەی ٤٥ ساڵیّك دەبوو، قاچەكانی هیّندە دریّژ بوو، وەك ئەوەی بوو بگاتە سنگی، ئەمەش نیشانیەكی خانەدانی بوو، وەك تاوس لەخۆبایی بوو، شیّوەی هەندیّك لە بەرخ دەچوو. بەچەند چركەیەك هەموو ئەو تیّبینیانەم كرد.

هیّشتا تیّبینی سلاّوەكەی منیان نەكردبوو، من كلاّوەكەم بە دەستەوە گرت، بارۆن تەنها كەمیّك نیّوچەوانی گرژ كرد، خاتوونی بارۆن هەنگاویّك لەمن هاتە پیّشەوە، بە سەنگینی دەڕۆیشت، بەدەنگیّكی تەواو بیستراو، بەبڕگەی زۆر ڕەوان وتم:

-خاتوونی بارۆن، بۆ من مایەی شەرەفە، كۆیلەی تۆ بم

ئەمەم وت و بۆ شكۆمەندی ئەو چەماوەتەوە، دواتر كلاّوەكەم خستەوە سەرم و بەنزیك بارۆن تیّپەڕیم، بە زەردەخەنەیەكی ناسكەوە سەیرم كرد. پاولینا فرمانی پیّكردم لەبەرانبەریان

دەربکەوم، کاری هەرزەیی و کرنۆش بردن لەلایەن خۆمەوە بوو، تەنها خوا دەزانێ چ شتێك پاڵنەرم بوو، وا خەیاڵم دەکرد لەسەر لووتکەی شاخێکەوە دەکەومە خوارەوە.

–هێی!....

بەمشێوەیە بارۆن هاواری کرد، یان ڕاستتر بڵێ هاوارەکەی وەك سەگوەڕین بوو، بەسەرسامی و تووڕەیی ئاوڕی لەمن دایەوە. بەحەپەساوی و بەرێزەوە، ئاوڕم دایەوە، چاوەڕوان بووم بزانم چی ڕوودەدا، بەردەوام زەردەخەنەم بۆ دەکرد، دیار بوو پەشۆکاو بوو، تا ئەوپەڕی نێوچەوانی گرژ بوو، سیمای بەرە بەرە تۆڕەتر دەردەکەوت، خاتوونی بارۆنیش ئاوری دایەوە، بەسەرسامی و ڕقەوە سەیری کردم. ئەو خەڵکانەی تێدەپەڕین سەیریان دەکرین، تەنانەت هەندێکیان وەستابووم چاودێری ڕووداوەکانیان دەکرد.

–هێی!...

جارێکی دیکە هاواری کرد، بەڵام ئەم جارە بەدەنگێکی خنکاو و تورەتر.

–یا ڤوول

من ئەو وشەیەی سەرەوەم درکاند، وشەکەم درێژ کردەوە، سەیری چاوەکانی بارۆنم دەکرد.

–ئایا تۆ شێتی..؟

ئەم قسەیەی کرد و دارعەساکەی رادەوەشاند، ئەگەر دەتبینی هەستت دەکرد دەلەرزێ. لەوانەیە پۆشاکەکەم ترسی خستبێتە دڵییەوە، زۆر کەشخە بووم، رێکپۆش، وەك ئەوەی پیاوێك بم لە بەرزترین چین.

–یا ڤووول....

هێندەی هێزم تێدا بوو، هاوارم کرد و ئەم وشەیەم دووبارە کردەوە، پیتی (واو)م درێژ کردەوە، وەك دانیشتووانی بەرلین، کاتێك وشەی (یاڤول) بەکاردەهێنن بە پێی مەبەست درێژ وکورتی دەکەنەوە، ئەوان بەم جیاوازیانە گوزارشت لە بیرکردنەوە و سۆزی خۆیان دەکەن.

بارۆن و خاتوونەکەی لەناکاو روویان وەرگێرا، وەك ئەوەی رابکەن دوورکەوتنەوە، زۆر ترسان، ئەو خەڵکەی ئاپۆرەیان کردبوو، هەندێکیان قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، هەندێکی دیکەش بەسەرسامی سەیری منیان دەکرد، بەهەرحاڵ، بەوردی ئەو دیمەنانەی دواتر بیرنایەتەوە.

بە هەنگاوی ئاسایی بەرەو پاولینا ئەلکسەندەرۆڤنا گەرامەوە، بەڵام کاتێك سەد مەترێك نزیك کەوتمەوە، ئەو لەسەر کورسیەکە هەڵسایەوە و لەگەڵ منداڵەکانی بەرەو هوتێلەکە رۆیشت. لە

قاندرمه دەروازەی هۆتێلەکە پێی گەیشتم، لەدواوەی دەڕۆیشت وتم:

-ها ئەو کارە پڕوپووچەشم جێبەجیٚ کرد.

بەمشێوەیە وەلاٚمی دامەوە و وتی:

-ئێستا کاری خۆت مەیسەر بکە.

لە قاندرمەکە سەرکەوت، بێئەوەی بە نیگایەك سەیرم بکات.

تەواوی ئێوارەکە لە باخچەکە هاتووچۆم دەکرد، دواتر لەباخچەکە چوومە دەرەوە، بە پیاسە بەردەوام بووم، تا گەیشتمە یەکێك لەگوندەکان، لەلای چەند جووتیارێك هێلکە خوارد و شەڕابم خواردەوە، ئەم چیرۆکە شیعر ئاساییە، تالێڕێك و نیوی تێچوو. تا سەعات یانزەی شەو نەگەڕامەوە، هەرکە گەڕامەوە ژەنەڕاڵ بانگی کردم.

هاوڕێیانم لە هۆتێلەکە دوو شوقەیان گرتووە، کە لە چوار ژوور پێکهاتووە. یەکەمیان لەگەڵ هۆڵێکە، ژوورێکی فراوانە بە پیانۆیەك رازاوەتەوە، دەچێتەوە سەر ژوورێکی دیکە کە نووسینگەکەی ژەنەڕاڵە. لەویٚ ژەنەڕاڵ چاوەڕوانی دەکردم، لەناوەڕاستی ژوورەکە وەستابوو، بارودۆخێکی پڕ شکۆی دەنواند، دی گریۆش لەولاتر لەسەر قەنەفەکە پاڵکەوتبوو.



ژەنەڕاڵ دەستی بەقسەکانی کرد و وتی:

-ئایا جەنابت بەڕێز ڕێگەمان پێ دەدەی لێت بپرسم چیت کردووە؟

وەڵامم دایەوە:

-ژەنەڕاڵی بەڕێز دەمەوێ یەکسەر بچیە ناو باسەکەوە، لەوانەیە بتەوێ لەبارەی دیدارێکت لەگەڵ کەسێکی ئەڵمانی قسەم لەگەڵ بکەی، کە ماوەیەك بەر لە ئێستا لێرە بوو.

- ئەڵمانییەك؟ کوڕە ئەم ئەڵمانییە بارۆن فۆرمەر هێڵمە، کەسێکی گەورەیە، تۆ دڵڕەقیت بەرانبەر خۆی و ژنەکەی کردووە.

-هەرگیز...

- بەڕێز تۆ ئەوانت تۆقاندووە.

-هەرگیز ئەوانم نەترساندووە. کاتێك لە بەرلین بووم، لە هەر گفتوگۆییەك گوێبیستی وشەی (یافول) دەبووم، خەڵکەکە لەدوای هەر وشەیەك دووبارەیان دەکردەوە، تەنانەت بەشێوەیەکی بێزارکەر درێژیان دەکردەوە. کاتێك لەو ڕێگەیەی بەلای دارەکان تێدەپەڕی، ڕێکەوتی بارۆنم کرد، ئەو وشەیە لەناکاو هاتەوە یادم (نازانم بۆ؟) تورەی کردم... جیا لەوەش سێ جار خاتوونی بارۆن پێشتر بەمن گەیشتووە، وەك کرمی سەر زەوی بەرەو روو دەهات، دەتوانی پانی بکەمەوە، بەڵام دەبێت باوەڕ بەمن بکەی



که کەسێکی خاوەن کەرامەتم، منیش بەو پەڕی ئەدەب نواندنـەوە (دڵنیـات دەکەمـەوە بەوپـەڕی ئەدەبـەوە) کڵاوەکـەم هێنایـە خـوارەوە وتم" خاتوونەکـەم حەزدەکـەم کۆیلـەت بم". ئەوکاتـە بارۆن ئاوڕی دایەوە وهـاواری کـرد: هێـی، منـیش ئـارەزووم کـرد هاوار بکەم بڵێم (یاڤول) دووجـار ئەمـەم وت: جارێـك بـە ئاسـایی، جارێکی دیکە تا توانام هەبوو وشـەکەم درێـژکردەوە. ڕووداوەکـە هەر ئەوەندە بوو.

ددان بەوە دەنێم هۆنینەوەی چیرۆکەکە بـەم شـێوە هـەرزەیی و لاسارییە، زۆر دڵخۆشی دەکردم. حەزیشم دەکرد زیاتر چیرۆکەکە برازێنمـەوە، هەرچـەندیش لێـی وردەبوومـەوە زیـاتر چـێژی پـێ دەبەخیشیم.

ژەنەراڵ هاواری کرد:

—وەك دەردەکەوێ ، گاڵتەم پێ دەکەی.

ئـاوڕی لـە مـارکیز دایـەوە، بـە زمـانی فەڕەنسـی ئـەوەی بـۆ ڕوونکـردەوە، گوایـە مـن هـەوڵم داوە کێشـەیەك دروسـت بکـەم، ئەویش بە زەردەخەنەیەکی چەپەڵ، شانی هەڵتەکاند.

من بە هەڵپەوە وتم:

—بـاوەڕ بەمـە مەکـە... بابەتەکـە بـەم شـێوەیە نییـە. ڕاسـتە هەڵسوکەوتەکەم بێزارکەر بوو... مـن ئـیعتراف بـە ڕاشـکاوی ددان



بـەوە دەنـێم. دەتوانرێـت هەڵسـوکەوتەکەم بـە هیچـوپووچ و بـێ ئابڕۆیانە وەسف بکرێت. زیاتر لەوەش ئەی ژەنەڕاڵ بزانە مـن زۆر لە هەڵسوکەوتەکەم پەشیمانم، بەڵام بارودۆخێکی دیکە هەیـە، لـە پەشـیمان بوونـەوە پاشـگەزم دەکاتـەوە. بـەم دواییانـە، لەوانیـە نزیکەی پانزە ڕۆژێك یان سـێ هەفتـە دەبێـت، هەسـت دەکـەم لـە بارودۆخێکی تەندروستی دژوار دام: من نەخۆشم، تـوڕە دەبم، زوو هەڵدەچم، ترس و دڵەڕواکێم زۆرە، تەنانەت لە هەندێك بارودۆخـدا تەواو ناتوانم بەسەر خۆم و کردەوەکـانم زاڵ بم، ئەمـە ڕاسـتە. بۆ نموونــە چــەندان جـار ئـارەزووم کـردووە، لــەناکاو مــەرکیز دی گرێـۆ.... نـا، نـاتوانم قسـەکەم تـەواو بکـەم، نـەوەك مـیر مـارکیز هەسـت بەسـوکایەتی بکـات و تـوڕە بێـت.... ئـەوەی گرنگ ئـەم هەڵسـوکەوتانە نیشـانەی نەخۆشـییەکەن. نـازانم خـاتوونی بـارۆن ئەم بارودۆخە ڕەچاو دەکات، کاتێك داوای لێبـوردنی لـێ دەکـەم( نیـازم وایـە داوای لێبـوردنی لـێ بکـەم). مـن وا هەسـت دەکـەم، خاتوونی بارۆن ئەم پاساو قبوڵ ناکات، بـە تایبـەتی دەزانـێ بـەم دواییانــە، خــەڵك ئــەم پاســاوە لــە بــواری دادەوەری بەخراپــە بەکاردەهێنن، پارێزەرەکان، پاساو بۆ بریکارەکانیان دەهێننەوە، گوایە ئاگـاداری کردەوەکـانی خۆیـان نـەبوون، ئەمـەیش جۆرێکـە لەنەخۆشـی، بـۆ نموونـە پارێزەرێـك دەڵـێ" لێـی داوە، ڕاسـتە، بەڵام ئێستا هیچ شـتێکی بـیر ناکەوێتـەوە". بـەرێز ژەنـەڕاڵ، تـۆ وێنای ئەوە بکەم، تەنانەت زانستی پزیشکی پاڵپشـتیان دەکـات..

ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن، نەخۆشییەك هەیە، یان شێتیەکی کاتییە، وا دەکات مرۆڤ لە چرکە ساتێکدا شتی لەبیر بچێتەوە، ئاخۆ بارۆن و خێزانەکەی کە لەنەوەی کۆنن، سەرەڕای ئەوەی خانەدانی پرۆسیان لە لادێیەکان دەژین، ئەم لێکدانەوەی من قبوول دەکەن؟ ئایا بۆچوونی تۆ چییە؟

ژەنەڕاڵ لەناکاو توڕەییەکەی قوتدایەوە و وتی:

– بەڕێز بەسە ئیتر !.. من هەوڵ دەدەم بۆ هەتا هەتاییە خۆم لەکارە هەرەزەکارییەکانی تۆ نەجات بدەم. ناتوانی داوای لێبوردن لە بارۆن و خێزانەکەی بکەی، هەر پێوەندییەکی تۆ بەوان، توڕەیان دەکات، تەنانەت ئەگەر داوای لێبوردنیش بێت، بۆ ئەوان ریسوایی لەدوای ریسوایی دەبێت. کاتێك بارۆن زانی تۆ یەکێکی لەماڵەکەی ئێمە، لە گازینۆ قسەی لەگەڵ کردم، داوای کرد دڵی رازی بکەم، ئایا بەڕێز دەزانی داوای چیکرد؟ ناچاری کردم داوای لێبوردن بکەم، بەڵێنی شەرەفیشی پێ بدەم، کە لەمڕۆ تۆ یەکێك نییە لەماڵەکەی ئێمە.

– ببوورە، ببوورە ئەی ژەنەڕاڵ ئەو داوای کرد من چیتر کەسێك نەبم لەماڵەکەی ئێوە، وەك خۆت دەڵێی؟

– نا ... من هەستم کرد ناچارم بۆ ئەوەی کارەکە بەمشێوەیە چاك بکەمەوە، ئاساییە بارۆنیش ئاسوودە بوو، رازی بوو. ئەوەی



ماوەتەوە من چوار فردیریك و سێ فلۆرینت پێ بدەم، ئەمەش پارە و حیسابی تۆ، دەتوانیّ رەتی بکەیتەوە، خوات لەگەڵ.

ئێمە لەمەودا بێگانەین، کەسمان ئەویتر ناناسیّ، ئێستایش بانگی گارسۆنەکە دەکەم، پێی دەڵێم لە بەیانییەوە، خەرجی تۆ لەو هوتێلە لە ئەستۆی من نییە. خوات لەگەڵ .

پارەکەی راگرت، بە قەڵەم رەساسێك حیسابەکەی لە کاغەزێك نووسی، دواتر من سلاوێکم لە ژەنەراڵ کرد و بەزمانێکی زۆر رشت وتم:

–ئەی ژەنەراڵ، بابەتەکە نابێت بەمشێوەیە کۆتایی بێت. مایەی داخوپەژارەیە بارۆن هەندێك تێبینی بێزارکەری پێداوی، بەلاّم گوێم بۆ بگرە: هەڵەکە هی تۆ بوو، بۆچی لە جیاتی من بەرپرسیارێتی منت هەڵگرتووە؟ ئەمە مانای چییە کە دەڵێی" من یەکێکم لە ماڵەکەی ئێوە؟" من تەنها مامۆستای منداڵەکانتم، نە کوڕی تۆم، نە تۆیش راسپاردەی منی. نەدەبوو لێپرسینەوە لەکارەکانی من بکەی، من کەسێتی یاسایی خۆم هەیە، تەمەنم بیست و پێنج ساڵە، زانکۆم تەواو کردووە، من خانەدانم، هیچ پێوەندی خزمایەتیم لەگەڵ تۆ نییە، تەواو لەلای تۆ بێگانەم. متمانەت هەبێت بێ رادە رێز لەتۆ دەگرم ،ئەمەش رێگریم لێ دەکات، داوات لێ بکەم ئەوەی کردووتە چاکی بکەیتەوە، کە بەرپرسیارێتی منت خسووەتە ئەستۆی خۆت.



ژەنەڕاڵ بەشێوەیەك پەشۆکا بوو، باڵەکانی دەکردەوە، دواتر لەناکاو ئاوڕی لە فەڕەنسییەکە دایەوە، بەکورتی پێی گوت، گوایە من خەریکم داوای شەڕەشمشێری لێ دەکەم، فەڕەنسییەکە دایە قاقای پێکەنین.

دەستم بەقسەکانم کردەوە، تەواو بەهێمنی، بێئەوەی ڕێگە بەخۆم بدەم قاقاکانی کابرای فەڕەنسی تەنگەتاوم بکات، وتم:

–بەمشێوەیە حسێبی من لەگەڵ باڕۆن یەکلانەبۆتەوە، مادامەکی بەوە رازی بوویت، ئەمڕۆ گوێ لە گلەییەکانی باڕۆن بگرێت، بە تەواوی بایەخی پێ بدەیت، ئەوا تۆش بە مانایەك لە ماناکان هاتوویتە ناو مەسەلەکەوە، بۆیە ژەنەڕاڵی بەڕێز من بەیانی نەوەك دواتر، بەناوی خۆم داوای ڕوونکردنەوەی پێویست لە ژەنەڕاڵ دەکەم. هەرچەندە ئەو کارەکەی لەگەڵ من بووە، بۆچی من فەرامۆش دەکات و پەنا بۆ کەسی سێیەم دەبات، وەك ئەوەیە من نەتوانم بەرپرسیارێتی کارەکانی خۆم هەڵبگرم، یان من شایەنی ئەوە نییم.

ئەوەی پێشبینیم دەکرد، ڕوویدا، ئەمە ژەنەڕاڵە تۆقیوە کاتێك گوێبیستی ئەم قسە پڕوپووچانەی من بوو، هاواری کرد:

– دەبینم دەتەوێ مەسەلە شوومەکە بەرەو دوورتر ببەی! ئەوا تۆ من دەخەیتە بارودۆخێکی پڕ شەرمەزارییەوە !... بەلاّم ئاگادارت دەکەمەوە بەڕێز... ئاگادار بە ، ئاگادار بە.. سوێند



بەشەڕەفی خۆم... هەروەها تێبینی ئەوە بکە دەستەڵات لەم وڵاتە هەیە... من ، من .... بە کورتیەکەی، بە ڕەچاوکردنی پێگەی خۆم... بەڕەچاوکردنی پێگەی بارۆن.. بەکورتییەکەی پۆلیس دەستگیرت دەکات، شاربەدەرت دەکات، بۆئەوەی ڕێگرییت لێ بکات تاوان ئەنجام بدەیت... ئەمەت لەزەین بێت... ئەوا ئاگادارم کردیتەوە.

ژەنەڕاڵ لەترسان و لە تووڕەیی خەریك بوو دەخنکا. منیش بە هێمنییەکی سەرەنجڕاکێش وتم:

–بەڕێز ژەنەڕاڵ، ناتوانرێت کەس لەبەر تاوانێك دەستگیر بکرێت، هێشتا تاوانەکەی ئەنجام نەداوە. من هێشتا قسەم لەگەڵ بارۆن نەکردووە، تۆ نازانی من لە چ ڕووییەکەوە بۆ بابەتەکە دەچم، لەچ ڕوویەکەوە بابەتەکە چارەسەر دەکەم. تەنها مەبەستم ئەوەیە چارەسەری ئەو سوکایەتیە گەورەیە بکەم کە تووشم بووە، واتە کەسێك هەیە مافی ئەوەی بەخۆی داوە فشار لەسەر ویست و ئازادی من دابنێ. تۆ بۆچی نیگەرانی و ترساوی، ئەمە پێویست بە ترس و نیگەرانی ناکات.

هەر زوو بارودۆخی ژەنەڕاڵ لەناکاو گۆڕا، زمانێکی پارانەوەی بەکارهێنا، تەنانەت دەستی گرتم و وتی:

–بۆ خاتری خودا، بۆ خاتری خودا، ئەی ئەلکسی ئیڤانۆڤیچ واز لەو پڕۆژە پووچەڵ و مەحاڵە بهێنە، بزانە چ ئەنجامێکی دەبێت !



سەریەشەی نویێ. تێبینی ئەوە بکە من دەبێت بە رووالەتێکی تایبەت دەربکەوم، بە تایبەتی ئێستا، لەوانەیە تۆ هەموو بارودۆخەکە بزانی چۆنە، هەر کە لێرە رۆیشتین من ئامادەم بتگەرێنمەوە، بەلاّم ئەوەی ئێستا تەنها بابەتەکە پێوەندی بە رووالەتەوە هەیە، بەکورتییەکەی... تۆ دەزانی پالّنەرەکان چین وام لیێ دەکەن... ئەلکسی ئۆڤانۆڤیچ.. ئەلّکسی ئیڤانۆڤیچ.. ( بەنائومێدی هاواری دەکرد).

منیش جارێکی دیکە تکام لیێ کرد، کە پێویست بە نیگەرانی ناکات، بەلّێنی ئەوەم پێدا کارەکان زۆر بە چاکی ئەنجام دەدرێن، کشامەوە و بەرەو ژوورەکەم سەرکەوتم، هەندێك جار رووسەکان کاتێك لە دەرەوەی ولاّت دەبن، زێدەرۆیی لە ترسنۆکی خۆیان دەکەن، لەوە دەترسن چییان لەبارەوە دەگوترێت، چۆن خەلّك تێیان دەروانیێ، ئەوان لەوە دەترسن جوان هەلّسوکەوت نەکەن، بەتایبەتی ئەوانەی دەیانەویێ پێگەیەکی بەرزیان هەبێت. ئەوان زۆر سلّ لەوە دەکەنەوە، بۆ ئەوەی خاتریان بگێریت، تەنانەت ئەگەر بەشێوەی کۆیلایەتیش بێت. جا ئەمە لە هوتێلێ بێت یان لە کۆبوونەوەکان، یان لە سەفەرەکان بێت. .. ژەنەرالێ ئەمەی لەدەم دەرچوو گوایە بارودۆخێکی تایبەت هەیە" وا دەکات بە رووالەتی تایبەت دەربکەویێ".هەر لەبەر ئەمەش لەناکاو هەستی بەترس کردووە، زمانی گفتوگۆشی لەگەلێ من گۆراوە. من تێبینی



ئـەوەم کـرد و تێگەیشـتم، ئـەو لـەوە ترسـنۆکترە پـەنا بـۆ دەسـەڵاتەکان بـەرێت، بۆیـە دەبێـت بـە وریـایی وهۆشـیارییەوە هەڵسوکەوت بکەم.

من هیچ ئارەزوویەکم بۆ تورەکردنی ژەنەراڵ نەبوو. پاولینا ئـەو کەسـەیە، ئێسـتا ئـارەزوو دەکـەم بیخنکێـنم. ئـەو زۆر دڵڕەقانـە مامەڵەی لەگەڵ کردم. ئەو هۆکار بوو ئەم هەڵسـوکەوتە نەگریسـە ئـەنجام بـدەم، ئێسـتاش ئـارەزوو دەکـەم ئـەو داوام لـێ بکـات بوەسـتم. ئـەو کـارە لاسـارییەی ئـەنجامم داوە، لەوانەیـە نـاوی پاولیناش لەکەدار بکات. لەگەڵئەوەشدا هەست و ئـارەزووی نـوێ لە ناخمدا چەکەرەی کـرد: بـۆ نموونـە لەبەرئـەوەی لـە بەرانبـەر پاولینـا لەویسـتی خـۆم دەرخسـت، مانـای ئەوەیـە مـن چـیتر لەبەرانبەر کەسانی دیکە وەك مریشکی تەڕ نیـیم، تەنانـەت مـیری ناتوانێ بە عەساکەی هەڕەشـەم لـێ بکـات. مـن دەمویسـت گاڵتـە بەهەموویان بکەم، بەسەرفرازی لەو جەنگە سـەربکەوم، دەبیـنن، هیچ شتێك من ناترسێنێ ! وا دابنێ پاولینا بـانگم ناکـات، بـەڵام بەهەر حاڵ دەردەکەوێ من مریشکێك نییم کەوتبمە ئاواوە!

ئێسـتا هـەواڵێکی سـەرنجڕاکێش هەیـە: هـەر ئێسـتا کاتێـك بـە قاندرمـەکان سـەرکەوتم، خزمـەتکاری منداڵـەکانم بینـی ئـەو وتـی مـاری ڤیلیۆڤینـا سـەفەری کـردووە، بـۆلای کچـە پوورەکـەی لـە کارلسـیاد، بـە شـەمەندەفەری ئێـوارە ڕۆیشـتووە. ئەمـە مانـای



چییە؟ خزمەتکارەکە وتی ماری لەمێژە نیازی سەفەرکردنی هەبووە، ئەی بۆچی کەسێك بەمەی نەزانیوە؟ بەهەرحاڵ، من تاکە کەسم لە بابەتەکە بێ ئاگام، خزمەتکارەکە وتی دوێنێ ماری و ژەنەراڵ مشتومڕێکی توندیان هەبووە، تێگەیشتم پێوەندی بەو هەیە.... خاتوو بلانش. بەڵێ دەبێت شتێکی یەکلاکەرەوە و گرنگ رووبدات.





## بەشی حەوتەم

ئـەم بەیانییـە، کـارگوزاری هوتێلەکـەم بـانگ کـرد، داوام لێکـرد حیسـابەکەی مـن جیـا بکاتـەوە. کرێـی ژوورەکـەم گـران نـەبوو، تـا لەترسان بەیەکجاریی بەجێی بهێڵم. شانزە فریدریکم هەبوو... لێرەو لـەوێ سـامانێك چـاوەڕوانم دەکـات ! شـتێکی سـەیرە: هێشـتا نەمبردووەتەوە، کەچی وەها هەڵسوکەوت دەکەم، وا هەست دەکـەم پیاوێکی دەوڵەمەندم، جگـە لەمـە لـەتوانام نـەبوو بـەجۆرێکی دیکـە خۆم وێنا بکەم.

هەرچـەندە بەیانییـەکی زوو بـوو، کەچـی بـەنیاز بـو هـەر ئێسـتا سەردانی مستەر ئاستلی بکەم، کە لە هوتێلی ئینگلترا بوو، نزیـك لـە هۆتێلەکـەی ئێمـە بـوو. لـەناکاو بینـیم دی جرێـۆ هاتـە ژوورەکـەی منەوە. ئەمە پێشتر هەرگیز رووی نـەداوە، زیـاتر لـەوەش پێوەنـدی من بەم بەڕێزە بەمدواییانـە زۆر گـرژ بـووە، تەنانـەت وای لێهـاتووە، سووکایەتی و ڕقەکانی بۆ من ناشـارێتەوە، تەنانـەت زۆر بـە ئاشـکرا باسی دەکات. لەلایەن خۆمەوە کۆمەڵێك هۆکار هەبوو وایکردبوو ئەو



پیاوەم خۆشنەویٚ، تەنانەت زۆر ڕقم لێی بوو، بۆیە ئێستا بەهاتنی سەرسام بووم، زوو زانیم شتێکی تایبەت و نائاسایی ڕوودەدات.

لەگەڵم زۆر ڕووخۆش بوو، دەستی کرد بەوەی بەژوورەکەم هەڵ بدات و بەچاکە وەسفی بکات، کاتێك بینی من کڵاوەکەم بەدەستەوەیە، سەرسام بوو لەوەی بەم کاتەی سپێدە دەچمە پیاسە. منیش وتم بۆ هەندێك کار دەچمە لای مستەر ئاستلی، ماوەیەك داما و خەمێکی لەسیمای خۆی دەرخست.

دی گریۆ وەك تەواوی فەرەنسیەکان، مرۆڤێکی نەرمونیان و خۆشن مەشرەب بوو ئەگەر پێویستی بکردایە، یان بەرژوەندییەکی هەبووایە، بەڵام هەر کاتێك پێویست نەبووایە ئەوا زۆر بێزارکەر دەبوو کە پیاو بەرگەیان ناگریٚ. زۆر دەگمەنە پیاوە فەرەنسییەکە لە یەکەم هەڵسوکەوتی، نەرمونیان ڕەفتار بنوێنیٚ، ئەو کاتێك لەسەرخۆ و نەرمونیان لە چوارچێوەی سیستەمێکی فەرمی بێت، بە حیسابێکی ورد هەڵسوکەوت بکات. ئەگەرهاتوو وا پێویست بوو لە ڕێسای باو دەربچێت، بەدوای ئارەزووی خۆی بچیٚ، ئەوا زۆر هەڵسوکەوتی ڕیزپەر دەنوێنیٚ، بەڵام ئەگەر ڕێگە بەناخی خۆی بدات، وەك سروشتی خۆی دەربکەویٚ، ئەوا کەسێکی ڕۆتینی، بۆرژوازی، بێمانا و بێتامە، تەنانەت لەسەر ڕووی زەوی کەسێك نییە وەك ئەوان بێزارکەر بێت. مەگەر کەسانی ساویلکە، بەتایبەتی کچانی ڕووس، شەیدای فەرەنسییەکان دەبن، ئەگینا کەسی عاقڵ،



زوو تێبینی دەکات و ڕقی لەو ڕۆتیناتە دەبێتەوە کە فەڕەنسییەکان لە قسەکردن و هەڵسوکەوت لە هۆڵەکان دەینوێنن.

کابرای فەڕەنسی دەستی کرد بە جوڵە، بەڵام بە ئەدەب و بەڕەوانی قسەی دەکرد:

-من ئەمڕۆ بۆ کارێك هاتووم. ئەوەت لێ ناشارمەوە لەلای ژەنەراڵەوە وەك نێردراوێك و ناوبژیوانێك هاتووم. من دوێنێ لەو گفتوگۆیە نەگەیشتم کە لەنێوان تۆ و ژەنەراڵ ئەنجام درا، من زۆر لە زمانی رووسی بەدحاڵییم، بەڵام دواتر ژەنەراڵ وردەکارییەکەی بۆ باسکردم، ئیعتراف بەوە دەکەم....

قسەکانی ئەوم بڕی:

-گوێ بگرە بەڕێز دی گریۆ.... ئەوەتا تۆیش لە ناو بابەتەکە رۆڵی ناوبژیوانی دەگێڕی..من تەنها مامۆستایەکەم، ڕۆژێك لە ڕۆژانە بەوە شەڕەفمەند نەبووم بە بوونی دۆستایەتییەك لەگەڵ ئەمماڵە. تەنانەت شەرەفی پێوەندییەکی تایبەتم لەگەڵ ئەوان نییە، ئەمانە بارودۆخێکە فەرامۆشی دەکەم، بەڵام ئێستا تۆ پێم بڵێ: ئایا تۆ بویتە ئەندامێك لەو خێزانە؟ چوونکە من دەبینم تۆ بایەخ بەهەموو بابەتەکان دەدەی، لە هەموو بابەتەکان تۆ ناوبژیوانی ...

ئەم پرسیارە نیگەرانی کرد، پرسیارەکە زۆر ڕوونە، پیاوەکەش نایەوێ نهێنییەکانی ئاشکرا بێت، بەزمانێکی زبر و وشك وتی:



-لەلایەکەوە پێوەندی کارکردنم لەگەڵ ژەنەڕاڵ هەیە، لەلایەکی دیکەوە پێوەندی تایبەت. ژەنەڕاڵ منی ناردووەتە لای تۆ تا تکات لێ بکەم لەو نیازەی دوێنێت پاشگەز بیتەوە. بێگومان ئەو خەیاڵی بۆ دەکەی نایابە، بەڵام ژەنەڕاڵ تکای کردووە، سەرنجت بۆ ئەوە ڕابکشێم ئەنجامەکان بە پێی خەیاڵی تۆ نابێت... زیاتریش لەمە بارۆن پێشوازیت لێ ناکات، هەموو پاساوێکی بەدەستە تا خۆی لە بێزارییەکانی تۆ بەدوور بگرێت، تۆیش ددان بەمە بنێ، ئەم دەمارگیرییە لە پای چی؟ ژەنەڕاڵ بەڵێنی داوە، ماوەیەکی دیکە تۆ بگەڕێنێتەوە، سەرەڕای ئەمەش تا ئەوکاتە مووچەکەت دەپارێزێ، ئەی پێت وانییە ئەمە پێشنیازێکی بەسوود و پڕ قازانج بێت؟

من زۆر بەهێمنی پێم وت ئەو کەمێك بەهەڵە چووە، بارۆن من دەرناکات، بەڵکوو گوێ لەقسەکانم دەگرێ. تکام لێ کرد پێم بڵێ بەدیارکراوی پێم بڵێ بۆئەوە هاتووە تا بزانێ من بەدروستی چی دەکەم!

وتی:

-کاتێك ژەنەڕاڵ هێندە بایەخ بەو بابەتە دەدات، ئەوا خۆشحاڵیش دەبێ، کاتێك دەزانێ من چی دەکەم، ئەمە بابەتێکی ئاساییە.

من دەستم کرد بەوەی بابەتەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە، ئەویش گوێی گرتبوو، لەسەر کورسیەکە دانیشتبوو، سەر کەمێك بەلای منەوە بوو، لە ترووسکەی چاوەکانی گاڵتەپێکردنێك هەبوو،



نەیدەشاردەوە، بەفیزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردم. منیش هەوڵ دەدەم وا دەربکەوم گوایە بابەتەکە بەلای منەوە زۆر ترسناکە، وتم کاتێک بارۆن سکاڵای لە لای ژەنەراڵ کردووە، وەك ئەوەیە من خزمەتکاری ژەنەراڵ بم، یەکەم ئاستی منی کەم نیشان داوە، دووەم وا مامەڵەی لەگەڵ من کردووە، گوایە من کەسێکم بەرپرس نیم لە هەڵسوکەوتی خۆم، تەنانەت شایەنی ئەوەش نیم قسەم لەگەڵ بکرێت. دیارە ئەمە سووکایەتیەکی گەورەیە، لەگەڵ ئەوەشدا من بە لەبەرچاوگرتنی تەمەن و پێگەی کۆمەڵایەتی...هتد ( نەمتوانی پێکەنینی خۆم بگرم کە دوایین ڕستەم وت) بەرەو لاسارییەکی دیکە ناڕۆم، من بەڕاشکاوی، داوا لە ژەنەراڵ ناکەم شتەکان چاك بکاتەوە، هەرچۆنێك بێت بەڕەوای دەزانم داوای لێبوردنی لێ بکەم، بەتایبەتی لەخاتوونی بارۆن، من بەم دواییە هەست بە نەخۆشی دەکەم و هەڵسوکەوتم سەیر بووە... هتد. کەچی بارۆن بەکارەکەی خۆی سووکایەتی بەمن کردووە، لەلای ژەنەراڵ پێداگری کردووە من لە کارەکەم دەربکات، ئەمەش وا دەکات بەلای منەوە مەحاڵ بێت داوای لێبوردن لە بارۆن و خاتوونەکەی بکەم، چونکە ئەگەر ئەم کارە بکەم، ئەو خۆی و خێزانەکەی و تەنانەت خەڵکیش وادەزانن من لەترسان و بۆ گەڕانەوەی کارەکەم داوای لێبوردنم کردووە. لەئەنجامدا ناچار دەبم داوا لەبارۆن بکەم ئەو داوای لێبوردن لەم بکات، هەرچەندە بە چەند ڕستەیەکی دادپەروەرانەش بێت، بۆ نموونە بڵێ ئەو مەبەستی نەبووە سوکایەتیم پێ بکات. ئەگەر بارۆن



بەم داوایەی من ڕازی بوو، ئەوا دەکات دەست لە ئەوکی بەربدەم، منیش ڕاستگۆیانە لەناخی دڵمەوە داوای لێبوردنیان لێ دەکەم.

بەمشێوەیە کۆتاییم بە قسەکانم هێنا: ئەوەی داوای دەکەم، تەنها ئەوەیە بارۆن وا بکات من دەست لە ئەوکی بەر بدەم.

–ئیی ..... ئای لەو هەموو هەستیارییە ! ئای لەو هەموو زۆرزانیانییە ! بۆچی داوای لێبوردن دەکەی . دەی میسیۆ ئیعتراف بکە... تۆ ئەم تەڵەکەیەت دروست کرد بۆ ئەوەی ژەنەڕاڵ نیگەران بکەی... لەوانەیە ئامانجی تایبەتت هەبێت....میسیۆ ... ببوورە ناوەکەتم بیر چوو.. میسیۆ ئەلکسی... ئەی وا نییە؟

– بەلام مەرکیزی ئازیزم تۆ ڕێگەم بدە بپرسم، ئەم بابەتە چ پێوەندی بە تۆوە هەیە؟

– ئەی ئەمە زیان بە ژەنەڕاڵ ناگەینێ؟ ئەو دوێنێ بەمنی وت ناچارە بە رواڵەتێکی تایبەت دەرکەوێ.... من شتێك لەمە نەگەیشتم.

– لێرە بارودۆخە تایبەتەکە خۆی مەلاس داوە.

دی گریۆ بە زمانێکی لاواز، بەرە بەرە بەرەو تورەیی دەچوو وتی: تۆ خاتوو دی کومێنگ دەناسی؟

–مەبەستت خاتوو بلانشە؟



–بەڵێ، خاتوو بلاَنش و خاتوونی دایکی... تۆش دەزانی ژەنەڕاڵ شەیدای خاتوو بلانشە، تەنانەت زەماوەندەکەیان لێرە دەبێت، جا خەیاڵی ئەو ئابڕووچوون و کێشانە بکات لەو کاتەدا !...

– هیچ ئابڕووچوون و کێشەیەك نابینم پێوەندی بە زەماوەندەکەوە هەبێت.

–بەڵام بارۆن پیاوێکی تورەو وتوندە، زوو هەڵدەچێ، سروشتێکی پڕووسی هەیە، وەك دەزانیّ لەوانەیە دەمەقاڵی و شەڕێك دروست بیّ.

– ئەمەیان پێوەندی بەمنەوە هەیە، پێوەندی بە ئێوەوە نییە، چونکە لەمەودوا من یەکێك نییم لە ماڵەکە، (دەمویست تا ئەوپەڕی دەبەنگی بنوێنم ) بەڵام تۆ ڕێگەم بدە، بابەتەکە بەم شێوەیەیە: خاتوو بلانش شوو بە ژەنەڕاڵ دەکات، کەواتە چاوەڕوانی چیین؟ بۆچی بابەتەکە دەشارنەوە، بەلایەنی کەمەوە لە ئێمەی دەشارنەوە، خۆ ئێمە کەسی یەك ماڵیین؟

– نەتوانم... هەر چۆنێك بێت... هێشتا شتێکی یەکلاکەرەوە نییە.... لەگەڵ ئەوەیشدا تۆ دەزانی ئەوان چاوەڕوانی هەواڵن لەرووسیاوە بێت، بۆئەوەی ژەنەڕاڵ کارەکانی مەیسەر بکات.

– ئا.. ئا... داپیرەی ئازیز..

بەچاوی ڕق و قینەوە سەیری کردم و قسەکان منی بڕی، وتی:

—من زۆر پشت بەو هەستە ناسکەت دەبەستم کە فرچکت پێوەگرتووە. پشت بە زیرەکی و سەلیقەت دەبەستم. من دڵنیام تۆ ئەم کارە دەکەی کە من داوات لێ دەکەم، ئەمەش لەپێناو ئەو خێزانە کە بەرێزەوە پێشوازییان لێ کردووی.

— ببوورە، ئەوان دەریان کردم، تۆ ئێستا بۆ بابەتی ڕووالەت دەچی، بەڵام دەبێ لەگەڵ من هاوڕابی، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بەتۆی گوت" دەمەوێ گوێچکەت ڕابکێشم، یانیش وتی بۆ ڕەچاوکردنی ڕووالەت ڕێگەم بدەم دەمەوێ گوێچکەت رابکێشم" ئەم هەردووکیان وەك یەکە.

بەفیز و لەخۆباییەوە وتی:

—ئەگەر بابەتەکە بەم شێوەیە بێت ، ئەوا هەر تکایەك لەتۆ بێ سوودە، بەڵام ڕێگەم بدە دڵنیات بکەمەوە، لەم وڵاتە دەسەڵاتی بەرپرس هەیە، تۆ هەر ئەمڕۆ لەم وڵاتە دەردەکرێی... بابەتێکی سەیرە، کەسێکی وەك تۆ هەرزەکار بیەوێ لە ئاستی کەسێکی وەك بارۆن کەم بکاتەوە.؟ وا دەزانی ئەوانیش بێدەنگ دەبن لە هەڵسوکەوتەکانت، تەواو متمانە بەوە بکە، کەس لەتۆ ناترسێ، کاتێك تکات لێ دەکەم تەنها لەخۆمەوە ئەو کارە دەکەم، چونکە تۆ ژەنەڕاڵت نیگەران کردووە، چۆن خەیاڵی ئەوە ناکەی ژەنەڕاڵ فرمانێکی بچووك بە خزمەتکارەکان بدات، تۆ لێرە وەدەر دەنێ؟

بەهێمنیەکی تەواو وتم:

-بەلاَم مـن بەتـەنیا ناچـمە لای بـارۆن، ئـەی میسـیۆ دی گرێـۆ. بابەتەکە پێچەوانەی ئەوەیە کە تـۆ تێگەیشـتووی. مـن هـەر ئێسـتا دەچـمە لای مسـتەر ئاسـتلی، تکـای لێدەکـەم ببێتـە ناوبـژیوان، بەکورتیەکەی ببێتە یاریدەدەرم، ئەو پیاوە هەست بە خۆشەویستی من دەکات، هەرگیز داواکەی من ڕەت ناکاتەوە، بۆلای بارۆن دەچیّ، بارۆنیش پێشوازی لیّ دەکات. ئەگەر من مامۆستایەك بـووم، یـان وا دەرکەوتم سەردارم هەیـە و ملکەچـم نـاتوانم داکـۆکی لـەخۆم بکـەم، ئەوا مستەر ئاستلی بـرازای لوردێکـە، لـۆردێکی ڕاسـتەقینە، هـەموو کەسـێك لێـرە دەیناسـیّ، ئـەویش لـۆرد پیبرۆکـە، هـەر ئێسـتا ئـەو لێرەیە. متمانەت هەبیّ بارۆن لەگەڵ مستەر ئاسـتلی بـەرێز دەبێـت، گوێی بۆ دەگریّ. ئەگەرهاتوو گوێی بۆ نەگرت، ئەوا مسـتەر ئاسـتلی ئـەم سـووکایەتییە قبـووڵ ناکـات (تـۆ دەزانـی ئینگلیـز چـەندە کەللەڕەقن) بۆیـە کەسـێك لـە هاوڕێیـانی خـۆی ڕەوانـەی لای بـارۆن دەکات، دەبینی بابەتەکە چۆن چارەسـەر دەکرێت، بـەم شـێوەیە نییە کەتۆ وێنات کردووە؟

کابرای فەرەنسی پەشۆکا، لەڕاستیدا هەموو ئەوانەی ئاماژەم پێکرد لە هەقیقەت نزیك بوو، وەك دەردەکـەوت مـن توانـای ئـەوەم هـەبوو کارێکی ئابڕووبەرانە ئەنجام بدەم.

دووبارە بەزمانێکی پاڕانەوە وتی:



–تکا دەکەم، واز لە هەموو ئەوانە بهێنە ! وەك ئەوەیە دڵخۆش بـی، کارێکی ئابڕووبەرانە ئەنجام بدەی! وەك ئەوەیە نـەخوازی کارەکـان چاك ببێتـەوە، بـەڵکوو دەتـەوێ خـراپتر بێـت. وەك وتم هـەموو ئـەو کارانە بۆ سـەرگەرمی وگاڵتەجارپیـە، لەوانەیـە ئامـانجی تـۆیش هـەر ئەوە بێ...بەڵام..

لێرەدا کە بینی من هەڵسـامەوە سـەرپێ و کڵاوەکـەم هـەڵگرت، دوا قسە وتی:

–من پەیامێکم لەکەسێکەوە هێناوە، بیخوێنەوە... تکـای کـردووە وەڵامەکە وەربگرمەوە.

ئەمەی وت و لـەگیرفانی کاغـەزێکی پێچـراو و سـەرمۆری دەرهێنـا و بەمنی دا، کاغەزەکە هی پاولینا بوو، بە دەستخەتی ئەو نووسرابوو:

" بیستوومە تۆ بەدوای چیرۆکەکەی، تۆ زوویر بووی، یاری منداڵانـە دەکەی، کەچی هەندێك بارودۆخی تایبـەت هەیـە، ڕۆژێـك بـۆت بـاس دەکەم، تکات لێ دەکـەم بوەسـتە و عاقـڵ بـە، هـەموو ئـەو شـتانە پڕوپووچــن، مــن پێویســتم بەتۆیــە، تــۆیش بــەڵێنت بــەمن داوە، گوێڕایەڵم بی، ئایا شـاخەکانی شـیلانگ برێگـت وەبـیرە؟ داوات لـێ دەکەم گوێڕایەڵ بی، یان فرمانت پێ دەکەم پابەنـد بـی" دڵسـۆزت پاولینا. لە پـەراوێزیش نووسـرابوو" ئەگـەر تـۆ لەبـەر ڕووداوەکـەی دوێنێ لەمن دڵتەنگی، لێم ببورە".



من ئەم چەند دێڕەم خوێندەوە، هەستم دەکرد هەموو شتێك بەبەر چاومەوە سەما دەکات، لێوەکانم زەرد بوون، دەلەرزیم، کابرای نەفرەتی فەرەنسی، وا خۆ نیشیاندا سەرنجی منی نەداوە، چاوەکانی لەسەر من لادا گوایە نەدەیویست شڵەژانی من ببینێ، کاریگەر دەبم ئەگەر لەبەردەمم پێدەکەنی، وتم:

–باشە ، بەخاتوون بڵێ با ئاسوودەبێ، خەیاڵی راحەت بێ.

دواتر بەهەڵەوە وتم:

–بەڵام ببورە، بۆچی هێندە چاوەڕوانت کرد، دواتر ئەم کاغەزەت پێدام؟ ئەگەر تۆ بەم ئەرکە هەڵساوی، دەبووایە زووتر لەبری ئەو هەموو مشتومڕە پڕوپووچە، کاغەزەکەت، کاغەزەکەت دەربخستایە.

– دەمویست.... بەهەرحاڵ .. لەم بابەتە سەیرە، سەبر و ئارامی منت بینی، ئەمەش کارێکی ئاساییە. من دەمویست بە پەلە لەزاری خۆت نیازەکانت بزانم. بە هەر حاڵ من نازانم چی لەو کاغەزە نووسراوە، بەڵام کاتی خۆی هات کاغەزەکەم بەتۆ دا.

– ئێستا تێگەیشتم. ئەوان داوایان لێکردووی تەنها لەکاتی پێویست کاغەزەکەم پێ بدەی، تەنها ئەو کاتە بەمنت دەدا کە نەدەتوانی بەئامۆژگاری بابەتەکە چارەسەر بکەی، ئەی وا نییە؟ میسیۆ دی گریۆ بە ڕاشکاوی وەڵامم بدەوە!

بەوپەڕی خۆپارێزی دەنواند، بەنیگایەکی نامۆ سەیری کردم و وتی:



–لەوانەیە....

کڵاوەکەم بەدەستەوە گرت، بە ئاماژەی سەری خواحافیزی کرد و ڕۆیشت، وا خەیاڵ دەکەم زەردەخەنەیەکی گاڵتەجارانەی لەسەر لێوەکانی بوو، ئەی چۆن کاتێک کێشەکان بەم شێوەیە چارەسەر ببێت؟

لەبەرخۆمەوە ورتە ورتم بوو لەسەر قاندرمەکان دەهاتمە خوارەوە:

– هێشتا حسێبمان لەنێوان ماوە ئەی توندڕەو... دەزانین کامەمان سەرکەوت وکامەشمان ژێرکەوتوو دەبێ.

هێشتا توانای ئەوەم نەبوو خەیاڵە پەرتەوازەکەم کۆبکەمەوە، بارودۆخەکە وەکو ئەوەبوو چەکوشێك بەرسەرم کەوتبێ. هەوایەکی خۆش و سازگار بۆمن زۆر پێویست بوو. دوا دوو خولەك، توانیم بیر بکەمەوە، دوو بیرۆکە لەلای من زۆر ڕۆشن بوو: یەکەمیان ئەو رابوردنە منداڵانییە بوو، ئەو هەڕەشە خەیاڵیانەی هەرزەکارێك دەیکرد، ترسی بۆ هەموو لایەك دروستکرد بوو. دووەمیان: کابرای فەڕەنسی چ کاریگەرییەکی مەزنی بەسەر پاولیناوە هەیە! تەنها وشەیەك لەلایەن ئەو وایکرد پاولینا نامەم بۆ بنووسێ و تکام لێ بکات. ڕاستە پێوەندی هەردەم پێوەندی ئەوان لەچاوی من هەردەم وەك نهێنییەك بووە، بەڵام بەمدواییانە هەستم کردووە، پاولینا زۆر بەتوندی بەدەست کابرای فەڕەنسی رادەکات و لێی دوور دەکەوێتەوە، تەنانەت ڕقیشی لێ دەبێتەوە. کابرای فەڕەنسیش



نەسەرنجی پاولینای دەدا و نە نیگایەکی دەکرد، بەڵکوو زۆر لەگەڵ توند بوو، من تێبینی هەموو ئەمانەم کردبوو. پاولین ئەمەی لەدەردەچوو گوایە قیزی لە کابرای فەرەنسی دەبێتەوە... هەر چۆنێك بێت ئەو ژنە لەژێر چەپۆك و دەستی دی گرێو دایە.





# بەشی هەشتەم

لە پیاسەکەمدا، بەو ڕێگەیەی کە لە ناو داربەڕووەکان تێدەپەڕی، بە هاوڕێ ئینگلیزەکەم گەیشتم، هەرکە چاوی بەمن کەوت وتی:

– ئۆ ئۆ... ! ئەوە من دێمە لای تۆ، تۆش بەرەو لای من دێی! کەواتە هاوڕێیەکانت بەجێهێشت؟

بەسەرسامی پرسیم:

–پێم بڵێ تۆ چۆن ئەمەت زانی. ئایا هەموو خەڵك بە بابەتەکە دەزانن؟

–نەخێر.. هەموو خەڵك نا.... مەسەلەکە شایەنی ئەوە نییە... کەس قسەی لەسەر نەکردووە.

–کەواتە چۆن زانیوتە؟

– من زانیومە، یان بڵێ بەڕێکەوت زانیومە. ئێستا تۆ بۆ کوێ دەچێ؟ من هەستی هاوڕێیەتیم بۆ تۆ هەیە، بۆیە بۆلای تۆ دەهاتم.

من لەوە سەرسام بووم کە بەمەسەلەکەی زانیوە، وتم:



-مستەر ئاستلی تۆ پیاوێکی جوامێری، لەبەر ئەوەی من قاوەکەم نەخواردووەتەوە، تۆش لەوانەیە قاوڵەتیت نەکردبێ، کەواتە با بەیەکەوە بچینە گازینۆکە، لەوی جگەرەش دەکێشین، من بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێڕێمەوە، لەوانەیە تۆیش شتێکم بۆ باس بکەی.

گازینۆکە سەد مەترێك لە ئێمەوە دورو بوو... خواردمانەوە.. بە ڕاحەتی دانیشتین، جگەرەیەکم داگیرساند، مستەر ئاستلی جگەرە ناکێشێ، ئەوا ئەو چاوەڕوانە گوێبیستی من بێت، من بەمشێوەیە دەستم بە قسەکانم کرد:

-من بۆ هیچ شوێنێك ناچم، لێرە دەمێنمەوە.

-من لەوە دڵنیابووم.

مستەر ئاستلی ئەمەی بە زمانێکی خۆشەویستی و پشتیگری دەربڕی.

کاتێك بۆ لای میستەر ئاستلی دەچووم، هەرگیز نیازی ئەوەم نەبوو، قسە لەبارەی خۆشەویستی خۆم بۆ پاولینا بکەم، دەمویست خۆم لەو بابەتە بپارێزم، بەم ڕۆژانەی دوایی بەوشەیەکیش باسی ئەم بابەتەم نەکردووە. دواتر مستەر ئاستلی پیاوێکی زۆر شەرمنە، تێبینی ئەوەم کردووە، قسەکردن لەبارەی پاولیناوە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر دەروونی ئەو هەیە، کەچی ڕۆژێك لە ڕۆژان ناوی ئەوی



نەهاتۆتە سەر زار. شتێکی سەیر و سەمەرە ئەوەبوو هەرکە مستەر ئاستلی دانیشت و نیگاکانی لەسەر من جێگیر کرد، نازانم بۆ ئارەزووییەکی توند هەبوو، بۆ ئەوەی هەموو شتێك بگێڕمەوە، تەنانەت باسی خۆشەویستییەکەم بکەم بە هەموو ڕەنگەکانییەوە. من تەواوی نیو کاتژمێر قسەم کرد، هەستم بە ئاسوودەیەکی مەزن دەکرد. ئەمە یەکەم جارە لەسەر ئەو بابەتە دڵی خۆم بۆ کەسێك دەکەمەوە. هەستم کرد کاتێك لە قسەکانم دەگەمە برگە گەرمەکان، ئەو دەشڵەژا، منیش بە ئەنقەست چیرۆکەکەم گەرموگوڕ دەکرد، لەوانەشە زێدەڕۆییم لە باسکردنی فەرەنسییەکە کردبێ.

مستەر ئاستلی لەبەرانبەرم دانیشبوو گوێی لەمن گرتبوو، بێدەنگ یەك وشە تەنانەت یەك پیتی نەدەرکاند. کاتێك لە بابەتی کابرای فەرەنسی نزیك بوومەوە، لەناکاو منی وەستاند و بەزمانێکی زبر، پرسیاری ئەوەی لێکردم ، ئاخۆ مافی ئەوەم هەیە باسی بابەتی لاوەکی بکەم. مستەر ئاستلی شێوازێکی سەیری لەپرسیارکردن هەبوو. منیش وتم:

–تۆ لەسەرهەقی، لەوانەیە من ئەو مافەم نەبێت.

– لەبارەی مارکیز و خاتوو پاولینا ناتوانی شتێکی وردو دروست بڵێی، تەنانەت ئەگەر بە مەزندە بێت؟

–بەڵێ، ناتوانرێت شتێکی دروست بگوترێت... بەدڵنیاییەوە وایە.

– ئەگەر بابەتەکە وایە، ئەوە تۆ هەڵەی، نەوەك تەنها ئەو کاتەی بۆم باس دەکەی، بەڵکوو کاتێك بیرت لێ کردووەتەوە.

لەگەڵ خۆمدا هەستم بەسەرسامی کرد و وتم:

–باشە باشە، لەگەڵت هاوڕام.

دواتر وردودرشتی بەسەرهاتەکەی دوێنم بۆ مستەر ئاستلی گێڕایەوە: سەرگەرمییەکەی پاولینا، سەرکێشییەکەی من لەگەڵ بارۆن، دەرکرانم لەکار، ترسنۆکییە بێ ئەندازەییەکەی ژەنەراڵ. دواتر باسی هەموو وردەکارییەکانی سەردانی فرەنسییەکەم بۆ گێڕایەوە و دواجاریش باسی ئەو کاغەزەم کرد کە پاولین ناردوویەتی، پرسیارم لە ئاستلی کرد وتم:

–تۆ چ ئەنجامێك هەڵدەهێنجی؟ بۆ ئەوە هاتووم بۆچوونی تۆ بزانم.

من هیچ سڵ لەوە ناکەمەوە، پیاوە بچووکە فەرەنسییەکە بکوژم، لەوانەشە ئەم کارە بکەم.

مستەر ئاستلی وتی:

–منیش هەروەها.... بەڵام سەبارەت بە خاتوو پاولینا... تۆ دەزانی هەر یەکەمان پێوەندیم بەکەسانێك هەیە، تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسانەی ڕقمان لێیان دەبێتەوە، لەوانەیە ئەمە بەپێی پێویستییەکانمان بێت. دەکرێت ئەم پێوەندیانە فەرامۆش بکەین، ئەمە پێوەندی راگوزەر ولاوەکیین، دەتوانی لەم لایەنەوە خەیاڵ



ڕاحــەت بیــت. بێگومــان هەنــدێك ئاســوودە بــە... بــەڵام لــەبارەی سەرگەرمییەکانی دوێنێی پاولینا، ئەمەیان زۆر ســەیرە. لەبــەر ئــەوە سەیر نییە، کــە ویســتوویەتی تــۆ ڕەوانــەی لای دارعەســاکەی بــاڕۆن بکات (من بەڕاستی پێم ســەیرە عەسـاکەی بەدەستەوە بــووە چــۆن لێی نەداوی)، بەڵکوو سەیرەکە لەوەدایە ئەم سەرگەرمی و لاســارییە بۆ کچێکی پێگە بەرز، نەگونجاوە، ئەو کــارەی دوێنــێ بێئابڕووویانــە بووە، لەوەدەچێ ئەو نەیزانیوە تۆ پیت بە پیت ئەو کــارە جێبــەجێ دەکەی.

من لەدوای هەلێك دەگەڕام، لەناکاو بە هەڵەپەوە وتم:

–ئایا دەزانیێ؟ من هەست دەکەم تۆ تەواوی چیرۆکەکەت بیســتووە، دەزانی لەکێ؟ لە خودی خاتوو پاولینا؟!

مستەر ئاستلی بەسەرسامی سەیری منی کرد، دواتر بەهێمنی وی:

–چــاوەکانت دەبرســیکێنەوە، مــن گومانێــك لــە چــاوەکانت بــەدی دەکەم، ناتوانی گومانەکانت دەربخــەی، مــن ددان بــەو مافــەی خــۆم دەنێم و ڕەتی دەکەمەوە وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە.

– باشــە، بــا واز لــەوە بهێــنین، بەهــەرحاڵ، بــا لەســەر بابەتــە گرنگەکەوە بین.......

بەم شێوەیە بابەتەکەم ڕاســت کــردەوە. تووشــی شــڵەژانێکی تونــد بــوو، نــازانم چــۆن ئەمــەم بەخــەیاڵ هــات. کــەی و لــەکوێ و چــۆن



دەکرێت پاولینا، مستەر ئاستلی دەست نیشان بکات بۆ ئەوەی نهێنینەکانی خۆی لەلا باس بکات. دواتر لەم ڕۆژانەی دواییدا مستەر ئاستلی تەواو لەبەر چاوم ون بووبوو، پاولیناش هەر خۆی نهێنییەك بووە هەمیشە مێشکم سەرقاڵ دەکات. تەنانەت ئێستا کە بڕیارم داوە هەموو هەستی خۆشەویستیم بۆ مستەر ئاستلی باس بکەم، لەناکاو هەستم بەو کرد توانام نییە وردەکاری پێوەندییەکانم لەگەڵ پاولینا باس بکەم، بە پێچەوانەوە هەموو شتێك نزیك بوو لە خەیاڵ،نامۆ، پەرتەوازە، بە هیچ شتێك نەچوو.

بەهەناسە بڕکێوە وتم:

–باشە، باشە.. من لە بابەتەکە دەرچووم، سەروبەری قسەکانم لێ تێکچوو، هەندێك شتی دیکە هەیە ناتوانم ئێستا بیریان لێ بکەمەوە... هەرچۆنێك بێت، تۆ پیاوێکی جوامێری، من دەمەوێ بۆچوونی تۆ بزانم، نەوەك خوازیاری ئامۆژگاری بم.

چرکەساتێك بێدەنگ بووم، دواتر وتم:

–بە بۆچوونی تۆ چ هۆکارێك وای لە ژەنەڕاڵ کرد هێندە بترسێ؟ بۆچی ئەو کارە گاڵتەجاڕیەیان کردە کارەساتێکی ترسناك، تەنانەت گەیشتە ئەوەی دی گرێۆ بێتە ناو بابەتەکەوە ( کەچی ئەو ناچێتە ناو ترسناکترین بابەتەوە) کەچی هاتە لای من (بەڵێ !) تکای لێ کردمم، پەنای بۆ من هێنا، ئەمە هەر دی گرێۆ بوو ! تێبینی ئەوە بکە، ئەو بەر لە کاتژمێر نۆ هاتەلای من، کاغەزەکەی پاولینای هێنا



بوو، ئەم کاغەزە کەی نووسراوە؟ دەکرێ مرۆ ئەو پرسیارە لەخۆی بکات. ئایا خاتوو پاولینیان تەنها بۆ ئەو مەبەستە لە خەو بێدار کردووەتەوە؟ من سەرەڕای ئەوەی مەزندە دەکەم پاولینا کۆیلەی ئەو بێت ( مادام تۆ داوای لێبوردن و بەخشین دەکەیت)، باشە پێوەندی پاولینا بەم بابەتەوە چییە؟ بۆچی هێندە بایەخ بە بابەتەکە دەدات؟ بۆچی لەوە ترسان کە بارۆنیان لێ دەرکەوت؟ ئایا پێوەندی هەموو ئەمانە بە زەماوەندەکەی ژەنەڕال و بلانشەوە چییە؟ ئەوان دەڵێن ژەنەڕاڵ لەبەر ئەم بارودۆخە دەبێت بەڕواڵەتی تایبەت دەربکەوێ؟ بەڵام ئەمە زێتر زێدەڕۆییە لە ڕواڵەتی تایبەت، ئایا تۆ هاوڕای لەگەڵم؟ بۆچوونی تۆ چییە؟ من ئەوە لەچاوەکانت دەخوێنمەوە، تۆ لێرەی زیاتر لەمن هەموو شتەکان دەزانی.

مستەر ئاستلی زەردەخەنەیەکی کرد و سەری لەقاند و وتی:

–بەڵێ، بەڕاستی منیش پێموایە، لەم بابەتە، زیاتر لە تۆ ئاگادارم، بابەتەکە هەموو تەنها پێوەندی بە خاتوو بلانشەوە هەیە، من باوەڕی تەواوم بەو هەقیقەتە ڕەهایە هەیە.

بێ ئۆقرە بووم ( لەناکاو ئومێدی ئەوەم بۆ دەرکەوت، شتێك لەبارەی خاتوو پاوليناوە دەزانم) وتم:

–خاتوو بلانش چ پێوەندییەکی هەیە؟

–پێموایە خاتوو بلانش ئێستا بەرژەوەندی تایبەتی لەوە هەیە، بەهەموو شێوەیەك خۆی لە دیداری بارۆن و خاتوونی بارۆن بەدوور بگرێت، بەتایبەتی ئەگەر دیدارێکی بێزارکەر یان ئابڕووبەر بێت؟

– واز لەمە بهێنە....

– خاتوو بلانش دوو ساڵ لەمەوبەر لە رۆلتنبێرگ بوو، وا رێکەوت منیش لێرە بووم. ئەو کات ناوی دی کۆمێنگ نەبوو، تەنانەت مەدام کۆمێنگی بێوەژن، ئەو کات بوونی نەبوو، دی گریۆش بەهەمان شێوە. من لەناخەوە باوەڕم وایە ئەوان نەوەك پێوەندی خزمایەتیان نییە، بەڵکوو ماوەیەکی کورتە یەکتر دەناسن، دی گریۆ مەرکیز نییە، ئەوەی وا دەکات لەوە دڵنیابم بارودۆخێکی تایبەتە، تەنانەت کەسێك بەناوێکی دیکە ناسیویەتی.

– لەگەڵ ئەوەشدا دی گریۆ تۆڕێکی پێوەندی بەهێزی هەیە.

– بەڵێ ،بەڵێ، ئەمەیان زۆر ڕاستە. تەنانەت خودی بلانش لەوانەیە کۆمەڵێك پێوەندی هەبێت، بەڵام ئەو کات پۆلیس بانگی بلانشی کرد، ئەمەش لەبەر سکاڵایەك بوو لەلایەن خاتوونی بارۆن تۆمار کرا بوو، داوای کردبوو، لەم شارە بڕوا، ئەویش رۆیشت.

–ئەمە چۆن بوو؟

– سەرەتا بلانش لەگەڵ پیاوێکی ئیتاڵی دەردەکەوت، گوایە میرە، ناوێکی مێژوویی هەبوو( وەك بارپینی یان شتێك لەمجۆرە). ئەم



پیــاوه هـــەموو گیـــانی یـــاقوت و ئـــەڵماس بـــوو، بەیەکـــەوە بـــە گالیسەکەیەکی نایاب دەگەڕان، بلانش یاری (سی و چواری دەکرد) ســـەرەتا بردییـــەوە، دواتـــر بـــەخت پشـــتی تێکـــرد، ئێوارەیـــەکیان پارەیەکی خەیاڵی دۆڕاند، هەر ئەو کاتە میرەکەی بەیانییـەکیان ون بوو، کەس نەیدەزانیّ بۆ کویّ چوو... ئەسپ و گالیسکەکان و هەموو شتێکی ون بوو. بلانش پارەیەکی زۆر قەرزاری هۆتیـل بـوو، خـاتوو زەلمـا ( ئەمـە دوای ئـەوەی نـاوی دی بـاربینی نـەما) لەوپـەڕی نەهامەتی و دڵتەنگی دابوو، دەگریا و هاواری دەکرد، هۆتێلەکەی پڕ کردبوو لە گریان و فیغان، لـەتورەیی کراسـەکەی خـۆی دادڕی، ئـەو کاتـە لـە هۆتێـل کـۆنتێکی پۆڵـۆنی هـەبوو (دەبـیّ بزانـی هـەموو پۆڵۆنییـەکان لـەکاتی سـەفەر کـۆنتن) کاتێـك ئـەم پیـاوە پۆڵۆنییـە دەبینـی زەڵمـا کراسـەکانی دەدڕێنـی، بـە دەسـت جوانـەکانی وەك پشیلە چرنۆك لە رووومـەتی دەدات، ئـەوا پیاوەکـە کاریگـەر دەبێـت، هەنـدێك گفتوگـۆ لـەنێوانیان دەبێـت. کاتێـك ئێـوارە داهـات زەڵمـا خەمەکەی نەما، ئێوارە هاتە گازینۆ خۆی بـە قـۆڵی کـۆنتی پۆڵـۆنی هەڵواسی بوو، وەك نەریتی خۆی بەدەنگێکی بەرز پێدەکەنی، زیـاتر لەجاران چالاکتر دەردەکەوت. بووە هاوشێوەی ئەو ژنانەی لـە یـاری رۆلێتەوە ڕاهاتوون، کاتێك یەکێك لەو ژنانە یاری دەکـەن، یـەکێك لـە یاریکـەرەکان دەنێـریّ بـۆ ئـەوە شـوێنێکی بـۆ بگرێـت، ئەمـەش خەسڵەتێکی ئەم ژنانەیە، لەوانەیە تێبینیت کردووە.

– بەڵێ تێبینیم کردووە.

– بابەتەکە ئەوەندە ناهێنێ، خەڵك بە ناچاری بەرگەی ئەم جۆرە ژنانە دەگرێت، یان بەلایەنی کەمەوە تا ئەو کاتە بەرگەیان دەگرێ کە کاغەزی دراوی هەزار فرانکی ورد دەکەنەوە. کاتێك گۆڕینەوەی ئەم جۆرە دراوانە کۆتایی لەلای ئەم جۆرە ژنانە کۆتایی هات، ئەوا داوایان لێ دەکەن دوور بکەونەوە. خاتوو زەڵما بەردەوام کاغەزی هەزار فرانکی ورد دەکردەوە، بەڵام بەخت لە قومار یاوەری نەبوو، زۆرێك لەو ژنانە لە قومار بەخت یاوەریان نییە. ئەوان ناتوانن دان بەخۆیان بگرن، چیرۆکەکەم لێرە کۆتایی هات. ڕۆژێکیان کۆنت ون بوو، وەك چۆن پێشتر میرە ئیتاڵییەکە ون بوو. پاشتر زەڵما بێئەوەی قۆڵ بخاتە قۆڵی پیاوێکەوە، بەتەنیا دەهاتە گازینۆکە، بە دوو ڕۆژ هەموو پارەکانی دۆڕاند، تەنانەت دوایین لیرەی زێڕیشی دۆڕاند. کاتێك سەیری دەوروبەری خۆی دەکات بارۆن فۆرمەر هێلم دەبینی، کە بەڕقەوە سەیری زەڵمای دەکات، بەڵام خاتوو زەڵما گوێ بەم شتانە نادات، بەزەردەخەنەوە بەرەو خاتوونی بارۆن دەچێت، تکای لێدەکات لە بری ئەو دە لیرەی زێر لە سوورەکە دابنێ، لەبەرئەمە خاتوونی بارۆن سکاڵا لە زەڵما دەکات و لەئەنجامی ئەم سکاڵایەش لە گازینۆکە دەردەکرێت. ئەگەر بەلاتەوە سەیرە من هەموو ئەو وردەکارییە پڕوپووچانە دەزانم، ئەوا من لە میستەر ڤیدەرم بیستووە، ئەو کەسێکی نزیکمە ئێوارەك بە



گالیسـکەکەی خـۆی خـاتوو زەڵمـای گەیاندۆتـە( سـپا). کەواتـە لەبابەتەکـە بگـە بەمشـێوەیەیە: کاتێـك خـاتوو بلانـش دەیـەوێ زەماوەند لەگەڵ ژەنەڕاڵ بکات، بۆ ئەوەیە جـارێکی دیکـە داواکـەی لـێ نەکردێتـەوە، ئێسـتا پومـار ناکـات، لەوانەیـە ئێسـتا هـەیبێ، جگەلەمـەیش ئامـاژەکـان ئـەوە دەردەخـەن، پـارە بەقـەرز دەداتـە قوماربازەکان، من پێم وایـە ژەنـەڕاڵی بەسـتەزمان یـەکێك بێـت لـە قـەرزارەکانی، هـەروەها لەوانەیـە دی گرییـۆش قـەرزاری بێـت، ئـەوە ئەگەر هاوبەشی نەبێت. کەواتە تێ بگە بۆ خاتوو بلانش بەر لـەوەی هاوسەرگیریی بکات، نایەوێ بـاڕۆن و خاتوونەکـەی ببینـێ. کارەکـە خۆی ئابڕۆچوونە، ئەمەیش لەم بارودۆخە بۆ ئەو زۆر خراپـە. تـۆیش لەگـەڵ خێزانەکـەی ئـەوانی، لەوانەیـە کارەکانـت کێشـە بنێنـەوە، بەتایبـەتیش ئێسـتا ئـەو قـۆڵ بـەقۆڵ لەگـەڵ ژەنـەڕاڵ یـان پاولینـا دەردەکەوێت. ئایا ئێستا تێگەیشتی؟

–نەخێر.... تێنەگەیشتم

بەمشـێوەیە هـاوارم کـرد، مشـتەکۆڵەیەکم لەمێزەکـە دا گارسـۆنی قاوەخانەکە لە ترسان راچڵەکی. بە هەڵپە و بەتووڕەیی وتم:

–ئەی مستەر ئاستلی ئەگەر تۆ بەمشێوەیە خاتوو بلانش دەناسـی، بۆ ئاگادارت نەکردیتەوە، نە من، نە ژەنەڕاڵ، تەنانەت نـە پاولینـاش کە لەگازینۆکـە قـۆڵ دەخاتـە قـۆڵی بلانشـەوە بەبـەر چـاوی هـەموو خەڵکەوە. هیچ کەسێکت ئاگادار نەکردەوە؟ ئایا ئەمە دەکرێت؟



مستەر ئاستلی بەهێمنی وەڵامدایەوە:

– نەمدەتوانی ئاگادارتان بکەمەوە، کاتێك ناتوانن هیچ شتێك بکەن. جگەلەمەش لە کێ ئاگادارتـان بکەمـەوە؟ لەوانەیـە ژەنـەڕاڵ لـەمن چاکتر بلانش بناسێ، کەچی ڕێگەی پێدەدات لەگەڵ ئـەم و پاولینـا پیاسە بکەن. ژەنـەڕاڵ مرۆڤێکی بەدبەختـە. دوێنـێ خـاتوو بلانشـم بینی لەسەر ئەسپێکی ناباب هەڵدەبەزییـەوە، بـەیاوەری دی گرییـۆ و میرێکی بچووکی رووسی بـوو، ژەنـەڕاڵیش بەسـەر پشـتی ئەسـپێکی بەڵەکەو بەدواینەوە بوو، کەچی بەیانییەکەی لەبەر ژانی قاچـەکانی دەینالآند. لەناکاو ئەوەم بەخـەیاڵ هـات کـە ژەنـەڕاڵ پیاوێکـە هـەتا هەتاییە وێڵە. سەرەڕای ئەمەش هەموو بابەتەکە پێوەنـدی بەمنـەوە نییە، سەبارەت بەپاولینا من ماوەیەکی کورتە دەیناسم.

مستەر ئاستلی بێدەنگ بوو، دواتر لەناکاو وتی:

– من پێشتریش بەتۆم گوت، من ڕێگـەت پێنـادەم هەنـدێك پرسـیار بکەی، هەرچەندە وەك هاوڕێیەکی دڵسۆزت دادەنێم.

بەدەم هەڵسانەوە وتم:

–ئەوەندەم بەسە، ئێستا بەلامەوە ڕوونە خاتوو پاولینـایش دەزانـێ دەبێت خاتوو بلانش بناسێ، بەڵام ئەو ناتوانێ لە کـابرای فەڕەنسـی جیا بێتەوە، لەپێناو ئەمەیشدا ئامادەیە پیاسە لەگەڵ بلانش بکـات. بـاوەڕ بکـە ئەگـەر ئـەو دەسـتەڵاتە نەبووایـە، ئـەوا کەسـێك نـەبوو

ناچاری بکات پیاسه لەگەڵ بلانش بکات، یان ناچاری بکات نامە بۆ من بنووسێ ، تکا بکات لە ژەنەراڵ نزیك نەبمەوە. کەچی هەر ئەویش بوو منی بۆ لای بارۆن ئاراستە کرد! سەیرە! مرۆڤ شتێك لەو بابەتانە تێ ناگات.

– تۆ یەکەم شت ئەوە لەبیر دەکەی خاتوو دی کومێنگ دەستگیرانی ژەنەراڵە. دووەم خاتوو پاولینا، کە کچی ژنەکەی ژەنەراڵ، برا و خوشکێکی بچووکتر لەخۆی هەیە، ئەم دووانە منداڵی ئەو ژەنەراڵە شێتەن، ئەوان بەتەواوی فەرامۆش کراون.

– بەڵێ بەڵێ، ئەمە راستە، جێهێشتنی ئەم دووانە واتا فەرامۆشکردنیان، مانەوە واتە داکۆکی کردن لە بەرژوەندیان، لەوانەیە بەشێك لەسامانەکەشیان رزگار بکات، هەموو ئەمانە راستە.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا... ! ئەها ! ئێستا تێگەیشتم بۆ هەموویان بایەخ بە داپیرە دەدەن.

–بەکێ؟

– بەو پیرەژنە خەرفاوەی لەمۆسکۆ دەژی، کە هێشتا نەمردووە، ئەوانیش چاوەڕێ دەکەن هەواڵی مردنی بگات.

– بێگومان هەموو بایەخە بەوە دەدرێت، هەموو شتێك لەسەر وەسیەتنامەکە وەستاوە، کاتێك وەسیەتنامەکە بکرێتەوە ژەنەراڵ



زەماوەند دەکات، پاولینا دەست کراوە دەبێت... دی گرێۆش دەتوانێ.....

– دەتوانێ چی بکات؟

– قەرزەکانی وەربگرێتەوە، چاوەڕوانی ئەوە دەکات.

–پێتوایە تەنها چاوەڕوانی ئەمە دەکات؟

مستەر ئاستلی بێدەنگییەکی موکڕی هەیە وتی:

–لەمە زیاتر شتێکی دیکە نازانم.

بەتوڕەیی چەند جارێك بەسەریەکەوە وتم:

–من دەزانم.. من دەزانم.... ئەو پیاوە چاوەڕوانی میرات دەکات، پاولینا مارەییەکەی وەردەگرێت، هەرکە وەریگرت، خۆی بەم پیاو هەڵدەواسێ، هەموو ژنەکان وەك یەکن، ئەوەی لەهەموویان نەفس بەرز بێت، ئەوا زیاتر کۆیلە دەبێت! پاولینا نازانێ خۆشەویستی بکات، ئەوینێکی توند نەبێت. ئەمە هەموو شتێکە! ئەمە بۆچوونی منە! سەیری بکە بەتایبەتی کاتێك بەتەنیا دادەنیشێ و بیر دەکاتەوە: وەك کەسێکی بەدبەخت دەردەکەوێ، کە بەر نەفرەت کەوتبێ.. ئەو... ئەو.... بەڵام ئەمە کێیە بانگم دەکات؟ ( لەناکاو هاوارم کرد) ئەمە کێیە هاوار دەکات ؟( گوێم لەکەسێك بوو بەرووسی ناوی من دەهێنێ: ئەلکسی ئیڤانۆڤیچ. ئەمە دەنگی ژنانە) گوێ بگرە، گوێ بگرە!



لەو کاتە لە هوتێلەکە نزیك دەبووینەوە، بێئەوەی تێبینیی بکەین، دەمێك بوو قاوەخانەکەمان جێ هێشتبوو.

مستەر ئاستلی دەستی درێژ کرد و وتی:

–دەنگی ئافرەتێکم بیست هاواری دەکرد، بەڵام نازانم بانگی کێ دەکات، بەرووسی قسە دەکات. ئێستا دەزانم دەنگەکە لەکوێوە دێت، ئەمە دەنگی ئەو ژنەیە لەسەر ئەو کورسییە گەورییە دانیشتووە، خزمەتکارەکان بەرەو هوتێلەکەی دەبەن، ئەوانی دیکە جانتاکانی هەڵدەگرن، دیارە شەمەندەفەر گەیشتووە.

– بەڵام بۆ بانگی من دەکات؟ ئەها دووبارە بانگی من دەکاتەوە، سەیر بکە، ئاماژە بۆ ئێمە دەکات.

مستەر ئاستلی وتی:

–بەڵی دەبینم.

– ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ! ئۆه..! ئای خوایە چەند دەبەنگە! ئەم دەنگە لە بەردەم هوتێلەکە دەهات.

بەرەو قاندرمەی دەروازەکە هوتێلەکە رۆیشتین، هەرکە پێم نایە قاندرمەکە، پەشۆکام قۆڵەکانم شل بوون، قاچەکانم لە جووڵەکەوتن!





## بەشی نۆیەم

لەدوای قاندرمەکەی بەردەمی هوتێلەکە، سەکۆیەکی فراوان هەیە، کورسییەکە لەوێ دانرا. چەندان خزمەتکاری ژن و پیاو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری فەرمانبەرانی هوتێلەکە، بە بەڕێوەبەرەکەشەوە، دەوری کورسییەکیان دابوو. لە بەرانبەر ئەو خاتوونی میوان، زێدەڕۆییان لە نواندنی ڕێز و پێشوازی دەکرد. ئەو ژنە کە پێگەیەکی بەرزی هەیە، بە ئاپۆڕەیەك خەڵك و بە کۆمەڵێك جانتا میوانی ئەم هوتێلە بوو. لەسەر عەرشەکەی ڕوونیشتبوو، ئەمە داپیرەیە ! بەڵێ ئەمە خۆیەتی ئەنتۆنین ڤاسیلڤنا تراسڤیچە، ترسێنەر، دەوڵەمەند، تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵە، خاوەنی چەندان موڵکە. یەکێکە لە ژنەخانەدانەکانی مۆسکۆ. ئەمە ئەو ژنەیە کە برووسکە لە بارەی هەواڵی مردنی دێت و دەڕوات، کەچی ئەوەتا بێهیچ ئاماژەیەکی پێشینە لەبەردەممان قوت بووەتەوە. ئەو ناتوانێ بە پێیەکانی خۆی بڕوات، بۆیە نزیکەی پێنج ساڵ دەبێت هەردەم بەسەر کورسییەك هاتوچۆی پێ دەکرێت، بەلام هەر وەك پێشتر



بینیومه، چالاكه، زۆر وریایه، زمـان درێـژه، زۆر بـەخۆی سەرسـامە، قوت دادەنیشێ، بـەدەنگێكی بـەرز قسـە دەكـات، بـە هاواركردنـەوە فرمـان دەدات، فرمـان بەسـەر هـەموو كەسـێكەوە دەكـات. بـەڵێ هەروەك پێشتر بووە، كە دوو جار بینیومە لەو ماوەیەی كە لـەماڵی ژەنەڕاڵ وەك مامۆستا و بەخێوكـەر كـار دەكـەم، بۆیـە ئاسـایی بـوو لەبەرانبـەر سەرسـام بوەسـتم. كاتێـك لەسـەر كورسـییەكەی بـۆ سەرەوەیان سەردەخست، چاوی بە من كـەوت، یەكـەمجار بـە نـاوی بچووكراوە و دواتر بەناوی باوم بانگی كردم، ناوەكەی منی بـۆ هـەتا هەتایە ئەزبەر كردووە، ئەو بیرێكی زۆر تیشی هەیـە. ئـەو كاتـە ئـەم پرسیارەم لەخۆم كرد:" ئایا ئەم ئافرەت بوو كە هیوایان دەخواست لەناو گۆڕ بێت، هەڵپەیان لەسەر میراتەكـەی دەكـرد؟ كەچـی ئێسـتا ئەو هەموومان لەو هوتێڵە دەنێـژێ! خودایـە، دەبێـت ئێسـتا چـی بەسـەر ئـەوانی دیكـە دێـت، دەبێـت ژەنـەڕاڵ چـی بكـات، لەوانەیـە ماڵەكە بەسەر یەك كاوڵ بكات!".

سەیری داپیرەم دەكرد هاواری كرد:

-ها ئەزیزم.... چیت بەسـەر هـاتووە بـۆ لەشـوێنی خـۆت چـەقیوی وەها سەیرم دەكەی؟ چییە نـازانی سـلاوم لـێ بكـەی؟ نـازانێ بلێـی بەیانیت باش؟ ئایا ئەمانە نازانی، یان تووشی فیز و لـەخۆبایی بـوو، بۆیە ئەمە ناكەی؟ یانیش من ناناسیتەوە؟ ئایـا پۆتـاپیچ گوێبیسـتی منـی (بـەم شـێوەیە قسـەی دەكـرد ئـاوڕی لـەو پیـاوە بچـووكە

سەرسپییە دایەوە، پیاوێکی کەچەڵ بوو، سەرۆکی خزمەتکارەکانی بوو لە کاتی سەفەردا). ئایا پۆ پۆتاپیچ گوێبیستی منی! ئەوان تەواو منیان ناشتووە! بروسکە لەدوای بروسکەیان دەنارد: ئایا مرد، هێستا نەمردووە؟ من هەموو شتێك دەزانم، تۆش دەبینی، هێشتا خوێن بەدەمارەکانم دێت ودەچێ؟

کاتێك بەسەر خۆم زاڵ بووم، بە دەمودوێکی خۆش وتم:

– بمبوورە، ئەی ئەنتۆنین ڤاسیلیڤنا، خۆزگەی خراپە بۆ تۆ ناخوازم، تەنها ئەوەیە سەرسام بووم، چۆن سەرسام نەبم؟ گەیشتنت بۆ ئێرە چاوەڕوان نەکراو بوو.

– چی سەرسامی کردووی؟ سواری شەمەندەفەر بووم و سەفەرم کردووە. شەمەندەفەرێکی خۆشرەو بوو، جووڵە و هەڵبەزینەوەی نەبوو. ئەوە لەپیاسە بوویت؟

–بەڵێ پیاسەیەکم بەناو گازینۆکە کرد:

داپیرە سەیری دەوروبەری خۆی کرد و وتی:

–مرۆڤ لێرە دەحەسێتەوە، هەواکەی گەرم و دارودرەختەکانیش دڵڕفێنن! منیش حەز لەوە دەکەم! خەڵکەکەی ئێمە لێرەن؟ ژەنەڕاڵ؟

–بەڵێ ئەو لە شوێنە تایبەتەکەی خۆیەتی، ئەوان هەموویان لەو کاتەدا لەوێ بەیەکتر دەگەن.



– لێــره، لێــره... دیــدارەکانیان ڕێــك دەخــەن، ڕەچــاوی ڕێســا و نەریتەکان دەکەن، گوتیـان گالیسـکەیان هەیـە، ئـەی خانەدانـەکانی رووس ! ئــەوان دوای ئــەوەی ســامانەکانیان پــوچ کــرد، بــەرەو دەرەوەی ولآت ڕایان کرد. پراسکۆڤیاش لەگەڵ ئەوانە؟

– بەلآم پاولینا ئەلکسەندرۆڤناش لێرەیە!

– ئـەی فرەنســی بچـووك؟ بـەلآم خـۆم ئێسـتا هـەموویان دەبیـنم. ئەلکیسی ئۆڤانۆڤیچ، بەرەو لای ژەنەڕاڵم ببە، ئەی تۆ، تۆ باشی؟

– کێشەیەك نییە، ئەی ئەنتۆنین ڤاسیلیڤنا.

– تۆ پۆتاپیچ، بەم خزمەتکارە زەبەلاحە بڵـێ لەشـوقەیەکی خۆشـم دابنێ، لە نهۆمی یەکەم بێ، هەر ئێستاش کەلوپەلەکانم بێـنن، ئـەوە بۆ هەموویان لە هەڵگرتنی من پەلەیانـە؟ چ وا دەکـات پـەلـە بکـەن؟ ئای لەم شەرمەزارییە...

جارێکی دیکەش ئاوڕی لەمن دایەوە، پرسیاری کرد:

–ئەم پیاوەش لەگەڵ تۆیە؟

–بەڵی ئەمە مستەر ئاستلییە؟

– مستەر ئاستلی کێیە؟

– یەکێکــە لــە گەشــتیاران، بۆتــە چــاکترین هــاوڕێم، هــەروەها ژەنەڕاڵیش دەناسێ؟



– ئەم ئینگلیزە. بۆیە وا سەیرم دەکات بێتەوەی دەمی بکاتەوە. هەر چۆنێك بێت من ئینگلیزم خۆشدەوێ. باشە بەرەو سەرەوەم بەرن، هەر ئێستا بەرەو شوقەی ئەوانم بەرن؟

داپیرە لە زەوی بەرزکرایەوە، من لە پێشەوەی کەژاوەکە دەڕۆیشتم، لە قاندرمە فراوانەکە بەسەرکەوتین، کەژاوەکەمان جێگەی سەرنجی خەڵك بوو، هەموویان سەیریان دەکردین. هوتێلەکەمان یەکێکە لە جوانترین هوتێلەکانی شارەکە، لەهەمووشیان گرانترە و جێگای ئەرستۆکراتەکانە، هەردەم لە ڕێرەو و قاندرمە و هۆڵەکانی ڕێکەوتی ئافرەتی شۆخ و شەنگ و ئینگلیزی بەهەیبەت و سەنگین دەکەی. زۆرێك لەو خەڵکانە کە لەمانەوە تێدەپەڕین پرسیاریان لە بەڕێوەبەری هوتێڵەکە دەکرد ئاخۆ دەبێت ئەم خاتوونە کێ بێت، بەڕێوەبەری هوتێلەکەش سەرسام بوو، بێگومان وەها بەمجۆرە وەڵامی خەڵکەکەی دەدایەوە، کە ئەمە ئافرەتێکی بیانی لە چینێکی خانەدانی رووسیە، ئافرەتێکە پێگەی مەزنی هەیە، ئەو بەشەی هوتێلەکەی بۆ تەرخان دەکرێت، کە هەشت ڕۆژ لەمەوەبر بە خاتوونی دۆقی مەزن ن... درابوو. داپیرە لەسیما و ڕووخساری وەك کەسێکی زاڵبوو لەسەر عەرشەکەی دەردەکەوت، بەشێوەیەکی تایبەت ئەمە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا بوو. هەر کەسێك ڕێکەوتی ئێمەی دەکرد ئەوا بەچاوەکانی دیقەتی دەدا، سڵی لەو نەدەکردەوە بەدەنگێکی بەرز پرسیاری لەبارەی

تـەواوی خەڵکەکـە دەکـرد. داپـیرە سـەلیقەیەکی بـەهێزی هـەبوو، هەرچـەندە ئـەم لەکورسـیەکەی جیـادەبووەوە، بـەڵام هەرکەسـێك دەیبینـــی دەیزانـــی درێـــژە وەك پیتـــی (أ) لەســـەر کورســـیەکە دانیشتووە، پشتی خۆی بەکورسییەکە نادات، سەر بـەرز رادەگـرێ، قژێکی سپی بەشەکی رووخساری رێك دەردەکـەون، ئـەو بەچـاوێکی لـەخۆبایی سـەیرت دەکـات، بـەڵام کاتێـك سـەیری دەکـەی دەزانـێ تێـڕوانین و جوڵـەکانی تـەواو سروشـتین و نوانـدن نییـە. هەرچـەندە لەتەمەنی حەفتا و پێنج ساڵی دیـە، کەچی هێشـتا شـتێك لـەجوانی رووخســـاری دەردەکـــەوێ، ددانـــەکانی هێشـــتا زۆر خـــراپ نـــین، کراسـێکی ئاوریشـمی ڕەشـی پۆشـیوە، کڵاوێکـی سـپی و بچـووکی لەسەرناوە.

مستەر ئاستلی کە لەتەنیشتەوە سەردەکەوت بە منگەمنگ وتی:

–زۆر سەرجم رادەکێشیێ.....

منیش لەدڵی خۆم دەمگوت" ئەو تەواو بە بروسکەکانی زانیـوە، دی گرێۆش دەناسـێ، بـەڵام وەك دەردەکـەوێ هێشـتا بلانـش ناناسـێ" هەر زوو ئەوەم بە مستەر ئاستلی وت.

بەشـەرمەوە ددان بـەوە دەنـێم، هەرکـە سەرسـامییەکەی یەکـەمم نەما، ئەوا هەستم بە خۆشی وشادییەکی گـەورە دەکـرد، لەبـەر ئـەو حاڵەتەی دوای کەمێکی دیکە بەسەر ژەنەڕاڵ دێـت، ئـەم هەسـتەیش کاریگەری لەسەر دەروونم هەبوو، تەواو بەدڵخۆشی هەنگاوم دەنا.



هاوڕێیانمـان لـه نهـۆمی سـێیهم بـوون، کاتێـك گهیشـتین، بـێ ئاگادارکردنهوه و بێ لهدهرگادان، دهرگاکانم لهسهر پشت کـردهوه، داپیره وهك سهرکهوتوویێك هاتـه ژورهوه. هـهموویان لـه وێ بـوون، وهك ئهوهی بهئهنقهست له ژوورهکهی ژهنهڕاڵ کۆبووبوونـهوه. کـات نزیکـهی نیـوهڕۆ بـوو، وهك دهردهکـهوت بـهنیازبوون پیاسـهیهکی بهکۆمهڵ بکهن، جا بهگالیسکهکان بێت یـان بهئهسـپ، میوانیشـیان ههبوو. له ژوورهکهی ژهنهڕاڵ جگه له ژهنهڕاڵ و پاولینا و منداڵهکان و خزمهتکارهکـــهیان، دی گریـــۆ، خـــاتوو بلانـــش تهنووریـــهکی سوارچاکهکانی پۆشیبوو، لهگهڵ بێوهژنهکهی دایکـی، مـیری کـورت، زانایهکی ئهڵمانی که جارێکی دیکه لـهلای ئـهوانم بینـی بـوو. هـهموو ئهمانه لهوێ بوون.

کورسیهکهی داپیره لهناوهڕاستی ژوورهکه، لـهدووری سـێ هـهنگاو له ژهنهڕاڵهوه دانرا. مهگهر خودا، ئهگینا ئهو کاریگهرییهم بیرناچـێ، که چوونه ژوورهوهی ئێمه دروستی کرد! کاتێك چـووینه ژووهرهوه ژهنـهڕاڵ شـتێکی دهگـوت، قسـهی لهگـهڵ دی گریـۆ دهکـرد. دهبـێ باسی ئهوه بکهم، دوو سێ ڕۆژه خاتوو بلانش و دی گریـۆ لـهدهوری میری بچووك دهخولێنهوه، به بهردهمی ژهنهڕاڵی داماو ئاهـهنگی بـۆ دهگێڕن. ههرههموویان جۆرێك شێوازی نواندنیان ئـهنجام دا، بـهڵام ڕووخـۆش وگـهرموگوڕ دهرکـهوتن. ژهنـهڕاڵ کاتێـك داپـیرهی بینـی وشهکهی دهمی تـهواو نهکرد، دهمـی بـهکراوهیی مایـهوه، چـاوهکانی

ئەبڵەق وەك ئـەوەی دێـوێکی بـۆ دەرکـەوتبێ، داپـیرەش بەهـەمان شێوە سەیری دەکرد بێئەوەی ورتەیەك بکات، بـەڵام سـەرکەوتووانە و گاڵتەجارییانە سەیری ژەنەراڵی دەکرد! بەم شێوەیە بۆ مـاوەی دە چـرکەیەك هـەردووکیان بەبێـدەنگی سـەیری یـەکتریان دەکـرد. لەسەرەتادا دی گریۆ پەشۆکا بوو، بـەڵام هێندەی نـەبرد ئەوپـەڕی نیگەرانی بەسیمایەوە دەرکەوت. خاتوو بلانش برۆکانی هەڵتەکانـد و دەمی کرابووەوە، وەك دەبـەنگێك سـەیری داپـیرەی دەکـرد. مـیر و زاناکە بە پەشۆکاوی سەیری دیمەنەکانیان دەکرد. مرۆ سەرسـامی و پەشۆکاوییەکی گەورەی لـە سیمای پاولینـا بـەدی دەکـرد، لـەناکاو وەك بەفر سـپی بـوو، دواتـر خـوێن لەرووخسـارییەوە دەردەکـەوت، سوور هەڵگەڕا. بەڵێ گەیشتنی داپیرە بۆ هـەموویان کارەسـات بـوو. من تەنها چـاوم بەسـەر داپـیرە و ئامـادەبووانی تـر دەگێـڕا، کەچـی مستەر ئاسـتلی وەك نـەریتی خـۆی، هـێمن و سـەنگین، دوورەپـەرێز وەستا.

دواجار داپیرە بێدەنگییەکەی ڕەواندەوە و وتـی:

-بـەڵێ... ئـەوەتا! خـۆم لـەبری برووسـکە هەواڵەکـە هـاتووم. پێشبینی هاتنی منتان نەدەکرد، ئەی وا نییە؟

- ئەنتۆنین ڤاسیلیڤنا، ئـەی پـورە چاکەکەم... ئـای لـەم ڕێکەوتـە!...



ژەنەراڵ بەم شێوەیە منگەمنگی کرد، ئەگەر داپیرە بۆ چەند چرکەیەکی دیکە بێدەنگ دەبوو، ئەوا ژەنەراڵ تووشی جەڵتە دەبوو.

–قسە لەسەر چ رێکەوتێك دەکەی؟ سواری شەمەندەفەر بووم هاتم، ئەی سوودی هێڵی ئاسنین چییە؟ ئێوە خەیاڵی ئەوەتان دەکرد، من تابووت لەماڵەکەم دێمە دەرەوە، میراتەکەتان بۆ جێدەهێڵم؟ من دەزانم تۆ بروسکەکانت دەنارد. لەوانەیە پارەیەکی زۆرت لە ناردنی بروسکە خەرج کردبێت، چونکە ناردنی بروسکە لێرەوە نرخەکەی هەرزان نییە، بەلأم من بوێرانە خۆم هاتم، وابزانم ئەمە فەرەنسیەکەیە؟ میسیۆ دی گریۆ؟

دی گریۆ وتی:

–بەڵی خانمەکەم، باوەڕ بکە من زۆر دڵخۆشم، زۆر دڵشادم، بەوەی تەندروستیت چاکبووەتەوە، ئەو پەرجوێکی ئێمە تۆ لێرە دەبینین، ئەم خەلأتێکی نایابە.

– بەڵی نایابە، من چاك تۆ دەناسم ئەی ئەکتەری گاڵتەجار، بەقەد سەرپەنجەیەك باوەڕت پێ ناکەم ( کاتێك وای گوت پەنجەکانی بەرز کردەوە) . ئەمە کێیە ( ئەم پرسیارەی کرد و ئاماژەی بۆ خاتوو بلانش کرد) وەك ئاشکرایە ئەم فەرەنسە بەجووڵە و هەڵسوکەوتی،



تەنورەکــەی، قامچیەکیشـــی بەدەســتەوەیە، ســەرنجی داپــیرەی ڕاکێشاوە.

داپیرە وتی:

–هیی ئێرەیە؟

وتم:

–ئەمە خاتوو بلانش دی کومێنگە، ئەمـەیش دایکیـەتی، لـە هوتێڵـە دابەزیوون.

خاتوونی پیرەژن بێپێچوپەنا وتی:

–شووی کردووە؟

من بەرێزێکی زۆرەوە، بە ئەنقەست ڕقێکم نیشاندا وتم:

–نەخێر کچە

– ئایا سەلیقەیەکی خۆشی هەیە؟

من لەپرسیارەکە نەگەیشتم.

–ئایا مرۆڤ لە هاوڕێیەتی ئەو هەست بـە بێـزاری ناکـات؟ بەرووسـی قسە دەکات؟ دی گریۆ ئەو کاتەی لە مۆسکۆ بوو، لەوچە لەوچی بـە هەندێك وشە دەکرد.



ئـەوەم بـۆ ڕوونكـردەوە، خـاتوو بلانـش هـیچ ڕۆژێـك نەچـووەتە ڕووسیا، داپیرە  لەپڕ ڕووی قسەكانی لە بلانش كرد و بێ پێشـەكی وتی:

—بەیانیت باش

— بەیانیت باش خاتوونەكەم

بەم شێوەیە بلانش وەڵامی دایەوە، ئەوپەڕی دڵشادی و مـەزنكردنی نواندن. لە ژێر نواندنی ئـەو ئەدەبە زۆرەوە، لـە هـەموو ئاماژەكـانی سـیماكانی، سەرسـامی لـەو پرسـیارە نامۆیـە و ئـەو هەڵسـوكەوتە ڕیزپەڕە بەدی دەكرا.

— ئۆی... ئەو كچە چاوەكانی دادەگرێ، ئەدەب دەنوێنێ، مرۆڤ هەر یەكسەر هەست دەكات، لەگەڵ چ جۆرە باڵندەیـەك مامەڵـە دەكـات: ئەكتەر یان شتێكی لەم جۆرە. من لەم هۆتێلە دابەزیوم، لـەخوارەوە نیشتەجێم ( دوایین ڕسـتەی وت و لـەناكاو ڕووی لـە ژەنـەڕاڵ كـرد). دەبینە دراوسێ، ئەمە دڵخۆشت دەكات یان نا؟

ژەنەڕاڵ وەڵامی دایەوە:

—ئۆی ... پووری... باوەڕ بكە هەست بەوپەڕی خۆشیی دەكەم.

ئـەو كاتـە ژەنـەڕاڵ هەنـدێك گـەڕابووە سـەرخۆی. وا بـە پێویسـت دەزانی بە دوای هەندێك ڕستەی گونجاو بگەڕێ بۆ ئـەوەی قسـەكانی كاریگەری هەبێت، بۆیە درێژدادڕی لە قسەكان دەكرد و دەیـوت: زۆر



ئازارمان چەشت، زۆر لەبەرێیەوە هەواڵانە دەلەرزین کە لەبارەی نەخۆشی تۆوە دەهاتن، برووسکەکان یەك لەداوی یەك، پەرۆشیان دەکردین.. لە ناکاو.

یەکسەر داپیرە قسەکانی پێ بڕی و وتی:

—تۆ درۆ دەکەی... درۆ دەکەی.

ژەنەراڵیش لەلایەن خۆیەوە قسەکانی ئەوی بڕی، بەشێوەیەك دەنگی بەرز کردەوە، گوایە گوێبیست نەبووە:

– چۆن بڕیارت دا سەفەرێکی لەم جۆرە بکەی؟ بێگومان تۆش لەگەڵم هاوڕای گەشتێکی لەم جۆرە، بۆ تەمەنێکی وەك تۆ، بۆ تەندروستی کەسێکی وەك تۆ... بەلایەنی کەمەوە، چاوەڕواننەکراوە، بۆیە سەیر نییە ئەگەر تووشی سەرسووڕمان بین. . بەلام ئێستا بەگەیشتنین زۆر دڵخۆشین، هەوڵ دەدەین هێندەی لە توانامان هەبێت( لێرە زەردەخەنەی کرد گوایە گوزارشت لە سۆز و کامەرانی خۆی دەکات) مانەوەکەت تا ئەوپەڕی بەچێژ بێت.

– واز لەو قسانە بهێنە، ئەم زۆر گۆتنەت بێ هودەیە، سوودێکی نییە، وەك نەریتی خۆت تەنها قسەی پڕوپووچ دەکەی. من خۆم دەزانم چاکترین کات بەسەربەرم. لەگەڵ ئەوەشدا من لە تۆ تووڕە نییم، چونکە من قین لەدڵ نیم... دەپرسی چۆن بڕیاری ئەو



گەشتەم داوە؟ ئەمە بابەتێکی زۆر سادەیە، بۆچی هەمووتان لەمە سەرسام بوون؟ پراسکۆڤیا بەیانیت باش. ئەوە چی دەکەی؟

پاولینا لێی نزیک بۆوە و وتی:

–بەیانیت باش داپیرە، ئایا گەشتەکەت زۆری خایاند؟

– بەلانی کەمەوە، لە بری ئەم هەموو ئاخ و داخە، ئەمە پرسیارێکە... ڕووداوەکە بەمشێوەیە بوو: من ماوەیەکی درێژ لەسەر جێگاکەم مامەوە، چارەسەری نەخۆشییەکەم دەکرا، دواتر هەموو دکتۆرەکانم دەرکرد، بەدوای خزمەتکارەکەی کلێسای نیکۆلام نارد، ژنێك کە هەمان نەخۆشی هەبوو، بەهەندێك گژوگیا چاکبووەتەوە، ئەم گیادەرمانە ئازارەکەی منی کەم کردەوە، ئەگەر دەتبینی لە ماوەیەکی کورت هەموو جەستەم لە ئارەقە شەلاڵ بووبوو. من هەڵسامەوە، دواتر ئەڵمانەکان هاتن، دوای ئەوەی چاویلەکەکانیان لەچاوکرد، دوای لە بابەتەکەیان کۆڵییەوە وتیان:(( ئەگەر سەفەرێك بۆ دەرەوە بکەم، بۆ ئەوەی چارەسەری بە ئاوی کانزایی وەربگرم، ئەوا داخرانی خوێنبەرەکان نامێنێ)) بەخۆم وت ( بۆ نا؟) هەموو ئەندامانی خێزان دەستیان کرد بە هات و هاوار و دەیانگوت(( تۆ شێتی دەچیتە ئەوێ؟ )) بەلام من بایەخم پێ نەدا.. بیستوچوار کاتژمێری نەخایاند، ئەوا کەلوپەلەکانم پێچایەوە ، ژنە خزمەتکارەکەو و پۆتاپیچ و دواتر فیدۆرم ئامادەکرد، ئەمەیان بۆ بەرلین گێڕایەوە، چونکە پێویستم پێی نەبوو. تەنانەت دەمتوانی



بەتەنیا سەفەر بکەم.... شوێنێکی تایبەتم لە شەمەندەفەرەکە گرت، دواتر لەهەموو وێستگەکانیش حەمباڵ هەیە، تۆ دە تەنها بیست کۆبکیان پێ بدە، ئەوا بۆکوێ دەچی هەڵدەگرن.

داپیرە قسەکانی تەواو کرد و سەیری دەوروبەری خۆی کردو وتی:

–شوقەیەکی جوانتان هەیە، ئازیزەکەم ئەم پارەیە لەکوێ دێ؟ ئەگەر مەزندەکەم دروست بێ، وا هەست دەکەم هەموو شتێکت کردووەتە بارمتە ئەم فەرەنسییە بچووکە کۆلێك پارەی لەلای تۆیە.. لەمن مەگرە، هەموو شتێك دەزانم... هەموو شتێك.

ژەنەراڵ گەیشتە ئەوپەڕی پەشۆکاوی:

–پورێ من سەرسامم.... من دەتوانم بێ سانسۆری کەسێك.... دواتر خەرجییەکانمان لەسەرووی داهاتەکانمان نییە... ئێمە لێرە....

–خەرجییەکانت لەسەرووی داهاتەکانتەوە نییە؟ تۆ زۆر بوێری..! لەوانەیە تۆ دوایین فەلسەفەی منداڵەکانت بردووە، کە تۆ راسپاردەی ئەوانی ..

ژەنەراڵ وتی:

–دوای ئەمە، دوای ئەم قسانەی دەیکەی.... نازانم

– چی نازانی؟ من وا گریمانە دەکەم تۆ واز لە رۆلێت ناهێنی! تەنانەت ئەگەر لەسەر حەسیرێکیش بێت!



ژەنەڕاڵ لەوپەڕی تەنگەتاوی بوو، خەریك بوو لە بەر هەڵچوونەکەی دەخنکا:

–من دەچمە ڕۆلیت؟ من؟ پیاوێك لەپێگەی من بێت ئەو کارە دەکات؟ وەرەوە سەرخۆت پوری... تۆ هێشتا چاك نەبوویتەوە!....

–ئەمانە هەمووی درۆیە! من گرەو لەسەر ئەوە دەکەم وازهێنانی ڕۆلێت لەلای تۆ مەحاڵە! تۆ تەنها خۆت هەڵدەکێشی... من خۆم ئەمرۆ دەچم بزانم ئەم ڕۆلیتە چییە؟ پراسکۆڤیا، باسی ئەو شوێنانەم بۆ بکە شایەنی بینینن، ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ یاوەریم دەکات... تۆش پۆتاپیچ لە لیستێك ناوی ئەو شوێنانە بنووسە کە سەردانیان دەکەین. چ شتێك شایەنی بینینە؟ (پرسیارەکەی بۆ پاولینا دووبارە دەکردەوە)

– لەم دەوروبەر شوێنەواری کۆشکە رووخاوەکە هەیە، جگە لەمەیش شیلانگ بێرگ هەیە.

– شیلانگ بێرگ چییە؟ دارستانە؟

–نەخێر شاخە، لووتکەیشی هەیە.

– لووتکە چییە؟...

– بەرزترین شوێنی چاپاکەیە، پەرژینی بۆ کراوە، دیمانەکان لەوێ زۆر نایاب و کەم وێنەن.



– دەتوانین بەکورسی سەربکەوین. ئایا ئەمە دەکرێ؟

من وتم:

–بەڵێ، دەتوانین دوو حەمباڵ بگرین.

لەناکاو فیدۆسیای خزمەتکار هات، سڵاوی لە داپیرە کرد، منداڵەکانی ژەنەراڵی هێنا بوو.

– ئای .... واز لەماچکردنی منداڵ بهێنن... من حەز لەماچکردنی منداڵان ناکات، هەموویان چڵمیان لە لووت دێتە خوارەوە... فیدۆسیا تۆ چۆن لێرە کات بەسەر دەبەی؟

فیدۆسیا وەڵامی دایەوە:

–ئێمە لێرە باشین، خاتوونە باشەکەمان ئەنتۆنین ڤاسیلیڤنا، تۆ چۆنی خاتوونە ئازیزەکەمان. زۆر بۆ تۆ دڵگران بووین. !

–دەزانم. بەلایەنی کەمەوە تۆ مرۆڤێکی، ناخێکی سادەت هەیە. ئەو هەموو خەڵکە مێوانی ئێوەن (جارێکی دیکە پرسیاری لە پاولینا کرد). ئەم پیاوە لاوازەی چاویلکەی داناوە کێیە؟

پاولینا بەدەنگێکی نزم وتی:

– ئەی داپیرەم ئەمە میر نلسکییە.

– ئا.. کەواتە ڕووسییە؟ من وامزانی لە قسەکانی ئێمە ناگات.. لەوانەیە گوێبیست نەبێ! پێشتر مستەر ئاستلیم بینیوە! بەلآم



ئەمەیش جارێکی دیکە ( داپیرە ئەمەی گوت سەیرێکی ئاستلی کرد)

بەپەلە سلاوی لە ئاستلی کرد و وتی: بەیانیت باش

مستەر ئاستی کەمێك چەمایەوە، بەلام شتێکی نەگوت.

داپیرە وتی:

-دەی... قسەیەکی خۆشم بۆ بکە... هەرشتێك بڵێ. قسەکانم وەربگێڕە پاولینا.

پاولینا قسەکانی وەردەگێڕا:

-من خۆشحاڵم، دڵخۆشم بەوەی بە تەندروستیەکی چاك دەتبینم.

مستەر ئاستلی بەجددی و بەلام بە نەرمونیانیەکی زۆر، وەڵامی دایەوە، ئەم قسانە بۆ داپیرە کرایە رووسی، دیار بوو، بەدڵی بوو.

داپیرە وتی:

-ئەم ئینگلیزانە هەردەم، بۆ هەموو شتێك وەڵامیان هەیە. نازانم بۆ ئینگلیزم خۆشدەوێ. لەهەموو تەمەنم ئەوانم خۆشدەوێ. ناکرێت بەراوردی ئەوان لەگەڵ فەرەنسییەکان بکەین! مستەر ئاستلی تکام وایە سەردانم بکەی، هەوڵ دەدەم بێزارت نەکەم، ئەو قسانەم تەرجەمە بکە، پێی بڵێ من لە نهۆمی یەکەم نیشتەجێ دەبم، نهۆمی



یەکـەم، تێگەیشـتی؟ ( داپـیرە ئـەم رسـتیەی کۆتـایی دووبـارە دەکردەوە و بە پەنجەکانی ئاماژەی بۆ زەوی ژوورەکە دەکرد).

مستەر ئاستلی بەم بانگێهشتە زۆر دڵخۆش بوو. خاتوونی بەساڵاچوو بەچاوی رەزامەندی سەیری پاولینای کرد، هـەر لەتـەوقی سـەرییەوە تا بنی پێی، دواتر لەناکاو وتی:

—ئەی پراسکۆڤیا من تۆم زۆر خۆشدەوێ. تـۆ کچێکی جوامێری. تـۆ لەهـەموویان باشـتری، خەسـڵەتێکت لـەو خەسـڵەتانە هەیـە، بەهـەرحاڵ، منـیش وەك تـۆم.... تۆزێـك بسـوورێ.... ئـەم قـژە خوازراوە...؟

—نا داپیرە، ئەمە قژی خۆمە!

— سوپاس بۆ خوا. من رقم لەو مۆدێلە هیچوپووچـە هەیـە. تـۆ زۆر جـوانی.. ئەگـەر گـەنج دەبـووم، ئـەوا دەکەوتمـە داوی عەشـقی تـۆ. بۆچـی شـوو ناکـەی؟ بـەڵام کـاتی ئـەوە هـاتووە بـڕۆین. دەمـەوێ کەمێك پیاسە بکەم، ئەم هەموو کاتـەم لـەناو شـەمەندەفەر بەسـەر بردووە....

دوات بە ژەنەراڵی وت:

—ها هێشتا تووڕەی؟

ژەنەراڵ ئارام بووبووەوە وتی:

—پورێ بەستیەتی.. تکایە... من لەوە دەگەم... لە تەمەنی تۆ...



دی گریۆ بە منگەمنگ وتی:

–ئەم پیرەژنە بۆ منداڵی گەڕاوەتەوە

داپیرە بە ژەنەڕاڵی وت:

–دەمەوێ هەموو شتێك لێرە ببینم؟ ماوەیەك بۆ من دەستبەرداری ئەلکیسی ئیڤانۆڤیچ دەبی؟

– هەر ماوەیەك دەتەوێ... بەڵام ئێمە هەموومان من و پاولینا و میسیۆ دی گریۆ... دڵخۆش دەبین بەوەی یاوەرت بین.

دی گرێۆ زەردەخەنەیەکی فریودەری کرد، بە کوشکێشی وتی:

– بەڵام خاتوونەکەم.. ئەمە بۆ ئێمە شادومانی ....

داپیرە قسەی پێ بڕی و وتی:

–ئەها... شادومانی .. ئازیزەکەم تۆ دەمهێنییە پێکەنین، بەهەر حاڵ، پارەت پێ نادەم ( ئەم قسەیەی کرد و ڕووی لە ژەنەڕاڵ کرد) بەرەو شوقەکەی خۆم بەرن، دەمەوێ سەیری بکەم، دواتر بە هەموو شوێنێك دەگەڕێین، هەڵم بگرن.

دووبارە داپیرە هەڵگیرایەوە، ئێمەش بەدوای کورسیەکەی وەك کەژاوەیەك هاتینە خوارەوە. ژەنەڕاڵ بەشێوەیەك دەڕۆیشت وەك ئەوەی دارعەسایەکی بەرسەری کەوتبێ. دی گریۆ لە بیرکردنەوە نقوم بووبوو، خاتوو بلانش سەرەتا ویستی لەژوورەکەی بمێنێتەوە،

دواتر وا بەباشتر زانی بەدوامانەوە بێت. میریش یەکسەر بەدوامان هات، کەسێك لە شوقەکەی ژەنەڕاڵ نەمایەوە، تەنها ئەڵمانییەکە و دی کۆمێنگی بێوەژن نەبێت.





# بەشی دەیەم

لە شارەکانی ئاوی کانزایی، لەوانەشە لە تەواوی ئەورووپا وا بێت، دەبینی بەڕێوەبەری هوتێلەکان، کاتێک شوقەیەک بۆ یەکێك لە میوانەکان هەڵدەبژێرن، ئیلهامی هەڵبژاردنەکەیان لە داوا و ئارەزووی میوانەکان وەرگرن، بەڵکوو بەپێی ئەو هەڵسەنگاندنەیە کە ئەوان بۆ میوانەکەیان هەیە. دەبێت ددان بەوەیش بنێین ئەوان زۆر کەم هەڵە دەکەن. ئەوان شوێنێکیان بۆ داپیرە تەرخان کردبوو، خوا دەزانێ بۆچی ئەم شوێنەیان هەڵبژاردووە، شوێنێکی لەڕادەبەدەر ڕازاوە: چوار ژوور بەکەلوپەلی نایاب ڕازاوەتەوە، لەگەڵ حەمام و چەند پاشخانێك بۆ خزمەتکارەکان، ژووری یاوەرەکان...هتد. خاتوونی دۆقی مەزن هەست بەڕاستی هەشت ڕۆژی لەم شوێنە بەسەر بردووە، بێگومان بە پەلە ئەم ڕووداوە بە میوانە نوێییەکان ڕاگەیاندراوە، بۆ ئەوەی بەها و شکۆیەك بەشوێنەکە بدرێت. پیرەژن بۆ هەموو ژوورەکان گوێزرایەوە، زۆر بەوردی دیقەتی ژوورەکانی





دەدا، خـودی بەڕێوەبـەری هوتێـل یـاوەری بـوو. ئـەم بەڕێوەبـەرە پیاوێکـە کـەمێك چـووەتە تەمەنـەوە. بـە ڕوویـەکی خـۆش یـاوەری داپیرەی دەکرد، ئەویش بە چـاوی خاوەنـدارێتی ژوورەکـانی بەسـەر دەکردەوە.

نازانم بە شازادەیان زانیوە. بێگومان ئـەوەیان بـە کەسـایەتیەکی زۆر بـەرز و زۆر دەوڵەمەنـد لەقەڵـەم داوە، بۆیـە بـە پەلـە لـەتۆماری میوانەکان: بەناوی خاتوونی ژەنەڕاڵ، شازادە پاراسـڤ شـیڤا تۆمـار دەکرا. هەرچەندە داپیرە بـۆ ڕۆژێکـیش شـازادە نـەبووە. بێگومـان زۆری خزمەتکار و شوێنە تایبەتەکەی ناو شەمەندەفەر و ئەو هـەموو کـۆڵ و جانتایـە، تەنانـەت سـندووقەکانیش ئەمـە وای کـردووە، بەشـکۆوە سـەیری شـازادە بکـەن، دواتـر ئـەو کورسـیەی لەسـەری دادەنیشێ، ئەو زمانەی لەگەڵ خەڵك پێی دەدوێ، دەنگی، پرسـیارە نامۆ و شازەکانی کە بێ سڵکردنەوە دەهاتەسەر زاری، تەنانەت هیچ وەڵامدانەوەیەك بەرگەی پرسیارەکانی نەدەگرت، کەسێتیە زاڵبـوو، توندەکەی، هەموو ئەمانە وایکرد، خەڵك بە شـکۆ و ڕێـزەوە سـەیری داپـیرە بکـەن. کاتێـك پـیرەژن بـەنێو شـوقەکە دەگێـڕدرا، لـەناکاو فرمانی دەکرد کورسییەکەی دابنێن. بۆ نموونە لەبەردەم کەلوپـەلێك پرسیارێکی دەکرد، هەرگیز لە خەیاڵی بەڕێوەبەر نـەبوو، بەڕێوەبـەر بە ڕێز و شـکۆوە زەردەخەنـەی بـۆ دەکـرد، کەچـی لەگـەڵ ئـەوەش بەڕێوەبەر دەلەرزی. پرسیارەکانی بە فـەڕەنسییەکی خراپ بوو، زۆر

جار دەبووایە من وەرگێڕانی بۆ بکەم، زۆربەی وەڵامەکانی بەڕێوەبەری بەدڵ نەبوو، وەڵامەکانیشی بە ناتەواو دەزانی، تەنانەت زۆرێك لە پرسیارەکانی بێ مانابوو، تەنها پێوەندی بە سەرگەرمییەکی ڕاگوزەر و خەیاڵە سەیرەکەی ئەو هەبوو، بۆ نموونە لە بەرانبەر یەکێك لە تابلۆکان وەستا، ئەم تابلۆیە کۆپیەکی لاوازی تابلۆیەکی ڕەسەن و بەناوبانگ بوو، بەرجەستەی یەکێك لە ئەفسانە یۆنانییەکان دەکات، داپیرە پرسی:

– ئەمە وێنەی کێیە کێشراوە؟

بەڕێوەبەر وتی:

–لەوانەیە وێنەی یەکێك لە خاتوونە کونتێسەکان بێت.

–چۆن؟ ئایا تۆ لەوە دڵنیا نیت؟ ئایا لێرە نیشتەجێی و دڵنیاش نیت؟ بۆچی ئەم وێنەیەت لەم شوێنە داناوە؟ بۆچی ئەو ئافرەتە وەك خێلێك دەڕوانێ.

بەڕێوەبەر لەتوانای نەبوو، وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بەجۆرێك بداتەوە، بەدڵی ئەو بێت، بۆیە دەشڵەژا.

داپیرە بەزمانی ڕووسی وتی:

–ئای لەم دەبەنگە؟

داپیرە دوورتر لەمە ڕۆیشت، ئەم بابەتە لەسەر پەیکەرێکی بچووك دووبارەبۆیەوە، داپیرە ماوەیەك لێی وردبووەوە، دواتر فرمانی کرد



پەیکەرەکە لە شوقەکە ببرێتە دەرەوە، کەس نازانێ بۆچی!
دواجار بەڕێوەبەر کەوتە بەر رێژنەی پرسیاران، نرخی مافورەکانی ژووری نووستن چەندە؟ لەکوێ دروستکراون؟ بەڕێوەبەر بەڵێنی پێدا پرسیاری بۆ بکات.

داپیرە بە منگەمنگ وتی:

–ئای لەم کەرە !

دواتر تەواوی سەرنجی خۆی خستە سەر قەرویڵەکە و وتی:

–ئەم چەترە چییە، وەك چەتری عەرشە..! دەی ... بیکەنەوە !

چەتری سەر قەرەویڵەکە لادرا.

–دەی هەروەها هەموو شتێك لێ بکەنەوە، بەرگە پشتییەکان، سەرپۆش و بەرگە لێفەکان هەمووی.

تەواو قەرەوێڵەکە سەرەوژێر کرا، داپیرە دیقەتی هەموو شتێکی دەدا.

– بەختی باشی من مێشوولە و پێشکە نییە. هەموو سەرپۆش و بەرگانە ببن، بەرگ و بالیفەکانی من دابنێن بەهەر حاڵ، ئەمە زێدەڕۆییە لە خۆشگوزەرانی، من کە لەم تەمەنەم پێویستم بە شوقەیەکی وەها نییە؟ مرۆڤ لێرە هەست بەبێزاری دەکات و بەتەنیایی دڵی دەگوشرێ! ئیڤان ئیڤانۆڤیچ، لەبیر نەکەی زوو زوو وەرە لام، هەرکە دەرزی منداڵەکان تەواو بوو.



-لە دوێنێوە من لە خزمەتی ژەنەڕاڵ کار ناکەم.

-بۆچی؟

-ماوەیەکە پیاوێکی ئەڵمانی لە بەرلینەوە هاتووە، خێزانەکەی لەگەڵ دایە، بە بارۆن دەناسرێت. دوێنێ لەکاتی پیاسە ڕێکەوتی ئەوانم کرد، بە ئەڵمانی قسەم لەگەڵ کردن بێئەوەی بزانم شێوەزاری بەرلینی بەکاربهێنم.

- دواتر ؟

- ئەمە بە بێئەدەبی دانرا، لەلای ژەنەڕاڵ سکالای کرد، ژەنەڕاڵیش یەکسەر منی لەکارەکەم دەرکرد.

- بەڵام بۆچی، تۆ جنێوت بەم بارۆنە داوە؟ وا دەبنێ ئەمەت کردووە، ئەمە زیانێکی گەورەی نییە !

- بە پێچەوانەوە، بارۆن دارعەساکەی لەمن بەرزکردەوە.

پیرەژن لەناکاو رووی لە ژەنەڕاڵ کرد:

-تۆ ئەی چڵمن چۆن ڕێگە بە بارۆن دەدەیت بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ مامۆستای منداڵەکانت بکات؟ دواتریش سەرەڕای ئەمە لەکارەکەی دەردەکەی؟... ئێوە وا دەبینم هەمووتان هیچن، بەکەڵکی شتێك نایەن.

ژەنەڕاڵ بەزمانی هۆگربوون و خۆبەزلزانی وتی:



-پوریَ نیگەران مەبە، دواتر من دەتوانم بەخۆم کارەکانم مەیسەر بکەم، دواتر ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ وێنەیەکی دروستی بۆ تۆ نەگێڕایەوە.

داپیرە وتی:

-چۆن بەرگەی ئەمەت گرت؟

سادەیی و هێمنییەکی زۆرم نواند:

-داوام کرد زۆرانبازییەکی لەگەڵ بکەم، بەڵام ژەنەڕاڵ ڕێگەی نەدا.

داپیرە پرسی:

-بۆچی؟

دواتر ئاوڕی لە بەڕێوەبەرەکە دایەوە و وتی:

-ئازیزم تۆ بڕۆ لای کاری خۆت، کاتێك ویستم بانگت دەکەم

دواتر وتی:

-من بەرگەی بینینی خەڵکی نۆرنبێرگ ناگرم، کە دەموچاویان لەسەرخۆش دەچێ.

بەڕێوەبەر سڵاوێکی نواند و ڕۆیشت، بێگومان بێئەوەی لەم توانجە بگات.

ژەنەڕاڵ پێکەنینێکی بچووکی کرد و وتی:



–ببووره پوریٚ... شەڕەشمێر کارێکی گونجاوە؟

–بۆچی نا؟ پیاوان وەك کەڵەشێرن، هەر دووك دەکوژران، بابەتەکە کۆتـایی دەهـات، بـەلاّم ئێـوە مریشـکی تـەڕن، ئەمـە ڕوونـە، ئێـوە نـاتوانن بـەرگری لـە شـەڕەفی ولاّتەکـەتان بکـەن. ئێسـتا بـەرزم بکەنەوە. پۆتاپیچ! تۆ فەرمان بکە هەردەم دوو کەس لەخزمەتی من بێت، دوو کەس دەستنیشان بکە و مەرجەکانت دیار بکە، تـەنها دوو کەس، بەلاّم دەبێت تەنها لە کاتی قاندرمەکان هەلّم نەگرن، بـەڵکوو لەزەوی تەختایی و لە جادەکانیش، ئەمەیان بۆ ڕوون بکەوە، بەشێك لـە کرێیەکـەیان پێشـەکی پـیٚ بـدە، بـەم شـێوەیە ئـەدەبی زیـاتری تێدایە، تۆش هەردەم لـەنزیك مـن دەمینێتـەوە. تـۆ ئـەی ئەلێکسـی ئیڤانۆڤیچ، لەکاتی پیاسەکە ئـەم بارۆنـەم نیشان دەدەی، بەلایـەنی کەمەوە دەبێت بـزانم ئـەم فـۆن بارۆنـە کێیـە. دەی بـا بـڕۆین! ئـەم ڕۆلێتە لەکوێیە؟

من ئەوەم بۆ ڕوون کردەوە، مێزەکـانی ڕۆلێـت لـە هـۆلّی گازینۆکـان هەیە. بەمەیش منی دایـە بـەر ڕێژنـەی پرسـیاران:(( ئایـا زۆر مێـزی ڕۆلێت هەیە؟ ئایا خەلّێکی زۆر یاری دەکەن؟ ئایا قومارکردن تەواوی ڕۆژ بەردەوام دەبێت؟ ئاستەکانی چۆنە؟ ..)) دواجـار بەمـە وەلاّمـم دایـەوە وا باشـترە، بەچـاوەکانی خـۆی هـەموو ئـەو شـتانە ببینـیٚ، چونکە وەسفکردن بەمشێوەیە کارێکی ئەستەمە.



–باشه، هەڵم بگرن یەکسەر من ببنە ئەوێ. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ تۆ پێشمان بکەوە.

–ئەمە چۆن دەکرێ پوریێ؟ تۆ سەرت بەپێی پێویست حەسایەتەوە؟

ژەنەراڵ بەم شێوەیە بە نەرمونیانی و بەپاڕانەوە پرسیاری دەکرد.

ژەنەراڵ تۆزێك پەشۆکابوو، لەسیمای هەموویان تۆزێك شڵەژان بەدی دەکرێت، سەیری یەکتریان دەکرد. لەوانەیە تەنها ئەوە نیگەران و شەرمەزاریان بکات، داپیرە بچێتە گازینۆ. ئەمەش ڕەفتارێکی ڕیزپەر بە بەرچاوی خەڵکەوە، لەگەڵ ئەمەیش پێشنیازیان کرد باوەری بکەن.

–بۆچی بحەسێتمەوە؟ من ماندوو نیم، تەواوی پێنج ڕۆژ نەجوڵاومەتەوە. دواتریش دەچینە لای کانیاوی ئاوە کانزاییەکان و ئاوە گەرمەکان. دوای کانیاوەکانیش دەچینە ئەو شوێنە ... پراسکۆڤیا بە چی ناوت برد... لووتکە.. ناوەکەی ئەمە بوو؟

–بەڵێ داپیرە.

–دەچمە لووتکە. چیتر لێرە هەیە؟

پاولینا بە شڵەژاوی وتی:

– زۆر شت هەیە.



–باشە. تۆ شتێك دەزانی. مارتا تۆش لەگەڵم وەرە.

بەمشێوەیە داپیرە قسەی لەگەڵ خزمەتکارە یاوەرەکەی کرد.

ژەنەراڵ لەناکاو بە نیگەرانی وتی:

–بەلآم پوری بۆ دەتەوێ ئەم ژنە یاوەریت بکات؟ ئەمە مەحاڵە، تەنانەت من گومان هەیە رێگە بە پۆتاپیچ بدرێت بۆ بچێتە ناو گازینۆکە.

– قسەی قۆڕ، ئەی رێگەی بدەین لەدەرەوە بمێنێتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی خزمەتکارە؟ ئایا بوونەوەرێکی زیندوو نییە؟ هەشت رۆژە بەرێگەوەین، ئەمیش حەز دەکات شتێك ببینێ. ئەگەر لەگەڵ من نەبێت لەگەڵ کێ دەبێت. ئەم ژنە بوێری نییە یەك هەنگاو بەتەنیا لە شەقامەکان بڕوات!

–بەلآم داپیرە...

– لەوانە تۆ شەرم بکەی یاوەرییم بکەی. تۆ کەیفی خۆت لە شوێنی خۆت بە، من داوای شتێکت لێ ناکەم، ژەنەراڵ! کەسایەتیەکی مەزنی! منیش خاتوونی ژەنەراڵم! دواتر من پێویستم بەوە نییە ئەو هەموو خەڵکە بەدوامەوە بێت، من هەموو شتێك بە یاوەری ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ دەبینم.....

بەلاّم دی گرێو پێداگری لەوە کرد هەموویان یاوەری بن، بەمەش لەبارەی چێژی یاوەرییەکەی چەندان ڕستەی جوانی دەردەبڕیً... هەموو یاوەریان کرد.

دی گرێو چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە و بە ژەنەڕاڵی وت:

–گەڕاوەتەوە سەردەمی منداڵی .. ئەگەر بە تەنیا جێی بهێڵێن لەوانەیە کارێکی دەبەنگانە ئەنجام بدات....

گوێبیست نەبووم دوای ئەوە چی وت، بەلاّم بێگومان ئەو بیرۆکەیەکی لە زەین بوو، لەوانەشە ئومێدێکی بۆ گەڕابێتەوە. گازینۆکە نزیکەی پێنج سەد مەترێك لە ئێمەوە دوور بوو. بەناو داربەڕووەکان تێپەڕین دواتر گەیشتنینە بازنەکە، لەویً سووڕاینەوە یەکسەر چووینە ناو گازینۆکە. ژەنەڕاڵ تۆزێك نیگەرانییەکانی نەمابوون، چونکە کەژاوەکەمان سەرەڕای نامۆییەکەی، بەشێك لە شکۆ و ویقاری تێدابوو. سەرەڕای ئەمەیش شتێکی نامۆ نییە، کەسێکی نەخۆش کە تووشی بێهێزی و ئیفلیجی بووبێت، بێتە شاری ئاوەکانزاییەکانەوە، جگە لەمەیش پیرێکی بەساڵاچووە، بۆچی ژنێکی وەها دەچێتە رۆڵێت؟ خاتوو پاولینا و بلانش لە تەنیشت کورسیە جوڵەوەکە دەڕۆیشتن، خاتوو بلاّنش پێدەکەنی، جۆرێك لەسەرگەرمی شاراوەی هەبوو، جار جارەش هەندێك گاڵتەوگەپیان لەگەڵ داپیرە دەکرد، دواجار داپیرە هەندێك ستایشی دەکرد. پاولینا لە لایەکەی دیکەی کورسییەکە بوو. بە پرسیارە



بەردەوامەکانی داپیرە شڵەژا بوو، پرسیارەکانیش لەم جۆرە بوون: ئەمە کێی بوو تازە بینیمان؟ ئەو ئافرەتەی بەسەر گالیسکەکەوەیە کێیە؟ ئەم شارە گەورەیە؟ ئایا باخچەکە زۆر فراوان و بەربڵاوە؟ ئەم دارانە چین؟ ئەم شاخانە ناویان چییە؟ ئایا لێرە شەهێن هەیە؟ ئەم سەریانە پێکەنیناوییە چییە؟ مستەر ئاستلی کە لە تەنیشتم دەڕۆیشت بە منگەمنگ وتی: من ئەو بەیانییە پێشبینی زۆر شت دەکەم.

پۆتاپیچ و مارتا تەواو لەدوای کورسییەکە دەڕۆیشتن: پۆتاپیچ جلێکی ڕەسمی پۆشی بوو، لەگەڵ بۆیانباغێکی سپی، کڵاوێکی جۆری کاسکێتی لەسەر بوو، کەچی مارات کە تەمەنی نزیکەی چل ساڵ دەبوو، دوو کوڵمی سوری هەبوو، قژی ماشوبرنج بوو، کڵاوێکی لەسەر بوو ، کراسێکی جۆری ئاوریشمی هیندی پۆشیبوو، دوو پێڵاوی پێستی بزن لەپێیەکانی بوو کە قرتە قرتی دەکرد. داپیرە زۆر ئاوڕی لە مارتا دەدایەوە و قسەی لەگەڵ دەکرد. ژەنەراڵ و دی گریۆ تەواو لەدوای ئێمەوە بوون، گفتوگۆیەکی گەرمیان لەنێوان بوو، ژەنەراڵ تەواو تۆقیبوو، لەوە دەچوو دی گریۆ هەوڵ بداتە هێز بداتەوە بەر هاوەڵەکەی ، زۆر ڕوون بوو هەندێك ئامۆژگاری پێ دەدا. داپیرە قسەی یەکلاکەرەوەی بە دی گریۆ دابوو (هەرگیز پارەت پێ نادەم) لەوانەبوو دی گریۆ ئەم قسەیەی بە ڕاستەقینە نەزانی بێت، بەڵام ژەنەراڵ بەتەواوی داپیرەی خۆی دەناسی. من



تێبینی ئەوەم کردبوو دی گریۆ و بلانش بەردەوام بەدزییەوە نیگای یەکتریان دەکرد، میر و پیاوە ئەڵمانییەکە دواجار ڕێگەیان بە ئێمەدا تا بۆ ناو گازینۆیەکە پێش بکەوین.

وەك لەشکرێکی سەرکەوتوو چووینە ناو گازینۆکە، پیاوە سویسرییەکە و دەرگەوانەکە بەهەمان شێوەی خزمەتکارەکانی هوتێل ڕێزیان دەنواند، لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرسامی سەیری ئێمەیان دەکرد. سەرەتا داپیرە فرمانی ئەوەی کرد، بە هۆڵەکانی گازینۆکە بگەڕێین، هەندێك جار دەکەوتە ستایشکردن و هەندێك جاری دیکەش بێباکانە بایەخی بە شتەکان نەدەدا، بەڵام پرسیاری لەهەموو شتێك دەکرد. دواجار گەیشتینە هۆڵی قومارکردن، کاتێك دەرگەوانی هۆڵەکە ئێمە بینی ، بەسەرسامییەوە دەرگاکەی خستە سەرپشت.

دەرکەوتنی داپیرە لە هۆڵی رۆلێت، کاریگەرییەکی قووڵی بەسەر ئەو خەڵکەوە هەبوو، کە دەوری مێزەکانی رۆلێتیان دابوو لەلایەکی هۆڵەکەوە. مێزی یاری (چل و سێ) دانرابوو، نزیکەی سەد و پەنجا قومارچی لەوێ دەورەیان دابوو، ئەوانەی توانیبوویان بگەنە سەر مێزەکە، سووربوون لەوەی لەشوێنی خۆیان بمێننەوە. وا ڕاهاتبوون، واز لەشوێنی خۆیان نەهێنن، تا دوا درهەمی خۆیان دەدۆڕێنن. ڕێگە بەکەسێك نادرێت لەو شوێنە تەنها بینەر بێت، شوێنەکە بەخۆڕایی بە یاریزان دەدرێت، هەرچەندە کورسی ڕیزکراوە، بەڵام تەنها ژمارەیەکی کەمی قومارچییەکان دادەنیشن،



بەتایبـەتی کاتێـك خـەڵکێکی زۆر لـەوێ بێـت، چـونکە وەسـتان شـوێنێکی کـەمتر دەگرێـت نـەوەك دانیشـتن، جیـا لەمـەش کەسێك وەستا بێت بە ئاسانی یاری دەکات، نـەوەك دانیشـتووان. خـەڵك لـە ریـزی دووەم و سـێیەم ئاپوورەیـان دروسـت کـردووە، چـاوەڕوانی نۆرەی خۆیان دەکەن، بەڵام هەندێك جار ئۆقرەیان نامێنێ، دەبینـی دەستی خۆیـان لـەنێو یاریزانـەکانی ریـزی پێشـەوە رەوان دەکـەن، پارەکـەی خۆیـان دادەنـێن، تەنانـەت ئەوانـەی لـەریزی سـێیەمیش وەستاون، بەمشێوەیە هەوڵ دەدەن پارەی خۆیان بخەنە سەر مێزە سەوزەکە. هەر لەبەر ئەمەشە پێنج یان دەخولەکێك مرۆڤ گوێبیستی دەمـەقاڵێ دەبێـت بـەدەوری مێزەکـەوە. پۆلیسـی نـاو گـازینۆ زۆر بەرێکوپێکی رێکخراون، لەگەڵ ئەوەشدا نـاتوانن هـەراو هۆریـای نـاو هۆڵەکە قەدەغە بکەن، تەنانەت زۆر حەز دەکەن قەرەباڵغییەکـە زۆر بێـت، چـونکە لەبەرژوەنـدی ئەوانـە. جگـە لـە پۆلیسـەکان هەشـت فەرمانبەر لە دەوری مێزی یاری دانیشتوون، زۆر بە وریایی چاودێری یارییەکە دەکەن، هەر ئـەوان قازانجـەکان دەدەن، ئەگـەر کێشـەیەك دروست بوو، ئەوان کێشەکە یەکلادەکەنـەوە، بـەڵام یەکسـەر بـانگی پۆلیس ناکەن، تەنها لەوپەڕی ناچاری نەبێت. پیاوانی پۆلیس لەناو هۆڵەکە جلی مەدەنی دەپۆشن، لەگـەڵ تەماشـاکەرانیش دەوەسـتن، تەنانـەت مـرۆڤ نـاتوانێ لەخـەڵکی ئاسـاییان جیـا بکاتـەوە. ئـەو پۆلیسـانە چـاودێری دزە بچـووك و دزە شـارەزاکان دەکـەن، کـە ژمارەیان لە رۆڵێتەکان زۆرە، کاریان لەم جۆرە هۆڵانە زۆر ئاسانە!



دزیکردن لـه شـوێنەکانی دیکـە پێویسـتی بـە گیرفـانبڕین و قوفـڵ شکاندن هەیە، لـەکاتی سـەرنەکەوتینش لەدزییەکـە سەریەشـەی بـۆ دزەکـە زۆردەبێـت. کەچـی لێـرە تـەنها دزەکـە لـە رۆلێتەکـە نزیـك دەبێتەوە، وەك ئەوەی قومار بکات، دواتر لەناکاو بـێ پـێچ و پـەنا، بەبەرچاوانەوە دەست بۆ قازانجەکـەدەبات و دەیخاتـە گیرفانییـەوە، ئەگەر نـاڕەزایی دروسـت بـوو، دزەکـە بـەدەنگێکی زۆر بـەرز هـاوار دەکات گوایە ئەو براوەیە و قازانجەکە هی ئەوە، هەرچـەندە شـاهێد هـەبێت، ئـەوا ئـەو زۆرجـار دەتـوانێ پارەکـە ببـات، بەتایبـەتی ئەگەرهاتوو پارەکە زۆر نـەبوو، ئـەگینا لیژنـەی هەڵسـەنگاندن یـان یاریکەری تر تێبینی دەکات. بەڵام ئەگەر پارەکە ئەوتۆ نەبوو، ئەوا براوەی ڕاستەقینە لەبەر ئابڕووی خـۆی لـە یارییەکـە دەکشـێتەوە، واز لەدەمـەقاڵێ دەهێنـێ. ئەگـەر هـاتوو بەتـەواوی پـەردە لەسـەر ڕووخساری دزەکە لادرا، ئەوا یەکسار بێ نـەرمی نوانـدن لەیارییەکـە دەکرێتە دەرەوە.

داپیرە لە دوورەوە، بە پەرۆشی تێبینی هەموو ئەو شتانەی کـرد، زۆر دڵخۆش دەبـوو کاتێـك دزێـك دەردەکـرا، یـاری چـل وسـێی زۆر بەدڵ نەبوو، بەڵکوو شێت و شەیدای رۆلێـت بـوو. بەتایبـەتی کاتێـك تۆپەکە دەخولایەوە. دواجـار ویسـتی یارییەکـە لەنزیکـەوە ببینـێ. هـەر زوو خزمـەتکارەکان وکەسـانی دیکـە (بەتایبـەتی پۆلۆنییـەکان قومـار وێرانـی کـردوون، ئـەوان خزمەتـەکانی خۆیـان پێشکەشـی

قومارچییە سەرکەوتووەکان دەکەن، بەتایبەتی بێگانەکان) زۆر بە پەلە هاتن شوێنێکی تایبەتیان بۆ فەرمانبەرە سەرەکییەکە دابین کرد، کورسییەکەیان بەرەو ناوەوەی ئاپوورەکە راکێشا، ئەمانەش زۆرێك بوون لە میوانانەی یاری ناکەن تەنها تەماشاکەرن (زۆربەشیان ئینگلیزن لەگەڵ خێزانەکانیان) قەرەباڵغییەکە زۆرتر بوو، دەیانویست بەسەر سەری قومارچییەکانەوە داپیرە ببینن، سەرپەرشتیارەکان ئومێدێکی زۆریان بە داپیرە هەبوو: ئافرەتێك تەمەنی لەسەرووی حەفتا ساڵەوە، ئیفلیج، دەیەوێ قومار بکات، ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە کەم رووداوە، منیش خۆم خزانە ناو خەڵکەکەوە تا لەنزیك داپیرەوە وەستام، کەچی پۆتاپیچ و مارتا لەناو خەڵکەکە مانەوە، ژەنەراڵ و دی گریۆ و پاولیناش هاتنە ریزی تەماشاکەرانەوە.

سەرەتا داپیرە سەری یاریکەرەکانی دەکرد، کە دەوری مێزەکەیان دابوو، بەچرپەوە پرسیاری لێ دەکردم: ( ئەم پیاوە کێیە؟) ( ئەو ژنە کێیە؟) زۆر بایەخی بە گەنجێکی بچووك ددا، کە لەوسەری مێزەکەوە بوو بە پارەیەکی زەبەلاح یاری دەکرد، بەهەزاران فرنکی دادەنا، کاتێك بردییەوە، ئەوا دراوسێیەکانی مۆریان لێ دەکرد، نزیکەی چل هەزار فرانك لە لیرەی زێر و پارەی کاغەز لەبەردەم کەڵەکە ببوو. گەنجەکە رەنگی بزرکابوو، چاوانی سوور ببوو، دەستەکانی دەلەرزی، پارەکانی بێ هەژمارکردن دادەنا، چەنگی لێ



گیر دەکرد و دەیبردەوە، خزمەتکارەکان بەدەورییەوە هاتوچۆیان دەکرد، یەکێك کورسی بۆ دادەنا، یەکێك شوێنەکەی بۆ فراوان دەکرد، بۆ ئەوەی بەئاسوودەی جوڵە بکات و خەڵك سەرقاڵی نەکەن. .. هەموو ئەمانەش بۆ وەرگرتنی پاداشت بوو. زۆرێك لەو قومارچیانەی سەرکەووتوون بێشومار پارەیان پێ دەدەن، چنگ لەگیرفانیان گیر دەکەن، وەك بەخشش پارە بەو خزمەتکارانە دەدەن. لەتەنیشت گەنجە پیاوێکی پۆڵۆنی هەبوو، لەشوێنی خۆی ئۆقرەی نەدەگرت، بەردەوام بەرێزەوە سەرقاڵی دەکرد، ئامۆژگاری پێ دەدا، بێگومان بۆ ئەوەی پاداشتێك وەربگرێ، بەڵام گەنجە قومارچییەکە بایەخی پێ نەدەدا، بەڕاست و بەچەپ هەرەمەکی پارەی دادەنا، کەچی هەر پارەی دەبردەوە، دیار بوو عەقڵی لەسەر نەما بوو.

داپیرە سەرنجی دایە ئەو گەنجە و نوقرچکەیەکی لەم دا وتی:

–پێی بڵێ واز بهێنێ، پێی بڵێ پارەکەی کۆبکاتەوە و بڕوات. دواتر دەدۆڕێ، دەدۆڕێ لەهەر چرکەساتێك بێت.

بەهەناسەبڕکێ و هەڵچوونەوە گوتی:

–پۆتاپیچ لەکوێیە؟ بینێرنە لای من. بۆچی تۆ پێی ناڵێی؟ پێی بڵێ بڕوا (ئەمەی دەگوت نوقرچکەی لێ دەدام) کوا پۆتاپیچ؟ بڕۆ دەرەوە، بڕۆ (هاواری دەکرد بۆ ئەوەی گەنجەکە بڕوات).



بە چرپەوە پێم وت، ڕێگەنادرێت لێرە بەمشێوەیە هاوار بکات، تەنانەت قسەکردن قەدەغەیە تەنها بەچرپەوە نەبێت، چونکە قسەکردن کاری هە ژمارکردن تێك دەدا، ئەگینا لە هۆڵەکە دەرمان دەکەن...

- بەداخەوە..! هیچ بواری نییە ئەم پیاوە لەناو دەچێ. بێگومان خۆی ئەم ئەنجامەی دەوێ... ناتوانم سەیری بکەم، چاوی خۆم لەسەر لاداوە، ئای لەم دەبەنگە !

داپیرە ئەمەی وت و یەکسەر ڕووی خۆی وەرگێڕا. لەوسەر، لەلای دەستە ڕاست، لەنێو یاریکەرەکان خانمێکی گەنج هەبوو، پیاوێکی لەشێوە کورتەبالآی لەگەڵ دابوو. ئەم کورتەبالآیە کێیە؟ نازانم... ئەمە یەکێکە لە خزمەکانی ، یان هێناویەتی سەرنجی خەڵك رابکێشێ؟ من پێشتر دیقەتی ئەو خانمەم دابوو، هەموو ڕۆژێك دێتە گازینۆکە، کاتژمێر یەك دێت و دووی ڕێك دەڕوات. خەڵکەکە دەیناسن، هەر زوو کورسیان بۆ دانا، لەگیرفان چەند پارەیەکی زێر و چەند پارەیەکی کاغەزی هەزار فرنکی دەردەهێنێ. بەسارد و سەنگینی یاری دەکات، ژمارەکان لەسەر کاغەزێك تۆمار دەکات، هەوڵ دەدات سیستەمی دەرچوونی ئەگەرەکان ئاشکرا بکات، سەرکێشی بە پارەی زۆر دەکات، هەموو ڕێژێك هەزار یان دوو سێ هەزار فرانکێك دباتەوە، لەمە زیاتر نا، بۆیە پاشکشە دەکات و دەڕوات. داپیرە ماوەیەکی زۆر بوو چاودێری کردبوو.



–ئەم ژنە نادۆڕێنیّ، نادۆڕێنیّ، ئایا دەزانی؟ ئەم ئافرەتە کێیە؟

بەمۆڕەکردنەوە وتم:

–ژنێکی فەڕەنسییە، لەوانەیە لەم جۆرە ژنانە بێت کە .....

–لە فڕینەکەی دیارە چ باڵندەیەکە، لەوانەیە چرنووکەکانی تیژ بێت..... ئێستا بۆم ڕوون بکەوە، هەر خولێك مانای چییە و پارە چۆن دادەنرێت.

منیش بەپێی توانا یارییەکەم بۆ داپیرە شیکردەوەن، لەگەڵ جووتکردنی یارییەکە کە لەژماردن نایەت: سوور و ڕەش، تاك و جووت... هتد. دواتریش هەندێك بابەتم سەبارەت بەسیستەمی ژمارەکان بۆ ڕوونکردەوە. خاتوونی پیرەژن بەوردی گوێی لەقسەکانم گرتبوو، هەموو قسەکانمی ئەزبەر کردبوو، لەگەڵ پرسیارکردنیش تێگەیشتنی باشتر دەبوو. بۆیە ئاسان بوو، هەر نموونەیەکی پارەدانانی بۆ شی بکەمەوە، ئەمەش وانەیەکی ئاسان بوو، داپیرە زۆر بەمە دڵخۆش بوو.

–سفر مانای چییە؟ ئەو سەرپەرشتیارە سەرەکییە، کە قژێکی ئاڵۆزی هەیە، تازە هاواری کرد و وتی: سفر. بۆ کەسێك لەسەر مێزەکە پارەی نەبردم، هەموو پارەکەی بۆخۆی برد؟ ئەمە مانای چییە؟

وتم:



-داپیره، سفر واتای براوەکە بانکە. ئەگەر تۆپەکە لەسەر سفرِ وەستا ئەوەی لەسەر مێزەکە هەیە هەمووی بۆ بانك دەبێت، بۆیە جارێکی دیکە یارییەکە دەست پێدەکاتەوە، بانکیش هیچ پارەیەك نادات.

- سەیرە... کەس هیچ وەرناگرێت..!

- ئەگەر تۆ پێشتر پارەت لەسفرِ دانابێ، ئەوا ٣٥ جار بەقەد پارەکەی خۆت زیاترت پێ دەدەن.

- سیوپێنج جار؟ ئایا سفرِ زۆر دەردەچێ؟ بۆ ئەو گێلانە پارەکانیان لەسفرِ دانانێن؟

- چونکە سیوشەش ئەگەری پێچەوانەی سفرِ هەیە، ئەی داپیرە !

- ئای لەم قسە قۆرِە، پۆتاپیچ! سەیر بکە، من هەندێك پارەم لایە، ئەو پارەیە ببە( تورەگەیەکی هەلآوساوی دەرهێنا، منیش فردرِێکێکم دەرهێنا). ئەو پارەیە ببە لەسەر سفرِ دایبنێ.

- بەلآم تازە سفرِ دەرچوو، جارێکی دیکە دەرناچێتەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر نەبێت، تۆ سەرکێشی دەکەی، تۆزێك دان بەخۆت بگرە.

-چاوەروان نابم، قسەی قۆرِ مەکە، دای بنێ.

– ڕێگەم بدە. سفرِ بەر لە ئێوارە جارێکی تر دەردەچێتەوە، تەنانەت ئەگەر بۆ هەزار جاری تریش دای بنێی. ئەمە شتێکە هەموومان دەیزانین.

–قسەی قۆڕ، قسەی قۆڕ.. ئەوەی بچێتە جەنگەڵ لە گورگ ناترسێ. چی؟ ئەگەر دۆڕام؟ جارێکی دیکە دای بنێوە.

جاری دووەم و تەنانەت جاری سێیەمیش دۆڕاندمان. داپیرە خەریك بوو لەشوێنی خۆی ئۆقرەی نەدەگرت، بەچاوەکانی لەجوڵەی تۆپەکەی دەڕوانی. دواجار نەیتدەتوانی بەسەر خۆی زاڵ بێت، و هێمنی خۆی بپارێزێ. تەنانەت کاتێك یەکێك لە فەرمانبەرەکان لەبری سفری چاوەڕوانکراو هاواریکرد سی و شەش، داپیرە مشتەکۆڵیەکی لەمێزەکە دا.

داپیرە بەدڵشکاوی وتی:

–دەی .. قەیناکە.. ئەو سفرە نەفرەتییە بەم نزیکانە دەردەچێ ! باشترە لە ناو بچم، نەوەك چاوەڕوان بکەم تا سفرِ دەردەچێ ! خەتاکەی هی ئەو سەرپەرشتیارە قژ ئاڵۆزکاوەییە، سفرِ هەرگیز لەگەڵ ئەو دەرناچێ. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ دوو پارە بەیەکەوە دابنێ ! ئەوەی تۆ داتناوە کەمە، ئەگەر سفرِ دەربچێ، شتێکی ئەوتۆ نابەینەوە.

– داپیرە !



– دابنیّ، خۆ پارەکە هی تۆ نییە!

دوو فردریکم دانا، تۆپەکە بۆ ماوەیەکی درێژ غلّ دەبۆوە، دواتر بەسەر ژمارەکان تێپەردەبوو، داپیرە خۆی بە قۆلّی من هەلّواسی و لەناکاو....

–سفرِ

بەهەمان شێوە سەرپەرشتیارەکەش رایگەیاند.

داپیرە بە جۆش و خرۆشەوە رووی لەمن کرد:

–بینیت؟ بینیت؟ من پێم وتی سفرِ دەردەچیّ... پێم وتی.. خوا خۆی ئەوەی خستە دلّمەوە دوو پارەی زێرِ دابنێم. چەند وەردەگرم؟ بۆچی پێمان نادەن؟ پۆتاپیچ، مارتا! ئەوە لەکوێیە؟ هاوەلّەکانی ئێمە لەکوێن؟ پۆتاپیچ، پۆتاپیچ!

بە بۆلّەبۆلّەوە وتم:

–هەر ئێستا، داپیرە. پۆتاپیچ لەبەر دەرگایە، رێگەیان نەداوە بێتە ژوورەوە. سەیر بکە داپیرە ها ئەوەتا پارەتەکت دەهێنن، بیگرە.

سەفتەیەك پارەم دایە داپیرە، پەنجا فردریك بوو، بەکاغەزێکی شینی تۆخ پێچرابوو، جگەلەمەش بیست فردریکی جگە لەهەزاریان بۆ ژمارد، هەموو ئەمانە لە داپیرە نزیك کرایەوە.

–بەرێزان یاری بکەن، بەرێزان یاری بکەن. ئایا هەموو شتیّ تەواوە؟



بەمشێوەیە سەرپەرشتیارەکە هانی یاریکەرەکانی دەدا بۆئەوەی بەختی خۆیان تاقی بکنەوە، خۆیان بۆ هەڵدانی تۆپەکە ئامادەکردبوو.

–ئەی خوایە ! داوکەوتین لە دانانی، هەر ئێستا دەست پێ دەکات.. داینێ داینێ. زووکە ، کاتەکە تەواو دەبێت.

داپیرەی وای دەگوت، دیسان نەیتوانی بەسەر خۆی زاڵ بێت و نوقرچکەی لێ دەدام.

–بەڵام لەکوێی دابنێم؟

– لەسەر سفرِ! لەسەر سفرِ! هەر لەسفرِ بێت ! ئەوەندەی دەتوانی پارەیەکی زۆر دابنێ. ئێستا چەندمان لەلایە؟ حەفتا فردریك ؟ تۆ قرچۆك مەبە، بەیەك جار بیست فردریك دابنێ !

– هۆشت بهێنەوە سەرخۆت داپیرە ! دوای دووسەد جاری دیکەش سفرِ دەرناچێتەوە ! هەندێك جار وایە، سوێندت بۆ دەخۆم، هەموو پارەکەت دەدۆڕێنی.

– واز لەقسەی قۆڕ بهێنە، واز بهێنە، پارەکە دابنێ، ئەوا چەکوشی ئاگادارکردنەوە لێ دەدا! من دەزانم چی دەکەم.

داپیرە ئەو قسانەی دەکرد، لەبەر هەڵچوونی خۆی دەلەرزی.

وتم:



–سیستەمەکە ڕێگە نادات، هەر یاریکەرێك لە دوانزە فردریك زیاتر لە سەر سفر دابنیێ، ئەوا دامنا.

سەرپەرشتیارەکە لەلای چەپی ئەو بوو، دەیویست تۆپەکە فڕی بدات، داپیرە دوای نوقرچکەیەك بەفەڕەنسییەکی خراپ وتی:

–ئەمە چۆنە؟ ئەی میسیۆ ئەمە ڕاستە؟ ئەمە ڕاستە؟ چەند لەسفڕ بێت؟ دوانزە؟ دوانزە؟

پرسیارەکەم بە فەڕەنسی دووبارە کردەوە، ئەویش بەئەدەبەوە وەلآمی دایەوە:

–بەڵێ خانمەکەم، ناکرێت هەر کەسێك لە ٤ هەزار فلۆرین زیاتر دابنیێ.

زیاتر لەمەش وتی:

–سیستەمەکە بەمشێویە.

–باشە، چارمان نییە، دوانزە فریدریك دابنیێ.

سەرپەرشتیارەکە هاواری کرد:

–یارییەکە دەستی پیێ کرد.

تۆپەکە سووڕایەوە، سێزدە دەرچوو، دۆڕاین.

داپیرە هاواری دەکرد و دەیگوت:



–دای بنیٚ، هەر لەویٚ دای بنیٚ.

ئەمجارە هیچ نارەزاییەکم نەبوو، هیچ بەرگرییەکم نەکرد، بەڵکوو بە پەلە دوانزە فردیکم دانا و شانم هەڵتەکاند، بازنەکە ماوەیەکی زۆر دەخولایەوە، داپیرە دەلەرزی، من بەسەرسامی سەیرم دەکرد و لەبەر خۆمەوە دەمگوت" بەڕاستی باوەڕی بەوە هەیە جارێکی دیکە سفرڕ بباتەوە" لەسیمای باوەڕێکی رەها هەبوو کە دەیباتەوە، باوەڕەکەی چەسپاو بوو لەوەیٚ گوێی لەسەرپەرشتیارەکە دەبیٚ، ماوەیەکی دیکە هاوار دەکات: سفرڕ. تۆمەکە لەیەکێك لەخاڵەکان گیر بوو ، سەرپەرشتیار هاواری کرد:

–سفرڕ

داپیرە ئاوڕی لەمندایەوە ، لەسیمای مانای سەرکەوتن و زاڵبوون بەدی دەکرا، وتی:

–ئایا بینیت؟

منیش قومارچی بووم، منیش لەو چرکەساتەدا هەمان هەستم هەبوو، باسك و قاچم دەلەرزی، هەر چۆنێك بێت ئەمە دەگمەن بوو، لەمیانەی دە یاری، سیٚ سفرڕ دەربچیٚ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە مایەی سەرسامییەکی تایبەت نەبوو، دوێنیٚ خۆم بینیم، سیٚ سفرڕ بەدوای یەکتر دەرچوو. یەکێك لە یاریکەرەکان کە لێدانەکانی بەوردی



لەکاغەزێك تۆماركردبوو، بەدەنگێكی بەرز وتی، ڕۆژێك پێشتر لە بیستوچوار كاتژمێر تەنها یەكجار سفر دەرچووە.

بەرێز وسەرنجێكی تایبەتەوە پارە زەبەلاحەكە بەداپیرە درا، چوارسەدوبیست فردریكی بەتەواوی وەرگرت، واتە چوار هەزار فلۆرین و بیست فردریك، فردریكە زێرەكەم بۆ ژمارد، پارە كاغەزەكەشم پێدا.

بەڵام ئەمجارە داپیرە بانگی پۆتاپیچی نەكرد، لەوانەیە شتێكی دیكە سەرقاڵی بكات! ئێستا وەك دەردكەوێ، نالەرزێ و بەمێزەكە ناكێشێ. بەڵكوو ئەگەر دروست بێت بڵێین لەناخیدا دەلەرزێ، هەموو سەرنجی لەسەر خاڵێك بوو، دەیویست ئامانجەكەی بپێكێ، دواجار بڕیاری دا و وتی:

–ئەلیكسی ئیڤانۆڤیچ، سەرپەرشتیارەكە وتی، ناكرێت یاریكەرێك چوار هەزار فلۆرین بەیەكجار دابنێ. ئەی وا نییە؟ كەواتە ئەم چوار هەزار بگرە، لەسەر سووری دابنێ.

بێهوودە بوو هەوڵ بدەی پەشیمانی بكەیتەوە، بۆیە ئەمجارەش یارییەكە خولایەوە، سەرپەرشتیارەكە هاواری كرد:

–سوور.

لەم بردنەوەیەش چوار هەزار فلۆرینی وەرگرت، ئێستا پارەكە بووە هەزار هەزار.



جارێکی دیکه فرمانی پیٚ کردم و تی:

–ئەم چوار هەزارەش بگرە، چوار هەزارەکەی دیکەش لەسەر سوور دابنیٚ.

جارێکی دیکه سەرکێشی بەچوار هەزار کرد، دووباره سەرپەرشتیارەکه هاواری کرد:

–سوور.

–کۆی گشتی دوانزه هەزار بوو، هەمووم پارەکەم بدیٚ، زێڕەکه لەتورەگه دابنیٚ، پارە کاغەزەکانیش بێنە، بۆ ئێستا با ئەوەندە بەس بێت، با بگەڕێنەوە ماڵەوە، کورسیەکەم هەڵبگرن.





## بەشی یانزەم

کورسییەکە بەرەو دەرگای ئەمسەری هۆڵەکە جوڵێنرا، داپیرە لە خۆشیان دەدرەوشایەوە. جەماعەتەکەی ئێمە هەموویان دەوریان دابوو، پیرۆزباییان لێ دەکرد. هەرچەندە ڕەفتاری داپیرە نامۆ و ریزپەڕ بوو، بەڵام سەرکەوتنەکەی زۆر شتی دیکە دادەپۆشی، تەنانەت چیتر ژەنەراڵ لەنێوا خەڵکە نزیکەکەی، بەهۆی ئافرەتێکی هەڵسوکەوت نامۆ، هەست بە ڕووشانی ناوبانگ و شکۆی خۆی ناکات، بەڵکوو لەستایشکردن و بەزەردەخەنەوە لە داپیرە نزیك بووەوە، بە جۆرێك قسەی لەگەڵ دەکرد، وەك ئەوەی بۆ دڵخۆشی یاری لەگەڵ منداڵێك بکات. لەلایەکی دیکەوە زۆر بە ڕوونی تەواوی تەماشاکەران سەرنجی خۆیان لەسەر ڕووداوەکە دەدا و ئاماژەیان بۆ داپیرە دەکرد. زۆرێك بەنزیکی ئەو تێدەپەڕین بۆ ئەوەی بەوردی سەیری بکەن. مستەر ئاستلی لەدوورەوە لەگەڵ دوو هاوەڵی ئینگلیز قسەی لەبارەی پیرژەنەکە دەکرد. خاتوونە گران و سەنگینەکان



سەرسامیەکی گەورە سەیری ئەم دیاردەیە نامۆیەیان دەکرد. دەمی دی گرێۆ پڕ ببوو لە پێکەنین و ستایشکردن، دەیگوت:

–سەرکەوتنێکی مەزن بوو.

خاتوو بلانش بە زەردەخەیەکی مەکربازی و دووڕوویی دەیگوت:

–بەڵام خاتوونەکە، وەك یەکێك بووی گوللە بهاوێژی !

داپیرە وتی:

–بەڵی، بێئەوەی یەك و دوو بژمێرم، دوانزە هەزار فلۆرینم بردەوە. چ بڵێم؟ دوانزە هەزار؟ جگە لە پارە زێڕینەکان. لەوانەیە بەنزیکەیی سێزدە هەزار بکات، ئایا بەرانبەر بە رۆبڵ چەند دەکات؟ نزیکەی شەش هەزار؟

ئەمەی بۆ ڕوونکردەوە، لەوانەیە زیاتر لە حەوت هەزار رۆبڵ بکات، ڕەنگە بە نرخی ئێستا نزیکەی هەشت هەزار رۆبڵ بکات.

–هەشت هەزار ... ئەمە گاڵتە نییە ! ها بۆ هەردووکتان وەك سەگێك لە قوڕ دروست کرابێت ڕەقبوونەتەوە؟ پۆتاپیچ، ماریتا منتان بینی؟

ماریتا زێدەڕۆیی لەستایشکردنی داپیرە دەکرد و وتی:

–بەڵام خاتوونەکەم چۆن ئەمەت کرد؟ هەشت هەزار رۆبڵ

–ها بگرن، پێنج لیرەی زێڕ بۆ هەردووکتان، وەرگرن....



بەپەلە پۆتاپیچ و ماریتا دەستی داپیرەیان ماچ کرد.

–سەر و فردرێکێك بدەنە ئەم خزمەتکارانە. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ هەر یەکەو لیرەیەکی زێڕیان پێ بدە. ئەم خزمەتکارە بۆ دەچەمێتەوە؟ ئەی ئەویتریان؟ ئەمە پیرۆزباییە لەمن؟ یەکە و لیرەیان پێ بدە.

– خاتوونی شازادەکەم.. هەژارێکی دوور لەولاتم.... بەردەوام سەرگەردانم.. میرەکانی رووس زۆر بەخشندەن.

ئەمە قسە وپارانەوەی پیاوێکی بەسمێڵ بوو، لە پێش کورسییەکە وەستا، پالتۆییەکی شڕ و چاکەتێکی کۆنی لەبەردابوو، کڵاوەکەی بەرز کردەوە، بە ملکەچی و زەلیلی زەردەخەنەیەکی کرد.

–لیرەیەکی پێ بدەن، نا دوو لیرەی پێ بدەن.. ئێستا ئەوەندە بەسیەتی ! ئەگینا ئەم کارە کۆتایی نایەت... هەڵمگرن، بمگوازنەوە! پراسکۆڤیا ! (ئەمەی بە پاولینا ئەلکسەندرۆڤنا وت) بەیانی کراسێکت بۆ دەکرم. هەروەها بۆتۆش خاتوو... ناوی چی بوو. خاتوو بلانش. وایە؟ پارەش بەتۆ دەدەم کراسێك بکڕی. پراسکۆڤیا ئەم قسەیەی من وەربگێرە.!

– سوپاس خاتوونەکەم.

بەهەمان شێوە خاتوو بلانش ئەم قسەیەی کردو بۆ شکۆی داپیرە چەمایەوە. زەردەخەنیەکی گاڵتەجاری بەسەر لێوەکانی بوو،



سەیری دی گرپیۆ و ژەنەڕاڵی دەکرد. ژەنەڕاڵ تۆزێك نیگەران بوو، بەڵام نیگەرانی خۆی دەرنەبڕی تا گەیشتینە ئەو ڕێگەیەی بەناو داربەڕووەکان تێدەپەڕێ.

داپیرە خزمەتکاری منداڵەکانی بەبیر هاتەوە ودەیگوت:

–فیدۆسیا، فیدۆسیا ! کاتێك هەواڵەکە دەبیستێ باوەڕ بەگوێچەکەکانی خۆی ناکات. دەبێت شتێکیش بە فیدۆسیا بدەم بۆخۆی کراسێك بکرێ.. هێی ! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ شتێك بەو سواڵکەرە بدە.

پیاوێك بەڕێگە دەڕۆیشت، پشتی چەمابۆوە، جلێکی کۆن و شڕی لەبەردابوو، سەیری ئێمە دەکرد.

منیش وتم:

–ئەم پیاوە سواڵکەر نییە، بەڵکوو یەکێك لە زۆڵەکان !

– قەیناکە فلۆرینێکی پێ بدە !

لەپیاوەکە نزیك بوومەوە، پارەکەم بۆ ڕاگرت، بەسەرسامی سەیری دەکردم، پارەکەی وەرگرت، بێئەوەی وشەیەك بدرکێنێ، بۆنی عەرەقی لێ دەهات.

– تۆ ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ ، هێشتا بەختی خۆت تاقی نەکردۆتەوە؟

– نەخێر، هێشتا تاقیم نەکردۆتەوە.



– چاوەکانت بریسکەی دەدا، من تێبینی ئەوەم کرد.

– بێگومان داپیرە، لەداهاتوودا هەوڵ دەدەم.

– بێ دوودڵی لە سفرِ دای بنێ. ئینجا دەبینی ! چەند پارەت هەیە؟

– داپیرە، بیست فردریك.

–زۆر نییە، ئەگەر دەتەوێ من پەنجا فردریکت بە قەرز پێ دەدەم، بگرە، بگرە ئەم پارە لوول دراوە بگرە.. کەچی تۆ ئەی ئازیزم ( ئەم رِستەیەی وت، لەناکاو رووی لە ژەنەرِاڵ کرد) خەون و خەیاڵت نەبێ: هیچ شتێکت پێ نادەم.

ژەنەرِاڵ شڵەژا، بەڵام هیچی نەگوت، دی گرپێو برۆکانی داگرت و ئاوری لەژەنەرِاڵ دایەوە، لەنێو ددانەکانی مینگەمینگی کرد و وتی:

–ئافرەتێکی ئابرووبەرە.

داپیرە هاواری کرد:

–سواڵکەر، سواڵکەر، سواڵکەرِێکی دیکە ! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، فلۆرینێك بەم پیاوە بدە.

پیاوێکی بەساڵاچوو، سەرسپی بەرەو رِوومان دەهات، لەسەر قاچێکی دارین دەرِۆیشت، پاڵتۆیەکی خۆڵەمێشی درێژی لەبەر بوو، دارعەسایەکی بەدەستەوە بوو خۆی پێگرتبوو، زیاتر لە



جەنگاوەرێکی کۆن دەچوو. کاتێك فلۆرینەکەم بۆ راگرت، هەنگاوێك بۆ دواوە گەڕایەوە، بەهەڕەشەوە سەیری کردم و بەئەڵمانی وتی:

–ئەمە چییە؟

دوای پرسیار و سەرسامی، کۆمەڵێك جنێوی دا.

داپیرە بەدەستەکانی ئاماژەی ڕق و کینەی نیشان دا و وتی:

–ئای لەو دەبەنگە ! وەختە لەبرسان بمرم، ئێستا نانی نیوەڕۆ دەخۆم، دواتر کەمێك پشوو دەدەم، دەگەڕێمەوە ئەو شوێنە.

بە هەڵپە و سەرسامی وتی:

– داپیرە هێشتا دەتەوێ قومار بکەی؟

– دەتەوێ چی بکەم، کاتێك تۆ لەوێ بۆگەن دەبی، دەتەوێ منیش سەیری سیمای تۆ بکەم؟

دی گرێۆ لێی نزیك بۆوە وتی:

–بەلاّم خاتوونەکەم، بەخت ئاوەژوو بێتەوە، لەوانەیە بە بەختێکی خراپ هەموو شتێك لەدەست بدەی، بەتایبەت ئەگەر بەو شێوە ترسناکەی ئێستا یاری بکەی!

خاتوو بلانش بە پڕتاوی وتی:

–بێگومان دەدۆڕێی !



–چ پێوەندی بەتۆ هەیە؟ ئەوەی دەدۆڕێ پارەی تۆ نییە، هی خۆمە! بەڵام ئەو پیاوە لەکوێیە مستەر ئاستلی ( ئەو پرسیارەی لەمن کرد)

– داپیرە، ئەو لەگازینۆکە مایەوە.

– بەداخەوە. بەڕاستی کوڕێکی جوامێرە!

گەیشتینە ماڵەوە، داپیرە لەسەر قاندرمەکان ڕێکەوتی سەرۆکی خزمەتکارەکانی کرد و بانگی کرد، بە شانازییەوە باسی قازانجەکانی خۆی دەکرد. دواتر بانگی فیدۆسیای کرد، سێ فردریکی پێ دا، فرمانی کرد خواردنی بۆ ئامادە بکات، لەکاتی نانخواردن، فیدۆسیا و مارتا تەژی بوون لەسەرسامی بەو پیرەژنە.

مارتا دەیگوت:

–ئازیزەکەم سەری تۆم دەکرد و بە پۆتاپیچم دەگوت: (( خاتوونەکەمان دەیەوێ چی بکات؟)) دواتر هەر پارەی لەسەر یەکتر دادەنا، ئەی پیرۆزی ئاسمان! لەتەمەنم هێندە پارەم نەدیوە! تەنها پیاوان بەدەوروبەرت بوون، تەنها پیاوان! ( ئەو خانەدانانە لەکوێوە دێن، پۆتاپیچ؟) من پرسیارم لە پۆتاپیچ دەکرد. دواتر دەمگوت (( پاکیزەی دایکی خوداوەند هاوکاریت بکات!)) خاتوونە چاکەکەم، من نزام بۆ تۆ دەکرد. دڵم خەریك بوو لەخورپە دەکەوت. وەك گەڵا دەلەرزیم، ((خودایە بەهانای وەرە)) پەنام بۆ خودا

دەبرد، خودا تۆی پاراست و ئاگادارت بوو. هەتا ئێستا دەلەرزم، هەتا ئێستا لەتەوقی سەرمەوە تا ژێر پێم دەلەرزێ.

– ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ! دوای نانخواردن خۆت ئامادە بکە. نزیکەی کاتژمێر چوار دەگەڕێینەوە ئەم شوێنە. هەتا ئەوکات خوات لەگەڵ. ئەوە لەبیر مەکە یەکێك لەو دکتۆرە هیچ و پووچانەم بۆ بنێری، بۆئەوەی بە ئاوی کانزایی چارەسەر وەربگرم، خۆ ئەمە لەبیر ناکەی؟

وەك کەسێکی گێژ و سەرسام لەلای داپیرە ڕۆیشتم، هەوڵم دەدا بیر لەوە بکەمەوە چی بەسەر هاوڕێیانم دێ؛ خەیاڵی ڕووداوەکانی داهاتووم دەکرد. دەمبینی هێشتا ئەوان لە کۆستی یەکەم بێدار نەبوویتەوە (بەتایبەتی ژەنەڕاڵ) گەیشتنی خودی داپیرە، لەبری هەواڵی مردنەکەی، هەموو پڕۆژە و بڕیارەکانی ئەوانی لەناو برد، ئێستا ئەوان بە شڵەژاوی و سەرسامی چاوڕوانی سەرکێشییەکانی داپیرە دەکەن لە یاری ڕۆلێت. جا لەوانەیە بابەتی دووەم لە یەکەم ترسناکتر بێت. داپیرە دووجار بە ڕاشکاوی وتویەتی هیچ پارەیەك بە ژەنەڕاڵ نادات، کەچی هێشتا ئەوان ئومێدیان نەبڕاوە. بێگومان دی گریۆ لەهەموو بابەتەکان لەگەڵ ژەنەڕاڵ هاوبەشە، تووشی بێ ئومێدی نەبووە. مەزندەش دەکرێت خاتوو بلانش کە زۆر بایەخ بە بابەتەکە دەدات ( دەبێ بایەخیش بدات، بەلایەنی کەمەوە بەنیازە زەماوەند لەگەڵ ژەنەڕاڵ بکات و میراتێکی زۆر و زەوەندی

بەرکەوێت) هێشتا مکوڕ بوونی ماوە، بۆیە هەوڵ دەدات هەموو تواناکانی خۆی لە فریودان و مەکربازی و ئاژاوە بەکاربهێنێ، بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر داپیرە هەبێت. ئەمەش بە پێچەوانەی پاولینایە، کە زۆر لوتبەرز وبەفیزە هیچ کاتێك نازانێ ملکەچی چییە و هەوڵی کوشکێشیش نادات بۆ ڕازیکردنی خەڵك. ئێستا داپیرە ئەو سەرکێشیە هەرزەکارانەی لە رۆلێت کرد، ئێستا کەسایەتی داپیرە تەواو بە بەرچاوی ئەوانەوە ڕوونە، ( پیرەژنێکی کەللەڕەق و لاسار، گەڕاوەتەوە سەردەمی منداڵی) بۆیە ئێستا لەوانەیە هەموو شتێك لەناو بچێت. ئەو پیرەژنە تەواو دڵخۆش بوو وەك قوتابیەکی بێت لە پۆل ئازاد بووبێ، بیەوێ یاری بکات، هێندە هەستی بەدڵخۆشی دەکرد. بە بەرخۆمەوە وتم ( ئەمە لەکاتێکدا هەستم بە خۆشییەکی چەپەڵ دەکرد، خوازیارم خودا لێم خۆش بێ): ئەی خودایە، خودایە ! هەر فلسێك داپیرە سەرکێشی پێ دەکرد، وەك خەنجەرێك بوو بەر دڵی ژەنەڕاڵ دەکەوت، دی گرێۆ تەواو هەناسەی تەنگ بووبوو، هەروەها تەواو خاتوو بلانشی توڕە دەکرد! شتێکی دیکە: کاتێك داپیرە بەدڵخۆشی پارە بەسەر هەموو کەسێك دابەش دەکرد، هەموو ڕێبوارێکی بە سواڵکەر دەزانێ، ئەم کاتە نەیتوانی خۆی بگرێ بە ژەنەڕاڵی گوت: (( بەلام تۆ شتێکت پێ نادەم))، ئەمەش مانای ئەوەیە پیرەژن لەسەر بۆچوونی خۆی جێگیرە، موکڕە، لەگەڵ خۆی گەیشتووەتە ئەو بڕیارە ئەم کارە بکات، ئەمەش بابەتێکی زۆر زۆر ترسناکە.

هــەموو ئــەم خەیاڵانــە لــەزەینم دەهــات و دەچــوون، منــیش لەقاندرمەکە بەرەو ژوورەکەی خـۆم لـە دوایـین نهـۆم سـەردەکەوتم. هەموو ئەو بابەتانە بەلای منەوە گرنگ بـوون، دەکرێـت مـن هـەموو ئـەو رایەڵـە ببیـنم کـە ئـەو ئەکتەرانـە بـە یەکـەوە دەبەسـتێتەوە، هەمووی لەبەر چاومە، بەڵام مـن تـەواو لەپاڵنـەر و نهێنیـەکانی دوای نواندنەکەم نەدەزانی. رۆژێك لە رۆژان پاولینا متمانەی بەمن نەبووە، راســـتە ئـــەو هەنـــدێك جـــار بەناچـــاری دڵـــی خـــۆی دەکاتـــەوە، لەگەڵئەوەشدا بنییومە لەهـەموو حاڵەتـەکان، هـەوڵ دەدات هەنـدێك نهێنی بدرکێنێ، بۆ ئـەوەی بەگاڵتـەوە ئـەوەی رابـردووم لـێ تێکـەڵ وپێکەڵ بکات، بە ئەنقەست هەموو شتەکانم لێ بشـێوێنێ. بـەڵی زۆر شت دەشارێتەوە، بەهەرحاڵ، هەر چۆنێك بێت ئەم گاڵتـەجاری ئـەم نهێنیە تـەواو دەبـێ، بـە یـەك لێدان هـەموو دەمامکـەکان لادەچـن، کەچی چارەنووسی منیش هەر ئەو بابەتەوە بەندە، کە هیچ شـتێکی لەبارەوە نازانم.

بارودۆخی دەروونی من زۆر سـەیر بـوو: مـن تـەنها بیسـت فـردریکم هەیـە، مـن لـە نیشـتمانەکەم دوورم، هـیچ پێگەیـەك، هـیچ داهـاتێکم نییە، بێ ئومێدێك، بێهیچ پرۆژەیەك... کەچی هەموو ئەمانە نیگەرانم ناکـات! ئەگـەر پاولینـا لەخەیاڵمـە، ئـەوا مـن تـەواو خـۆم دەدەمـە دەست ئەو چارەنووسە تا گاڵتەجارییەکـە کۆتـایی دێـت، منـیش بـە دڵی خۆم پێدەکـەنم. پاولینـا شـڵەژان دەخاتـە دەروونمـەوە، مـن وا



هەست دەکەم چارەنووسی ئەو بەمزووانە یەکلا دەبێتەوە. لەگەڵئەوەشدا دان بەوە دەنێم ئەم بابەتە منی سەرقاڵ نەکردووە. خوزگەی ئەوەم دەخواست ئێستا نهێنیەکانی ئاشکرا بکەم، ئەویش خۆی بیّ بڵێ:(( تۆ دەزانی من تۆم خۆشدەوی)) جگە لەمە شتێك نییە ئارەزووی بکەم، ئەم بیرۆکە شێتانەیە نەبوو کە نایەتەدی؟ ئایا دەزانم ئارەزووی چ شتێك دەکەم؟ من وەك کەسێك عەقڵی لەدەست دابیّ، ئەوەی دەیخوازم تەنها ئەوەیە لەنزیکی بمێنمەوە، لەو خەرمانەیە نزیك بم، کە بەدەوری پاولینایە، لەو تیشکەی لەو دەردەچێ، بۆ هەتاهەتایە لێی نزیك بم، لەمە زیاتر نازانم.... ئایا بەرگەی دووری ئەو دەگرم؟

کاتێك گەیشتمە نهۆمی سێیەم، بەبەر ژوورەکەی ئەوان تێپەڕیم، تووشی شۆك بوو، کە ئاوڕمدایەوە، پاولین بیست هەنگاوێك لەمن دوور بوو، لە داڵانەکە وەستابوو، وەك سیخوڕێك بەدوامەوە بوو، بە پەلە ئاماژەی بۆ کردم و لێم نزیك بۆوە.

بە هەڵپەوە وتم:

-پاولینا ئەلسکەندرۆڤنا...

فرمانی کرد و وتی:

-دەنگت نزم بکەوە.

بەدەنگێکی نزم وتم:



–دەزانی تازە هەستم بەشێتك کرد، وەك لێدانێکم بەرکەوتبێ، ئاورم دیەوە تۆم بیانی، وەك ئەوەی رۆشناییەك لەتۆ دەربچێ !

پاولینا گرژ و مۆنی بەسیمایەوە دیار بوو (مەزندە دەکەم قسـەکانی منی نەبیستووە)

–ئەم نامەیە بەرە هەر ئێستا بیدە بە مستەر ئاسـتی، تکـا دەکـەم، ئەو وەڵامت پێ ناداتەوە.. ئەو...

پاولینا ڕستەکەی تەواو نەکرد.

بەسەرسامی وتم:

–نامەکە بەمستەر ئاستلی بدەم؟

بەڵام پاولینا ئەو کاتە ون بوو.

–کەواتە بەمشێوەیە. نامە گۆڕینەوەیان لەنێوان هەیە.

بێگومان بە پەلە غارم دا، بەدوای مستەر ئاسـتلی گـەڕام: یەکـەمجار چوومە هوتێل نەمدۆزییەوە، دواتر چوومە گازینۆ لەهـەموو هۆڵـەکان گـەڕام نەمدۆزییـەوە، کاتێـك بـە بێئومێـدی و دڵتـەنگی دەگەڕامـەوە ماڵەوە، بەرێکەوت لەگـەڵ کۆمـەڵێك ئینگلیـز مسـتەر ئاسـلیم بینـی، پیاو و ژن بەسەر پشتی ئەسپەکانەوە بوون. ئاماژەم بۆ کرد، وەستا و نامەکەم پێدا، کاتی ئەوە نەبوو، وشـەیەك بڵـێین، وا بـزانم مسـتەر ئاستلی بە ئەنقسەت وایکرد، هەرکـە نامەکـەی وەرگـرت ئەسـپەکەی تاودا و ڕۆیشت.



ئایا ئیرەیی ئازاری دەدام؟ تەواو داڕووخابووم، تەنانەت خواستی ئەوەشم نەبوو بزانم بابەتی نامەکە چییە. ئەو نهێنی پارێزی پاولینایە و کەواتە جێی متمانەی ئەوە! ئەمە ڕوونە هاوڕێیەتی (لەکەییەوە؟) بەڵام ئایا ئەڤینداریان لەنێوانە؟ عەقڵم بەچرپەوە وتی(بێگومان نەخێر) بەڵام لەم جۆرە ڕووداوانە عەقڵ بەتەنها سەنگێکی نییە. هەر چۆنێك بێت، دەبێت ئەم بابەتەش بکەوێتە ژێر ڕۆشنایی، هەرچەندە بابەتەکە بەشێوەیەکی بێزارکەر ئاڵۆزتر بووە.

هەرکە چوومە ناو هۆتێلەکە دەرگەوانەکە و سەرۆکی خزمەتکاران بە پەلە بەرەو ڕووم هات، پێیان ڕاگەیاندم، هاوڕێیان سۆراخی من دەکەن، سێ جار بەشوێن منیان ناردووە، تکام لێ دەکەن، بە زووترین کات بچمە شوقەکەی ژەنەڕاڵ. من سەلیقەیەکی ناخۆش و دەروونێکی پەشۆکاو هەبوو. بینیم ژەنەڕاڵ لەژوورەکەی خۆیەتی، هەر یەکە لە دی گریۆ و خاتوو بلانش لەوێن، دایکی بلانش لەوێ نەبوو، بێگومان ئەو دایکە وا دەردەکەوت کەبایەخێکی هەبێت، کەچی لەڕاستی دا هیچ ڕۆڵێکی نەبوو، لەهەر شوێنێك بابەتێك بە ڕاستی هەبووبێت، ئەوا خاتوو بلانش بەتەنیا مامەڵە لەگەڵ بابەتەکە دەکات، تەنانەت من گومانم هەیە، ئەو ئافرەتە ئاگاداری ئەو کارانەبێت کەبلانش دەکات، گوایە ئەمەیان کچییەتی.



بەگەرموگوڕی مشتومڕیان بوو، دەرگای ژوورەکەش بەکلیل قوفڵ درابوو. ئەمەش پێشتر هەرگیز رووی نەداوە. کاتێك لە دەرگاکە نزیك بوومەوە، گوێم لەهات و هاوارەکە بوو: زمانە گاڵتەجاری و بێ ئابڕۆییەکەی دی گریۆ دیاربوو، هەروەها گوێبیستی جنێوە سووکەکانی خاتوو بلانش بوو، لەگەڵ ئەوەش گوێبیستی دەنگی کڕوزانەوەی ژەنەڕاڵ بووم، دەیویست پاکانە بۆخۆی بکات. کاتێك چوومە ژوورەوە بەسەر خۆیان زاڵ بوون، بارودۆخی خۆیان چاك کردەوە. ئەوەتا دی گریۆ قژی دادەهێنێتەوە و زەردەخەنەیەك دروست دەکات: زەردەخەنەیەکی فەرەنسی، توندڕەو، فەرمی، ئای ڕقم لەم زەردەخەنەیە بوو ! ئەوەتا ژەنەڕاڵ، شەکەت، خەیاڵ گیرۆدە، قیت وەستاوە، وەك ئامرێك جوڵە دەکات. خاتوو بلانش تاکە کەس بوو هەوڵی نەدا تووڕەیی ونیگەرانی لەسیمای خۆی بشارێتەوە، بێدەنگ بوو، بێ ئوقرە سەیری دەکرد. دەبێت ئەوەش بڵێم تا ئەو کاتە بەشێوەی کەمبایەخ مامەڵەی لەگەڵ دەکردم ، کە عەقڵ باوەڕی پێ ناکات، تەنانەت ئامادە نەبوو وەڵامی سڵاوەکانیشم بداتەوە، بەتەواوی نکۆڵی لە بوونی من دەکرد.

ژەنەڕال بەزمانێکی پڕ گلەیی و دۆستانە وتی:

-ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ ! دەمەوێ سەرنجت بۆ ئەوە ڕابکشێم، سەیرە، زۆر نامۆییە.... بەکورتیەکەی ڕەفتارت لەبەرانبەر من و



خێزانەکـەم... بەکورتییەکـەی ئـەم ڕەفتـارە سـەیرە، تائەوپـەڕی ڕەفتارەکەت نامۆییە.

– ئەمە بابەتەکە نییە...

بەمشـێوەیە دی گریـۆ قسـەکانی پـێ بـڕ و بـەتوڕەیی وقینـەوە (دەبوایـە خـۆی لەهـەموو شـتێك هـەڵقورتێنێ)، دواتـر دەسـتی پـێ کردەوە و وتی:

– ئەی پیاوی بەڕێز، پیاوی بەڕێز، ژەنەڕاڵ کاتێك بەمشێوەیە قسـە دەکـات هەڵـە دەکـات ( گوێبیسـتی قسـەکانی بـووم کـە بەرووسـی دەدوا) ئەو دەیەوێ بڵێ، مەبەستم ئەوەیە ئاگادارت بکاتەوە، یان با بڵێ ئەو تکا دەکات، بـەڵی تکـا دەکـات گـیرۆدەی نەکـەی، مـن ئـەم گوزارشتە بە ڕاشکاوی بەکاردەهێنم..ز

قسەکانی ئەوم بڕی و وتم:

–بەڵام چۆن؟ چۆن؟

دی گریۆ بە پەشۆکاوی وتی:

– ڕێگەم بدە، تۆ ئەمڕۆ خۆت کردبووە چاوسـاغ و ڕێبـەری، (نـازانم چی؟) بەڵێ، تۆ ئەمڕۆ چاوساغی ئـەو خاتوونـە بەساڵاچـووە بـووی، ئـەو پیرەژنـە تۆقینـەرە، بـەڵام ئـەو دەدۆڕێ، دوا فلسـی خـۆی دەدۆڕێنێ ! ئەمڕۆ بەچاوی خۆت بینیت چـۆن یـاری دەکـرد، خـۆت شاهێدحاڵ بووی، ئەگەر زیاتر بدۆڕێنێ، ئـەوا هـەرگیز مێـزی قومـار



جێناهێڵێ، جا لەکەلەڕەقی و لاساری بێت، یان لەتووڕەیی بێت. ئەو کاتە بەهەموو شتێکەوە قومار دەکات، بەهەموو شتێك! مرۆ ئەو کاتە عەقڵی خۆی لەدەست دەدا.. ئەو کاتە....

ژەنەراڵ پاڵپشتی قسەکانی کرد و وتی:

–ئەو کاتە هەموو خێزانەکە لەناودەچێ...هەموومان.. من و خێزانەکەم، میراتگرەکانی، کەسێك لەئێمە لەو نزیکتر نییە. من بەڕاشکاوی پێت دەڵێم: بارودۆخی من نالەبارە، زۆر شڵەژاوە، لەوانەشە تۆ بەشێکی بزانی. ئەگەر ئەو پارەیەکی زەبەلاح بدۆڕێنێ، ئەگەر هەموو سامانەکەی لەدەست بدات، ئەمە چاوەڕوانکراوە، (ئەی خودایە !) چی بەسەر منداڵەکانم دێ ( ئەمەی گوت سەیری دی گرێۆی کرد) چی بەسەر من دێ ( ئەمەی وت سەیری خاتوو بلانشی کرد، ئەوی بەڕقەوە رووی وەرگێڕا) رزگارمان بکە ئەی ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ!

وتم:

–بەلام چۆن ئەی ژەنەراڵ، پێم بڵێ چۆن دەتوانم... من چ دەسەلاتێکم بەسەر ئەو ژنەوە هەیە؟

وتی:

–ڕەتی بکەوە، ڕەتی بکەوە، وازی لێ بهێنە !...

منیش هاوارم کرد:



-بەڵام کەسێکی دیکە دەدۆزێتەوە...

دووبارە دی گرێۆ قسەکانی پێ بڕی و وتی:

- ئەمە بابەتەکە نییە ! بابەتەکە ئەوها نابێ ! وازی لێ مەهێنە، بەڵکوو ئامۆژگاری بکە، وا بکە واز لەقومار بهێنێ... یان ڕێگە مەدە زۆر بدۆڕێنێ، بە شتێکی دیکە سەرگەرمی بکە.

تۆزێك ساویلەکەییم نواند و وتم:

-بەڵام چۆن ئەم کارە بکەم؟ خۆزگە میسیۆ دی گرێۆ تۆ ئەو کارەت لە ئەستۆ دەگرت!

هەرکە ئەو قسەیەم کرد خاتوو بلانش بەنیگایەکی خێر و پڕ پرسیار سەیری دی گرێۆی کرد، لەناکاو لە چاوتروکانێك دی گرێۆ سیمایەکی ڕاستگۆیانەی وەرگرت کە نەیتوانی بیشارێتەوە و وتی:

-کارەساتەکە ئەوەیە، ئەو قبوڵی ناکات!

هەروەها دی گرێۆ بە هەڵپەوە بەدەستەکانی نیشانەی بێتوانایی نیشاندا و وتی: .. یان ئەگەر... دواتر

دواتر بە نیگایەکی پڕ مانا دی گرێۆ سەیری خاتوو بلانشی کرد. ئەو کاتە بلانش بەرەو لای من هات و زەردەخەنەیەکی دڵڕفێنی کرد، بەدەستەکانی دەستی هەردوو دەستی گوشیم و وتی:

-ئەزیزم بەڕێز ئەلێکسی، پیاوی چاك بە، جوامێر بە.



ئەم ڕووخسارە شەیتانییە، دەزانێ چۆن لەناکاو دەگۆڕێ! ئێستا سیمای ئەو پاڕانەوەیەکی گەورە، میهرەبانی، زەردەخەنە و مەکربازیکی منداڵانە دەنوێنێ. تەنانەت لە کۆتایی قسەکانی بە غەمزەیەك وا هەستم کرد: ئاخۆ داگیرم دەکات؟ ئەو دەزانێ ئەم کارە بکات، تەواو بەشێوەیەکی ئابڕۆبەرانە !

لەدوای ئەو ژەنەراڵ تەقییەوە ( بەڵێ تەواو بەمانای ئەو وشەیە تەقییەوە)، بەتکاوە بەمنی وت:

-ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، لەبەر ئەو شێوازەی تازە لەگەڵ تۆم بەکارهێنا، لێم ببوورە. مەبەستم ئەوە نەبوو، بەڵام تکات لێدەکەم، بەشێوازی ڕووسەکان تا ناوقەدم لەبەر تۆ دەچەمێمەوە، تۆ بەتەنها تۆ دەتوانی رزگارمان بکەی ! من و خاتوو دی کۆمێنگ، پەنات بۆ دەهێنین، تۆ تێ دەگەی، تێ دەگەی، ئەی وانییە؟

ئەم قسەیەی دوایی کرد و بە نیگاکانی سەرنجی منی بۆ لای خاتوو بلانش رادەکێشا، بەراستی شایەنی لاوانەوە بوو، بەزەییت پێی دەهاتەوە.

لەم ساتەدا سێ جار بە ئەدەب و لەسەرخۆ لەدەرگا درا، کاتێك دەرگاکە کرایەوە، خزمەتکارەکە دەرکەوت، چەند هەنگاویك لەدوای ئەو پۆتاپیچ وەستا بوو، داپیرە ناردوویەتی، فرمانی پێ کردوون بەدوای من بگەڕێن، یەکسەر من ببەنە لای ئەو.



پۆتاپیچ وتی:

–ئەو تورەیە.

منیش وتم:

– هێشتا کاتژمێر سێ و نیو نەبووە.

–نەیتوانی بخەوێ، جارێك خۆی وەرگێڕا، دواتر لەناکاو هەڵسایەوە، داوای کورسییەکەی کرد و بەدوای تۆی ناردووە، ئێستا ئەو لەبەردەم دەروازەی هوتێلەکەیە.

دی گریۆ وتی:

–ئافرەتێکی سەرسەختە.

کەچووم بەڕاستی بینیم داپیرە لەسەر سەکۆکەی دەروازە بوو، لە ئامادەنەبوونی من تورە بوو، نەیتوانی بوو تا کاتژمێر چوار چاوەڕوان بێت.

کاتێك منی بینی هاواری کرد:

–دەی... بەرەو ئەوێ بڕۆین!

دووبارە گەڕاینەوە رۆلێت.





# بەشی دوانزەم

داپیرە زۆر بە جۆش و خرۆش بوو، وەك دیار بوو رولێت هەموو خەیاڵی داگیر کردبوو، بەشێوەیەك بایەخی بەهیچ شتێك نەدەدا رۆلێت نەبێ، بەشێوەیەکی گشتی دۆشداما بوو. بۆ نموونە کاتێك بە رێگە دەرۆیشتین وەك بەیانی پرسیاری لێ نەدەکردم. کاتێك گالیسکەیەکی گەورە بە پێشمان تێپەڕی، دەستی کەمێك جولاند پرسیاری لەخاوەنەکەی کرد، بەلام وابزانم گوێی لەوەلامەکەی من نەبوو. بەشێوەیەك خەیاڵپلاوی دەکرد، لەجوڵەکانی بێ ئۆقرەیی ئەو دەردەکەوت، پەرۆشیەکی لەناکاو کە لەخەیاڵی کەس نەبوو. کاتێك لەبەردەم گازینۆکە نزیك بووینەوە، باپۆن و خاتوونەکەی ئەومان بینی، ئاماژەم بۆ ئەوان کرد و ناوم هێنان، کەچی ئەو خەیاڵی ئالۆز بوو، تەنها وتی (ها !) بەجوڵەیەکی بەهێز ئاوڕی لە پۆتاپیچ و مارتا دایەوە کە بەدوامانەوە بوون، وتی:

– پێویستم بە ئێوە نییە؟ هەموو جارێك ئێوە نابەم، بگەڕێنەوە...



کاتێك ئەم دووانە ڕۆیشتن، دوای ئەوەی خواحافیزییەکی خێرای کـرد وتی:

–تەنها تۆم بەسە.

لەگازینۆ چاوەڕوانی داپیرە دەکرا، هـەر بـە پەلـە جێگـای لەهـەمان شوێنی پێشوو بۆ دیارکرا، لـەنزیك سەرپەرشـتیارەکە. مـن خـەیاڵی ئەوە دەك ئەو سەرپەرستیارانەی بە شێوەی فەرمانبەر دەردەکەون، بەلای ئەوانەوە دۆڕانی خەزێنەکە و بردنەوەی وەك یەکە، لەڕاسـتیدا ئەوان بایەخ بـە خـەزێنەکـە نـادەن، بـەڵکوو ڕێنمـایی ئـەوەیان هەیـە سەرنجی قومارچـییەکان رابکێشـن، ئاگـاداری بەرژوەندییـەکانی بـاج بن، ئەمەیش پاداشت و خەلاَتی بۆ ئەوان تێدایـە. بەلایـەنی کەمـەوە دەتوانین بڵێین ئەوان وەك قوربانییەك سەیری داپیرەیان دەکرد.

ئـەوەی هاوڕێیـان پێشـبینیان کـرد بـوو، ڕوویـدا، ڕووداوەکـانیش بەمشێوەیە بوو:

داپیرە یەکسەر سفری دەستنیشان کرد، فرمـانی کـرد یـەك کـەڕەت دوانــزە فردریــك لــە ســفرِ دابنــێم، جــاری یەکــەم، جــاری دووەم و سێیەمیش سفرِ دەرنەچوو، داپیرە بێوچان ئانیشکی لەمن دەدا، بـیَ ئۆقرە دەیگوت: ((بـەردەوام بـە، بـەردەوام بـە)) منـیش گوێڕایـەڵی فرمانەکانی بووم.

دواجار لەتوڕەییان جیڕەی لە ددانەکانی هێنا و وتی:



–چەند کەرەت یاریمان کردووە؟

–دوانزە، نزیکەی سەدوچلوچوار فردریکمان دۆڕاندووە. جارێکی دیکەش پێت دەڵێم. سفرِ بەر لەئێوارە....

قسەکەی منی بڕی و وتی:

–بێدەنگ بە، هەروەها هەزار فلۆرین لە سوور دابنێ، ئەمە پارەیەکی کاغەز.

سوور دەرچوو، بەڵام دووبارە سفرِ دەرنەچوو، هەزار فلۆرینەکە گەڕایەوە.

داپیرە بەدەنگێکی نزم وتی:

–بینیت؟ بینیت؟ ئێستا هەموو ئەوانەمان گێڕایەوە کە دۆڕاندبوومان. دووبارە لەسفرِ دابنێ، دوای دە کەرەتی دیکە دەڕۆین.

بەڵام دوای پێنج یاری، پیرەژن وازی لە سفرِ هێنا و بەفرمان کردنەوە وتی:

–واز لەو سفرە نەگریسە بهێنە. ها بگرە، چوار هەزار فلۆرین لەسوور دابنێ.

تکام لێکرد و وتم:



–داپیره ئەوەندە زۆره...! چی ئەگەر سوور دەرنەچوو؟ بەلام هێندە نەمابوو لێم بدا ( هەرچەندە ئانشکەکانی وەك زلەلێدان بوو) بۆیە دەبووایە فرمانەکەی جێبەجێ بکەم، ئەم چوار فلۆرینەم کە بەیانی بردبوومانەوە، لەسوورم دانا، تۆپەکە خولایەوە، داپیره هێمن و قیت دانیشتبوو، بەشانازییەوە، متمانەی بە بردنەوەی خۆی هەبوو.

سەرپەرشتیارەکە هاواری کرد:

–سفر

سەرەتا داپیره تێنەگەیشت، بەلام کاتێك بینی سەرپەرشتیارەکە چار هەزار فلۆرینەکەی ئەو لەگەڵ پارەکانی دیکە سەر مێزەکە دەبات، ئەوا هەستی بەوە کرد ئەو سفرەی ماوەیەکی زۆر دەرنەدەکەوت، نزیکەی دوو سەد فردریکمان لەسەر دانابوو، ئێستا دەرچووە، وەك ئەوەی بە ئەنقەست بێت، ئێستا ریسوای کردووە. داپیره بەسەرسامییەوە هاواری کرد، دەستەکانی بەیەکتر کێشا، خەڵکەکەی دەوروبەری دەستیان کرد بە پێکەنین.

بەدەنگێکی تیژ هاواری کرد و وتی:

–ئەی پیرۆزی بەهەشت ! ئەوە ئێستا دەردەچێ، ئەو توتکە سەگە ! هەموو خەتای تۆ بوو، هەموو خەتای تۆ بوو ( ئەمەی وت رووی



لەمن گرژ کردبوو بە ئانیشکی لەمنی دەدا) تۆ منت لە سفرِ پاشگەز کردەوە.

– داپیرە، من هەولّم دا بیر بکەیتەوە، من بەبەرپرسی بەختی تۆ نییم.

بەمنگە منگ و بەزمانی هەرِەشەئامێز وتی:

–جا من شانست پیّ دەدەم، دەی برِۆ !

من وەك کەسێك بیەویّ برِوات، رووم وەرگێرِا و وتم:

–داپیرە خواحافیز.

– ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ! لەگەلّ من بمێنەوە. بۆ کویّ دەچی؟ بمێنەوە، تۆزێك بمێنەوە. من دەبەنگم، من گێلم. ئێستا پێم بلّیّ چی بکەم.

–داپیرە من لەمەودوا هیچ ئامۆژگارییەکت ناکەم، تا گلەییم لیّ نەکەی، خۆت یاری بکە، تۆ فرمان بکە و منیش پارەکە دادەنێم.

– باشە باشە: ئێستا چوار هەزار فلۆرین لە سوور دابنیّ، ها جزدانەکەم بگرە ( ئەمەی وت و جزدانەکەی لەگیرفانی دەرهێنا و بۆ منی راگرت) زووکە بیست هەزار رۆبلّی تێدایە.

بەمنگە منگ وتم:

–ئەی داپیرە ! ئەم برە پارەیە....



– له داریش بدرێم، پاشگەز نابمەوە. دای بنێ.

پارەکەم دانا و دۆڕاین.

–دووبارە دای بنێ، دای بنێ، یەك کەڕەت هەشت هەزار دابنێ.

– ئەمە قەدەغەیە، زۆرترین پارە نابێت لە چوار هەزار زیاتر بێت.

–کەواتە چوار هەزار دابنێ.

ئەم جارە بردمانەوە، داپیرە بوێرییەکەی گەڕایەوە.

بە ئانیشکی لێی دەدام و دەیوت:

–بینیت؟ بینیت؟ چوار هەزاری دیکە دابنێ.

پارەمان دانا و دۆڕاین، دووبارە داماننا و دۆڕاین.

بۆ ئاگادارکردنەوە پێم وت:

–ئەی داپیرە، دوانزە هەزار فلۆرین دۆڕا.

بە توڕەییەکی لەسەرخۆ وتی:

–دەزانم رۆیشت.

دواتر بە منگە منگ وەك ئەوەی بیر بکاتەوە، نیگای جێگیر بوو وتی

–ئەزیزەکەم دەزانم رۆیشت.. دەزانم. هێی هێی! لێرە پێستیشم دەدۆڕێ.. بەڵام زیانێکی نییە.. دەی چوار فلۆرینی دیکە دابنێ.



–داپیره پارەمـان پـێ نـەماوه، لەجزدانەکـەت تـەنها چـەکی بـانکی رووسی ماوه بەسووی سەدا پێنج، لەگەڵ هەندێك كۆمپیاڵـه، پـاره، هیچ پارەیەك نییه.

–لەتۆرەگەکەش؟

–تەنها چەند پارەیەکی خورده هەیە

بەزمانێکی یەکلاکەرەوه داپیره وتی:

–ئایا سـەراف لێـره نییـه؟ پێیـان گـوتم دەتـوانین چـەك و پـاره رووسیەکانیان بگۆڕینەوه.

– دەتـوانین هـەموو شـتێك بگۆڕیتـەوه، بـەڵام لـەو گۆڕینەوەیـە تـۆ زەرمەند دەبی، تەنها جولەکەیەك قازانج دەکات.

–قسـەی قـۆڕ! دەمـەوێ پـارەی خـۆم بگێڕمـەوه، ببـەم لای سەرەفەکان واز لەو زۆڵانه بهێنه.

کورسییەکەمان پـاڵ دا، حەمباڵـەکان بـەدوامان هـات، لـه گازینۆکـه هاتینه دەرەوه، داپیره بەفرمان کردنەوه وتی:

–خێراتر، خێراتر ! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ ڕێگەم نیشان بدە... بـۆلای نزیکترین سەرافمان ببە... ئایا لێره دووره..؟

–داپیره... چەند هەنگاوێك لێرەوه دووره.

کاتێــــك لەســــەر سووچـــەکە پێچــمان دەکـــردە، ئـــەو کاتـــەی گۆڕەپانەکـەمان بـڕی بـۆ نـاو داربـەڕووەکان دەڕۆیشـتین، تووشـی هەموو هاوڕێیان بووین: ژەنەڕاڵ، دی گریۆ، خاتوو بلانـش و دایکـی، نە پاولینا ئەلکیسەندەرۆڤنا و نەمستەر ئاستلیان لەگەڵ بوو.

–دەی با بڕۆین، مەوەستن، چیتان دەوێ؟ کاتم بۆ ئێوە نییە !

بەمشێوەیە داپیرە هاواری کرد

من لەدوای ئەو دەڕۆیشتم، دی گریۆ بەدوام هات، بەدەنگێکی نزم بە پەلە پێم وت:

–ئەوەی بەیانی بردبوویەوە، هەمووی دۆڕاند، زیاتر لە دوانزە هەزار. ئێستا دەچین چەکەکانی دەگۆڕینەوە بەسووی سەدا پێنج. دی گریۆ پێـی لـەزەوی کوتـا، بەپەلـەی هەواڵەکـەی بـە ژەنـەڕاڵ دا، ئێمـە کورسیەکەمان پاڵ دەدا.

ژەنەڕال لەتوڕەییان شێت ببوو، بە منگە منگ وتی:

–ڕێگری لێ بکە، ڕێگری لێ بکە.

وەڵامم دایەوە:

–تۆ هەوڵ بدە !

ژەنەڕاڵ نزیك بۆوە و وتی:



–پورەکـەم، پـورە چـاکەکەم... ئێمـە دەڕۆیـن... ئێمـە دەڕۆیـن (دەنگی لەرزۆك ببوو) ئەسپ بەکرێ دەگرین، گەشتێکی چۆڵەوانی دەکەین... دیمەنـەکان نایـابن... لوتکەکـە... هـاتووین بانگهێشـتت بکەین تا یاوەرمان بی.

دایپیرە بەجوڵەیەکی بێ ئۆقرە لەخۆی دور خستەوە و وتی:

–خۆت ولوتکەکەت بۆ لای شەیتان !

ژەنەڕاڵ تێ هەڵچۆووە، ئەمجارە بێ ئومێد بوو:

– گوندێك هەیە... لەوێ چا دەخۆینەوە...

دی گریۆ بەزمانێك کە بۆنی دوژمنایەتی لێ دەهات وتی:

–لەسەر گیای سەوز و تەڕ، ماستاو دەخۆینەوە.

ماستاو، گژوگیای تەڕ و سەوز، ئەمـە ئەوپـەڕی خـەیاڵی شـاعیرانەی بۆرجـوازی پاریسـە، هـەر بەمشـێوەیە وێنـای سروشـت و هەقیقـەت دەکەن.

دایپیرە وتی:

–ماستاوەکەی تۆ بۆ من گرنگ نییـە، تـۆ بەتـەنها بینۆشـە. ماسـت گەدەم ئازار دەدا، بۆچـی پێـداگری دەکـەی، مـن وتم کـاتم بۆ ئێـوە نییە !

منیش هاوارم کرد:



–داپیره گەیشتین!

کورسییەکەمان بەرەو ئەو شوێنە برد کە نووسینگەی گۆڕینەوەی دراوی لێیە. من ئەرکی گۆڕینەوەی چەکەکانم گرتە ئەستۆ، داپیرەش لەبەردەم نوسینگەکە چاوەڕوانی دەکردم، دی گریۆ و ژەنەراڵ و بلانشیش لەدوورەوە مانەوە نەیاندەزانی چی بکەن. داپیرە بە تۆرەیی نیگای دەکردن، ئەوان ڕێگەی گازینۆکەیان گرتەبەر.

سەڕافەکە نرخێکی زۆر کەمی بۆ پێشنیارکردم، منیش دوودڵ بووم، گەڕامەوە پرسیارم لە داپیرە کرد.

داپیرە بە هاوارکردنەوە بەدەستەکانی چەپڵەیەکی کرد:

–ئای ... لەو دزانە! لەگەڵ ئەوەش قبووڵی دەکەم.

دواتر وتی:

–بوەستە. تۆ سەڕافەکەم بۆ بانگ بکە.

–بەڵکوو یەکێك لە فەرمانبەرەکان! ئەی داپیرە.

–وەك یەکە، یەکێك لەفەرمانبەرەکان بانگ بکە.. ئای لەو دزانە ..!

فەرمانبەرەکە ئامادەبوو بێتە دەرەوە، کاتێك زانی ئەوەی بانگی دەکات کۆنتیسەیەکی پیر و پەککەوتەیە. پیرەژن گوتارێکی درێژ بۆ خوێندەوە، پێی وت، گیرفانبڕ، دز.. گوتارەکەشی بە زمانێکی



تێکـەڵی ئینگلیـزی و رووسـی و ئـەڵمانی بـوو، منـیش ناچـاربوو تەرجەمەی بۆ بکەم. فەرمانبەرەکە سیمایەکی گرژی هەبوو، سـەیری هەردووکمانی دەکرد بێ ئەوەی وشەیەك بدرکێنێ، سەری دەلەقاند، تەنانـەت بـە گـرژی و کـەمێك بـێ ئەدەبانـە لـە داپـیرەی دەڕوانـی و دواتریش زەردەخەنەیەکی کرد.

داپیرە هاواری کرد:

-باشە باشە.... دەی، خوا دەکا پارەی من دەتخنکێنێ. ئەلکیسی ئیڤانۆڤیچ پارەکە بگۆڕەوە، کاتمان بەدەستەوە نییـە، ئەگـەر لـەلای ئەوە ناگۆڕینەوە، با بچینە لای سەڕافێکی دیکە.

-ئەو پیاوە بانگەشەی ئەوە دەکات خەڵکی دیکـە بـە کـەمتر لێمـان وەردەگرن.

ئێستا لەبیرم نییە بـە وردی پارەکـە چـەند بـوو، بـەڵام دەسـتەیەك بـوو، دوانـزە هـەزار فلـۆرین، چـەندان لـیرەی زێـڕ و پـارەی کاغـەزم وەرگرت، لەگەڵ لیستی حیسابەکە، دواتر چوومە لای داپیرە.

داپیرە دەستەکانی دەجولاند و وتی:

- باشە باشە، پێویست بە ژماردن ناکات. زووکە دەی، زووکە.

کاتێك لەگازینۆکە نزیك بووینەوە، بەمنگە منگ وتی:

-هیچ شتێك لەسەر سفری بەدبەخت و سوور دانانێم.



ئـەمجارە، بەهـەموو توانـای خـۆم، هـەوڵم دا رازی بکـەم، سـەرەتا پارەی کەم دابنێین، دواتر کاتێك زانیمـان بـەخت یاوەرمانـە، ئینجا پـارەی زۆر دابنـێین، کەچـی ئـەو بـێ ئـۆقرە بـوو. هەرچـەندە ئـەو سەرەتا لەگەڵ پاساوەکانی من بوو، بەلأم دواتر لەکاتی یاری جلەوی خۆی لەدەست دا. هەرکە دە فردریك یان بیست فریـدریکی بـردەوە، دەستی کردەوە بە نوقرچکەلێدان و ئانیشك وەشاندن، دەیگوت:

–دەبینی؟ دەبینی؟ بردمانـەوە، ئەگـەر چـوار هـەزار فلۆرینمـان لـە بـری دە دادەنـا، ئـەوا ئێسـتا چـوار هـەزارمان دەبـردەوە... ئێسـتا هەموو خەتای تۆیە.

دواجار بڕیارم دا واز لە ئامۆژگارییـەکانم بهێـنم، هەرچـەندە زۆر لـەو شێوازە قومـارکردنی ئـەو زۆرتـووڕە بـووم. ئـەوە دی گریـۆ لـەناکاو دەتەقییەوە. تەنها ئەو سێیانە لە هۆڵەکە بوون، سەیرم کـرد خـاتوو بلاش لەگەڵ دایکی بۆلای مـیری بچـووك چـەماوەتەوە، رووخۆشـی و خۆشەویسـتی پـێ دەدا. وەك ڕوونـە ژەنـەڕاڵ بێـزراوە، بـەڵکوو فەرامۆشـیش کـراوە. خـاتوو بلانـش ئامـادە نییـە، سـەیری بکـات، هەرچـەندە ژەنـەڕاڵ دەچـێتە لای و خـۆی لـێ نزیـك دەکاتـەوە. بەسـتەزمان ژەنـەڕاڵ ! زەرد هەڵدەگـەڕا، سـوور دەبێتـەوە، دواتـر دەلەرزی، تەنانـەت ئاگـای لـە قومـارکردنی داپـیرە نـەمابوو، کاتێـك میری بچووك لەگەڵ بلانش چوونە دەرەوە، ژەنەڕاڵیش بەدوای ئەوان ڕۆیشت.



دی گرێۆ داپیرەی سەرقاڵ دەکرد و بەزمانێکی لووس دەیگوت:

-مەدام ، مەدام، لەم یارییە نابەیەوە... مەحاڵە..

ئەمەی بەزمانێکی رووسی خراپ دەگوت.

-کەواتە چی بکەم؟ تۆ پێم بڵێ چی بکەم!

دی گرێۆ بێ پچڕان بە فەرەنسی قسەی دەکرد، ئامۆژگاری لەدوای ئامۆژگاری، پێی دەگوت دەبێت چاوەڕوانی بەخت بێت، تەنانەت دەستی کرد بە لێکدانەوەی ژمارەکان، داپیرە هیچ حاڵی نەدەبوو. هەموو جارێك دی گرێۆ ئاوڕدەدایەوە تا من قسەکان بکەم بەڕووسی، پەنجەی بەرەو مێزەکە دەبرد، دەیویست بۆی ڕوون بکاتەوە، دواجار قەڵەمێکی هێنا، هەندێك ژمارەی لەسەر نووسی، داپیرە ئۆقرەی نەما و وتی:

-لاچۆ.. لاچۆ! تەنها قسەی پرووپووچ دەکەی.( مەدام، مەدام) تۆ لەهیچ شتێك ناگەی، دەی برۆ.

دی گرێۆ دەستی پێکردووە، ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە، دیاربوو وەك برینداڕێك بوو، نەیدەویست بڕوات:

-بەڵام مەدام

داپیرە فرمانی کرد و وتی:



-باشـه... ئـەمجارە بـەگوێی ئـەو بکـە، لەوانەیـە ئامۆژگارییەکـەی ڕاست دەربچێ.

ئەوەی دی گرێۆ مەبەستی بـوو، تـەنها ئـەوە بـوو ڕێگـەی نـەدا بـە پـارەی زۆر یـاری بکـات، بۆیـە پێشـنیاری کـرد پارەکـان بـەجیا لـە زنجیرەیەك ژمارە دابنـێ، منـیش بەمشـێوەیە دامنـا، فـردریکێکم لـە دوانزە ژمارە جووتەکەی یەکەم دانا، دواتر پێنج فردریکم لـە دوانـزە ژمارەکـەی دیکـە دانـە، لـە هەژدەمـەوە تـا بیستوچـوار: بەمـەیش بەهەمووی پارەکە شەش فردریك دانرابـوو. خولانـەوە دەسـتی پـێ کرد:

-سفر

بەمشـێوەیە سەرپەرشـتیارەکە هـاواری کـرد، هـەموو پارەکـەمان دۆڕاند.

داپیرە بە هەڵپەوە ئاوڕی لە دی گرێۆ دایەوە وتی:

-ئەمە چ دەبەنگێك بوو بۆمان هات! ئەم فەڕەنسیە هیچ وپووچە ! سەیری ئەم هەرزەکارە بکە ئامۆژگاریمان دەکات! دەی بـڕۆ، بـڕۆ، لە هیچ شتێ ناگات و خۆی لەهەموو شتێك هەڵدەقورتێنێ.

دی گرێـۆ زۆر ڕەقـی هەڵسـابوو، بەسـوکایەتی شـانی هەڵتەکانـد، بەچاوێکی ڕق و قینە سەیری داپیرەی کرد، دواتر کشایەوە، هەستی



بە شەرمەزاری دەکرد، لەوەی خۆی لەکاری داپیرە هەڵقورتاندووە و تووشی ریسوایش بوو، کەچی نەیتوانی خۆی لەمە دوور بگرێت.

کاتژمێرێك تێپەڕ نەبوو، هەموو شتێکمان دۆڕاند، هەرچەندە کۆششێکی بەردەوامان دەکرد.

داپیرە هاواری کرد:

-با بگەڕێینەوەماڵەوە.

لەگازینۆکە دەرچووین، داپیرە لەتەواوی ڕێگەکە یەك وشەی نەدرکاند، کاتێك بەناو داربەڕووەکان تێپەربووین، خەریك بوو دەگەیشتینە هوتێلەکە، چەند ڕستەیەکی لەم جۆرەی لەدەم دەرچوو:

-ئای من چەند نەفامم! ئای چەند گێلم ! من تەنها پیرەژنێکی دەبەنگم...

کاتێك چووینە شوقەکەی هاواری کرد:

-چایەکم دەوێ... یەکسەر با خۆمان بۆ سەفەر ئامادە بکەین. سەفەر دەکەین.

مارتا بە سەرکێشی وتی: •

-دەتەوێ بۆ کوێ بچی، ئای خاتوونە چاکەکەم؟

داپیرە وەلامی دایەوە:



–ئەمە چ پێوەندی بەتۆ هەیە؟ تۆ تەنها خەریکی کاری خۆت بە، پۆتاپیچ، هەموو کەلوپەلەکان ئامادە بکە، دەگەڕێینەوە مۆسکۆ، پانزە هەزار روبڵی زیوم دۆڕاند.

– پانزە هەزار، ئەی خاتوونە ئازیزەکەم؟ خودایە، خودایە!

پۆتاپیچ بەمشێوەیە هاواری کرد، دەستەکانی لەیەکتر دا، بەزەیی و خەمباری دەرخست، گوایە بەمشێویە دڵی خاتوونەکەی دەداتەوە.

–دەی دەی دەبەنگ! دەیەوێ بگری! بێدەنگ بە، بڕۆ ئامادەکاری بۆ سەفەرەکە بکە، بە زووترین کات لیستی حسیابەکەم بۆ بهێنن.

منیش بۆ ئەوەی ئارامی بکەمەوە وتم:

–داپیرە، شەمەندەفەری داهاتوو، کاتژمێر نۆ ونیو دەڕوات.

–ئێستا کاتژمێر چەندە؟

–حەوت و نیو.

– شتێکی بێزارکەرە! دەی قەیناکە! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، فلسێکم پێنەماوە، برۆ ئەم دوو کاغەزەم بۆ ورد بکەوە، تا سەفەری پێ بکەم.

بەپێی فرمانەکەی ئەو رۆیشتم، دوای نیوکاتژمێر گەڕامەوە، بینم هەموو هاوڕێیان لەژوورەکەی داپیرە بوون، هەواڵی سەفەری



لەناکاوی بۆ مۆسکۆ، زیاتر لەهەواڵی دۆڕاندنەکەی رۆلێت سەرسامی کردبوون. دەبێ دوای رۆیشتنی داپیرە، ژەنەراڵ چی بەسەر بێ؟ هەرچەندە دەزانین، رۆیشتنی ئەو سامانەکە لەفەوتان رزگار دەکات؟ کێ قەرزەکانی دی گریێو دەداتەوە؟ ئەی خاتوو بلانش چاوەڕوانی مردنی داپیرە ناکات، بێگومان بۆ لای میری بچووك، یان کەسێکی دیکە دەڕوات. هەموو هەوڵیان دەدا دڵنەوایی داپیرە بکەن و ئارامی بکەنەوە. ئەمجارەش پاولینا ئامادە نەبوو، داپیرەش لەلایەن خۆیەوە جنێوی سووکی بە ئامادەبووان دەدا.

–ئەو جنۆکەیە لەمن دوور بخەنەوە! بۆچی خۆ دەخەنە ناو کاروباری من؟ ئەم ریشی تەگەیە چییە لەبەردەمم وەستاوە؟ ( سەیری دی گریێی دەکرد) ئەی تۆ تووتی چیت دەوێ ( مەبەستی خاتوو بلانش بوو) بۆچی هەڵدەبەزییەوە؟

چاوەکانی بلانش لەتوڕەیی پڕ بوو لە شەڕانگێزی، خۆی نەگرت بە منگەمنگ وتی:

–ئای لەو شەیتانە !...

لەناکاو دایە قاقای پێکەنین و لەژوورەکە چووە دەرەوە، لەلای دەرگاکە بە ڕووی ژەنەڕاڵی هاوارکرد و وتی:

–ئەم ژنە سەد ساڵ دەژی.

داپیرە بەدەنگێکی تیژ قیژاندی و بە ژەنەڕاڵی وت:



-کەواتــە تــۆ خوازیــاری مردنــی منــی! بــڕۆ لەبــەر چــاوم ون بــە. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ هـەموویان بخـە دەرەوە. ئێـوە چـیتان دەوێ، پارە پارەی خۆمە هی ئێوە نییە!

ژەنــەڕاڵ شــانی بــەرزکردەوە، دواتــر چــووە دەرەوە، دی گرێــۆش بەدوای ڕۆیشت.

داپیرە فرمانی بە مارتا کرد:

-بانگی پراسکۆڤیا بکە.

پێنج خولەکی نەخایاند، مارتا بە یاوەری پاولینـا گەڕایـەوە. پاولینـا تـەواوی ڕۆژەکـە لەگـەڵ منداڵـەکان لەژوورەکـەی بـوو (بێگومـان بـە ئەنقەست بڕیاری داوە لـە ژوورەکـەی بمێنێتـەوە) لەسـیمای خـەم و پەژارە دیاربوو.

داپیرە لەسەرەتای قسەکانی وتی:

-پراسکۆڤیا، وەك دەمێك لەمەوبەر ناڕاستەوخۆ زانیومە، ئایا ڕاستە مێـردی دایکـت، دەیـەوێ لەگـەڵ ئـەم ئافرەتـە بەدفـەڕە زەماوەنـد بکات، ئەو فەڕەنسییە، نازانم ئەکتەر یان شەڕانگێزە؟ پێم بڵێ ئەمـە ڕاستە؟

پاولینا وەڵامی دایەوە:



–داپیره، بەوردی شتێك نازانم، بەڵام لەقسەکانی خاتوو بلانشەوە دەردەکەوێ، وا بەباشتر دەزانێ، بابەتەکە بەنهێنی بێت، وای بۆ دەچم...

داپیره بە توندی قسەکانی پێ بڕی و وتی:

–بەسە. لەهەموو شتێك گەیشتم! هەمیشە دەمزانی بابەتەکان بەمشێوەیە کۆتایی دێت. هەردەم ئەم پیاوەم بە بە پوچترین ولاسارترین پیاوی سەر زەوی داناوە. ئەو شانازی بە پلەی ژەنەڕاڵ دەکات ( کاتێك خانەنشین کرا ئەم پلەی پێدرا، پێشتر کۆلۆنێل بوو) خۆی بە هەیبەت و مەزن نیشان دەدات. بەڵام ئازیزەکەم هەموو شتێك دەزانم، دەزانم بروسکە بەدوای بروسکەتان ڕەوانەی مۆسکۆ دەکرد (ئایا داپیره مردووە؟ ) (ئایا داپیره لەسەرە مەرگە؟) ئەمە مانای بروسکەکان بوو، ئێوە چاوڕوانی میراتتان دەکرد. ئەگەر ئەو سامانە نەبووایە ئەو مەخلۆقە( کە وابزانم ناوی دی گۆمێنگە! ) ڕازی نەدەبوو ژەنەڕاڵ بە تاقمە ددانەکەیەوە بکاتە خزمەتکار. دەڵێن ئەو ژنە پارەیەکی زۆری هەیە، بەسوو پارە بەقەرز دەدات، گەنجینەیەکی بۆخۆی دروست کردووە. پراسکۆفیا من تۆ تۆمەتبار ناکەم، تۆ بروسکەکانت نەناردووە، دەزانم تۆ خەسڵەتێکی سەیرتر هەیە... دەزانم .. تۆ زەردەواڵەی پێوەدانەکەت بە ئازارە ! لەگەڵئەوەش بەزەییم بەتۆ دێتەوە، چونکە من کاترینای دایکی خوالێخۆشبووی تۆم خۆشدەویست. گوێ بگرە بزانە چیت پێ دەڵێم: واز لەهەموو ئەوانە بهێنە، لەگەڵم وەرە. لێرە شوێنێك نییە

بۆی بچی، شیاو نییە ئێستا لەگەڵ ئەوانە بمێنیتەوە. چاوەڕوان بە (داپیرەی ئەمەی گوت کتاێك پاولینا ویستی وەلامی بداتەوە) با قسەکانم تەواو بکەم، من داوای شتێکت لێ ناکەم، تۆ دەزانی ماڵەکەم لە مۆسکۆ کۆشێکی گەورەیە، ئەگەر ویستت با نهۆمێك بەتەواوی بۆ تۆ بێت، دەتوانی هەفتەیەك بەتەواوی لە نهۆمەکەی خۆت بمێنیتەوە، ئەگەر هەڵسوکەوتی منت بەدڵ نەبوو، ئایا بەمە ڕازی دەبی یان نا؟

– ڕێگەم بدە با جارێ پرسیارێکت لێ بکەم: بەڕاستی تۆ دەتەوێ یەکسەر بڕۆی؟

– ئایا گاڵتەکردن بەسیمامەوە دیارە، کیژۆڵەکەم؟ کاتێك گوتم سەفەر دەکەم، واتە سەفەر دەکەم. ئەمڕۆ پانزە هەزار ڕۆبڵی زیوم لەو ڕولێتە نەفرەتییە دۆڕاند. چەند ساڵێکە نەزرم لەخۆم گرتووە، کڵێسایەك لەدەوروبەری مۆسکۆ هەیە، بە دار دروستکراوە، من نەزرم کردووە، بە بەرد نۆژەنی بکەمەوە، لەبری ئەو نەزرەم ئەمڕۆ خەریك بوو خۆم بە قومار لەناوبەرم، بۆیە ئازیزەکە ئێستا سەفەرەکەم دەکەم بۆ ئەوەی فریای نەزرەکەم بکەوم و کڵێساکەم نۆژەن بکەمەوە.

– ئەی ئاوی کانزایی داپیرە؟ تۆ هاتووی چارەسەری نەخۆشیەکەت بە ئاوی کانزایی بکەیت.

– واز له ناوی کانزاییت بهێنه ! ئەی پراسکۆڤیا تورەم مەکە !  ئایا به ئەنقەست وا دەکەی؟ پێم بڵێ: لەگەڵم دێی یان نا؟

پاولینا به هەڵچوونەوه دەستی بەقسە کرد:

–داپیره من زۆر منەتباری تۆم کە پێشنیازی ئەوەم بۆ دەکەی لەماڵەکەی تۆ بژیم. لەوانەیە تۆ لەهەندێك بارودۆخی من تێگەیشتووی، بۆیە زۆر سوپاسگوزارم، زیاتریش لەمە بەم پێشنیازەت وادەکەی من دواتر بەدواتەوه بێم، بەڵام ئێستا هەندێك هۆكار هەیە.. گرنگە... ناتوانم خۆم یەكلا بكەمەوه و یەكسەر بڕیار بدەم، بەڵام ئەگەر پانزە ڕۆژی دیكە لێرە بمێنیتەوه ئەوا لەوانەیە......

– کەواتە تۆ ناتەوێ؟

– ناتوانم، سەرەڕای ئەمەیش من نامەوێ برا و خوشكەكە جێبهێڵم. لەوانەیە بەتەنها بمێننەوه... ئەگەر تۆ دەتەوێ منداڵەكان لەخۆ بگرم، بێگومان داپیره من لەگەڵت دێم. لەوانەیە من شایەنی ئەوه بم ( بەگەرم و پەرۆشی پاولینا ئەو قسانەی دەكرد) بەڵام بێ منداڵەكان .. داپیره ناتوانم...

– باشە باشە ، مەگری ( لەڕاستیدا پاولینا بەخەیاڵی نەدەهات بگری، لەژیانیدا فرمێسكی نەڕشتووه) شوێنێك بۆ بێچووەكان دەدۆزینەوه، هێلانەكە زۆر فراوانە.. كاتی ئەوەش هاتووه منداڵەكان بچنە قوتابخانە. کەواتە تۆ ناتەوێ سەفەر بكەی.. ئاگادار



بـه پراسـكۆڤیا ! مـن چـاكەی تـۆم دەوێ.. دەشـزانم بـۆ دەتـەوێ سەفەر بكەی.. من هەموو شتێك دەزانم ئەی پراسكۆڤیا ! چاوەڕوانی چاكەیەك لەو فەڕەنسییە بچووك و چەپەڵە مەكە.

پاولینا سوور هەڵگەڕا، منیش لەرزیم (هـەموویان دەزانـن، تـەنها مـن نەبێت)

–ئێسـتا باسـی ئـەو بابەتـە ناكـەم. بـەڵام وریابـە نەكەویتـە نـاو كارەساتێكەوە، لەمەبەستی من دەگەی؟ تۆ كچێكی ژیری، دەروونم ئـازارم دەدا تـۆ خراپـەت تـووش بێـت، ئێسـتا هەرئەوەنـدە، بـڕۆ لەمڕۆوە روخساری خۆتم نیشان مەدە ! دەی بڕۆ. ماڵئاوا.

پاولینا وتی:

–داپیرە یاوەریت دەكەم.

– نـا بـێ سـوودە، نیگـەرانم دەكـەی، تـا تـەوقی سـەرم نیگـەرانت كردم.

پاولینا ویستی دەسـتی داپـیرە مـاچ بكـات، كەچـی داپـیرە دەسـتی خۆی كێشایەوە، كچەكەی روومەتەكانی ماچ كرد.

كاتێك پاولینا بەبەردەمم تێپەڕی بەخێرایی سـەیری كـردم، یەكسـەر ڕووی وەرگێڕا.

– ماڵئـاوایی لـەتۆیش دەكـەم، ئـەی ئەلێكسـی ئیڤـانۆڤیچ! تـەنها كاتژمێرێك بۆ سەفەری شـەمەندەفەرەكە مـاوە. وابـزانم لەگـەڵ مـن ماندوو بووی. ها ئەو پەنجا فردریكە بگرە.

وتم:

–زۆر سوپاس داپیره، بەڵام بوێری ناکەم....

داپیره هاواری کرد، بەزمانێکی توند و پڕ هەڕەشە وتی کە جورئەتی ئەوە ناکەی رەتی بکەیتەوە. منیش پارەکەم وەرگرت.

سەرەڕای ئەمەش وتی:

– ئەگەر ڕۆژێك لەمۆسکۆ بێ کار بووی، وەره لای من بۆ ئەوی کارێکت پێ راسپێرم.. ئێستا دەی برۆ.

بەرەو ژوورەکەی خۆم رۆیشتم، لەسەر قەرەوێلەکەم لەسەر پشت ڕاکشام، دەستەکانم خستە ژێر سەرمەوە. نیو کاتژمێرێك دواتر کارەسات روویدا، شتگەلێك هەن دەبێ بیری لێ بکەمەوە، بریارم دا یەکسەر قسە لەگەڵ پاولینا بکەم..! فەڕەنسی بچووك، کەواتە بابەتەکە ڕاستە! ئایا چی ڕوویداوە؟ پاولینا و دی گریۆ؟ ئەی خودایە ئەی خودایە! ئەمە چ نزیکبوونەوەیەکە؟

بەڕاستی عەقڵ چ باوەڕ بەمە ناکات. لەناکاو هەڵسامەوە، بۆ ئەوەی بچم بەدوای مستەر ئاستلی بگەڕێم، هەرچۆنێك بێت قسەی لەگەڵ بکەم، بێگومان دەزانم ئەو هەموو شتێك لەمن باشتر ئاگادارە.. مستەر ئاستلی؟ ئەمەش نهێنیەکی دیکەیە! بەلام هێندەی نەبرد لەدەرگای ژوورەکەم درا، کردمەوە بۆئەوەی بزانم کێیە؟ خۆم لەبەرانبەر پۆتاپیچ دۆزییەوە.

–گەورەی ئازیزم ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، خاتوونەکەم داوات دەکات.



–چ روویداوه؟ له سەفەرکردن پاشگەزبۆتەوە؟ تەنها بیست خولەك بۆ کاتی شەمەندەفەرەکە ماوە؟

– ئازیزەکەم، ئەو زۆر شڵەژاوە، ناتوانێ لەشوێنی خۆی ئۆقرە بگرێ.. زووکە، زووکە! ئەو داوای تۆ دەکات، بۆ خاتری خودا دوا مەکەوە.

هەریەکسەر چوومە خوارەوە، بینیم پیرەژن لە دالآنەکان بوو، جزدانی پارەکەی لەدەست بوو، هەرکە منی بینی وتی:

–ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، لەپێشمان بڕۆ، ئێمە دەچینە ئەوێ.

–بۆکوێ داپیرە؟

– دەبێ پارەکەم بگێڕمەوە، تەنانەت ئەگەر لەناوچم! دەی، بڕۆ، پرسیارم لێ مەکە، یاری تا نیوەی شەو بەردەوام دەبێ، ئەی وانییە؟

لەشوێنی خۆم حەپەسام، بیرم دەکردەوە، هێندەی پێ نەچوو بڕیاری خۆم دا.

–بەخواستی خۆت بکە ئەنتونین ڤاسیلڤنا، بەڵام من یاوەرییت ناکەم.

–بۆچی؟ چی روویداوە؟ چ میشوولەیەك ئێوەی گەزتووە؟

– بەخواستی خۆت بێ داپیرە، بەڵام من نامەوێ لە ئایندە پەشیمان ببمەوە. نامەوێ، نە تەماشاکەر دەبم، نە بەشدار، لێم



ببوره ئەنتۆنین ڤاسیلیڤنا، ئەمەش ئەو پەنجا فردریکی بەمنت دابوو، ماڵئاوا!

ئەمەم گوت پارە پێچراوەکەم خستە سەر چەکمەچە بچووکەکەی تەنیشت کورسی داپیرە، خواحافیزیم کردو رۆیشتم.

داپیرە قیژاندی و وتی:

–ئەم دەبەنگییە چییە؟ باشە، لەگەڵم نایەی، خۆم رێگەکە پێ دەزانم، وەرە پۆتاپیچ .. دەی هەڵمگرن!

من نەمتوانی مستەر ئاستلی بدۆزمەوە، گەرامەوە هوتێلەکە، لە کاتێکی درەنگی شەو، کاتژمێر یەکی شەو، لە پۆتاپیچم زانی کاری داپیرە چۆن تەواو بووە. هەموو ئەو پارەیەی دۆڕاندووە کە من بۆ گۆڕیبووەوە، واتە دە هەزار رۆبڵی دیکە. ئەو پۆلۆنییەی من پێشت دوو فلسێکم بە پاداشت پێ دابوو، بەدوای داپیرەوە بووە، ئەو لەیارییەکان رێنمایی کردووە، سەرەتا داپیرە پشتی بە پۆتاپیچ بەستووە، بەڵام هەر زوو دەریکردووە، لەم کاتەدا پۆلۆنی دەردەکەوێ، لەو رێکەوتە لەوانەیە ئەنقەستیش بێت کابرای پۆلۆنی لەزمانی رووسی دەگات، تەنانەت بەسێ زمانی تێکەڵ قسە دەکات، بەهەر شێوەیەك بێت لەیەکتر حاڵی دەبن، هەرچەندە داپیرە دڵرەقی لەبەرانبەر نواندووە و لێی توندکردووە، ئەو زیاتر خزاوەتە ژێر پێییەکانی.

پۆتاپیچ چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە و دەیوت:



–ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ ناکرێت ئەو پیاوە بەتۆ بەراورد بکرێت، تۆ وەك بەرێزێك لەخانەدانەکان مامەڵەت لەگەڵ دەکرد، کەچی ئەو (بەچاوی خۆم بینیم ، خوا لەناوبەریێ ئەگەر درۆ بکەن) بەبەرچاوی خاتوونەوە پارەی دەدزی، دووجاری گرت، جنێوی پێدا، بەهەموو وەسفێکی خراپ وەسفی کرد، قژی راکێشا، راستە درۆ ناکەم، خەڵکەکە هەموو پێدەکەنی، بەرێزەکەم، خاتوون هەموو پارەکەی دۆڕاند، هەموو ئەو پارانەی تۆ گۆڕیوەتەوە، گەڕاندمانەوە ئێرە، داوای پەرداخێك ئاوی کرد، وێنەی خاچی کێشا، یەکسەر چۆوە سەر جێگای خەوتنەکەی، لەخوا دەپارێمەوە خەونی فریشتەئاسا ببینی!

پۆتاپیچ بەمشێوەیە کۆتایی بەچیرۆکەکەی هێنا:

–ئای لەو وڵاتانی بێگانە! وتم ئەو سەفەرەی دەرەوە خێری پێوە نابێ، با پەلە بگەڕێنەوە شارە ئازیزەکەمان مۆسکۆ. لەوێ لەچیمان کەم بوو؟ .. باخچەیەکی جوان،، گوڵ هاوشێوەی نەبوو، هەوایەکی پاك و بێگەرد، درەختی سەوز، شوێنێکی فراوان.. نابێ بۆ دەرەوەی وڵات سەفەر بکەین ... ئای ..ئای .





# بەشی سێزدەم

نزیکەی مانگێك دەبێت، من دەستم بۆ ئەو یاداشتانە نەبردووە، کە پێشتر دەستم بەنووسینی کردبوو، من لەژێر تەوژمی هەست وسۆزێکم، هەرچەندە ئاڵۆز و شڵەژاوە، بەلاّم بەهێز و توندە. ئەو کارەساتەی هەستم بەنزیکبوونەوەی دەکرد، خێراتر لەوە ڕووی دا کە پێشبینیم دەکرد، هەزارجار بەهێزتر و جەرگبڕتر، بەلایەنی کەمەوە ئەوەی پێوەندی بەمنەوە وابوو. کۆمەڵێك ڕووداو ڕوویدا زیاتر لەموعجیزە دەچوو، یان من تا ئێستا بە موعجیزەیان دەزانم، سەرەڕای ئەوەش ناکرێت بە هیچ ناوێکی دیکە وەسف بکرێت، تەنها ڕێزپەر نەبێت، ئەگەر لەگۆشەنیگایەکی دیکەوە سەیری بکەین، بەلاّم سەبارەت بەمن ئەوا تەنها موعجیزەیەك بوو. ئەو ڕەفتارانەی لە ڕووداوەکان ئەنجامم دا، تا ئێستاش ناتوانم تێیان بگەم! وەك خەونێك بوو... تەنانەت شەیدابوونم بەپاولیناش هەر دەکرێت بەهەمان شێوە وەسف بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستیم بەهێز و ڕاستگۆ و دڵسۆزانە بوو، بەلاّم ئێستا بوو بەچی؟ هەندێك جار ئەو



پرسیاره لەناکاو بە زەینم دادێ:(( ئایا من ئەو کات شێت بووم؟ ئایا تەواوی ئەو کاتە لە نەخۆشخانەی شێتەکان نەبووم؟ ئایا ناکرێت تا ئێستاش من هەر لە شێتخانە بم؟ ئایا ناکرێت ئەوەی بەسەرم هات هەمووی تارمایی بوو، ئێستاش هەر تارماییە؟".

کێ دەزانێ؟ لەوانەیە من جارێکی دیکە دەستم بە کۆکردنەوەی ئەو یاداشتانە کردووە، جارێکی دیکە دەیخوێنمەوە، بۆ ئەوەی قەناعەت بەخۆم بکەم، کە لەنەخۆشخانەی شێتەکان نەنووسراوە! من ئێستا لەم جیهانە تەنیام، پایز هات، گەڵا دارەکان زەردبوون، من ئێستا لە شارێکی بچووکی مۆن دەژیم ( ئای شارە بچووکەکانی ئەڵمانیا چەند دڵتەنگ و غەمبارن !) لەبری ئەوەی بیر لە ئاییندە بکەمەوە، دەبینی لە ژێر کاریگەری یادەوەرییە نوێیەکانم، لەژێر کاریگەری ئەو گێژەلووکەی کە هێشتا لێم نزیکە، ئەو گێژەلووکەی کە ماوەیەك بە گێژەنی خۆی بەرزی کردمەوە، دواتر منی خستەوە سەر ئەرز. ئێستاش هەندێکجار هەست دەکەم گێژەنەکە لەگەڵ خۆی دەمبا، کاتێك بەسەرم تێدەپەڕێ، باڵەکانی بەسەر من دەکێشێ، بۆیە هاوسەنگیم لەدەست داوە، عەقڵم گێرۆدە، دەخولێمەوە، دەخولێمەوە، دەخولێمەوە.....

دواجار جێگیر دەبم و لەخولانەوە دەوەستم، کەواتە هەموو ئەو شتانەم بەوردی پوخت کردۆتەوە، کە لەم مانگەدا روویداوە. پێویستم بەوە هەیە جارێکی دیکە قەڵەم بەدەست بگرمەوە،



دواتریش کاتێك ئێواره دادێ من هەرگیز نازانم چی بکەم. سەیر ئەوەیە من هەندێك جار خۆم سەرقاڵ دەکەم، دەچم لە هۆڵێکی خراپ کە لەم شارە بچووکە بۆ خوێندنەوە تەرخانکراوە، ڕۆمانەکانی پۆل دۆکۆك ( بە وەرگێرانی ئەڵمانی) دەخوازم، ئەمانە جۆرە ڕۆمانێکن بەرگەیان ناگرم، لەگەڵ ئەوەشدا دەیانخوێنمەوە. سەیرم بەخۆم دێت، بۆچی دەخوێنمەوە؟ ئەم کارەی من وەك ئەوەیە، لەوە بترسم خوێندنەوەی کتێبێکی بەسوود، خۆخەریك کردن بە بابەتێکی پڕ بایەخ، لەو جیهانەی سیحر و شەیدابوونەم دابڕێنێ، کەماوەیەك تێیدا ژیاوم، هەموو ئەو هەست و سۆزەی لە دەروونم ماوەتەوە، بەلامەوە ئازیزن، تەنانەت لەوە دەترسم هەر پێوەندییەکی نوێ، ئەم یادەوەریانە بکاتە دووکەڵ! کەواتە دەبێت بەتەواوی ئاگاداری ئەمە بم؟ بەڵێ بێگومان، لەوانە بۆ چل ساڵی دیکە ئەو یادەم لەلا بمێنیتەوە.

کەواتە ئەوەتا منم قەڵەم بەدەستەوە دەگرم، بەهەرحاڵ دەبێت هەموو بابەتەکان بەخێرایی و بەپوختی بگێڕمەوە، چونکە من ئێستا هەستەکانم وەك پێشوو نەماوەتەوە.

سەرەتا با قسەکانمان بە بەسەرهاتی داپیرە دەست پێ بکەین و تەواوی بکەین: لەماوەیەکی کورت هەموو شتێکی دۆڕاند. دەبوو ئەمە ڕوویدات، هەر یەکێك وەك ئەو هەڵسوکەوت بکات بە خێرایی غلێ دەبێتەوە، وەك کەسێك لەسەر شاخێکی بفرین خشۆکە بکات.



داپیره تەواوی ڕۆژ قوماری دەکرد، تا کاتژمێر هەشتی شەو، من ئەوەم نەبینی بوو، بۆیان دەگێڕامەوە. پۆتاپیچ تەواوی ڕۆژەکە لەگازینۆ پاسەوانی دەبوو. دوو پۆلێنی ڕێنماییان دەکرد و بەنۆرە شوێنی یەکتریان دەگرتەوە، ئەو پۆلۆنییەی قژی ڕاکێشا و دەری کرد، پۆلۆنییەکی دیکە هاتە شوێنی، بەلاّم ئەوەی دووەمیان زۆر لەوەی یەکەم خراپتر بوو، هێندەی نەبرد ئەویشی دەرکرد، ئەم جارە ئەوەی یەکەمیان هاتەوە، کە شوێنی خۆی جێنەهێشتووە، بەڵکوو لەکورسییەکەی دواوە، وەستابوو، هەموو ساتێك سەری خۆی لەسەر شانی داپیرە شۆڕ دەکردەوە، داپیرە دواجار لە داڕووخانێکی تەواو بوو. پۆلۆنی دووەمیش شوێنی خۆی جێنەهێشتبوو، بۆیە دواجار یەکێك لە لای ڕاستی داپیرە و ئەویتر لە لای چەپی داپیرە جێگیر بوون. زۆرجار دەکەوتنە دەمەقاڵێ و شەڕ، لەئەنجامی ناکۆکیان لەسەر دانانی بڕی پارەکان، لەسەر تەواوی یارییەکە، تەنانەت جنێویان بەیەکتر دەدا و یەکتریان بەچەپەڵ و زۆڵ وەسف دەکرد، چەندان جنێوی دیکەیان دەدا کە دێتە سەر زاری پۆلۆنییەکان، دواتر ئاشت دەبوونەوە، بەهەرحاڵ، پارەیان ڕاست و چەوت دادەنا، ئەگەر ناکۆکیان هەبووایە، ئەوا بەدوو جۆر پارەیان دادەنا، بۆ نموونە یەکێکیان لە سووری دادەنا، ئەویتر لەڕەش، لەدۆڕاندنی داپیرە گەیشتنە ئاستێك، داپیرە بۆ دەرکردنیان پەنا بۆ سەرپەرشتیارەکە دەبات و فرمێسك لەچاوەکانی دێتەخوارەوە، ئەمەش ڕوودەدا هەردووك دەردەکرێن، کەچی



هەردووکیان بیانو دەگرن و هاوار دەکەن، گوایە داپیرە پارەی ئەوان قەرزارە، گوایە فێڵی لەوان کردووە و مامەڵەی شەرەفمەندانەی لەگەڵ ئەوان نەکردووە. ئەو ئێوارەیە پۆتاپیچ هەموو ئەو ڕووداوانەی بۆ گێڕامەوە، چاوەکانی پڕ بوون لەفرمێسك، دەیگوت گیرفانی خۆیان پڕ کردبوو، بە ئاشکرا بەبەرچاومەوە دزیان دەکرد و گیرفانیان پڕ دەکرد. بۆ نموونە یەکێك لەکارەکانیان ئەوە بوو، یەکێکیان پێنج فردریکی لەداپیرە وەك کرێ وەردەگرت، دواتر ئەم پارەیەی لەسەر مێزەکە دادەنا، ئەگەر براوە دەبوو، ئەوا پارەکە هی ئەو بوو، ئەگەریش دۆڕا ئەوا هی داپیرە بوو. کاتێك داپیرە تەواو بێزار دەبێت، ئەوە داوا لە سەرپەرشتاریەکە دەکات ڕێکاری پێویست بگرێتەبەر، پۆلیس دێت تەواوی گیرفای ئەم دوو پۆڵۆنییە خاڵی دەکاتەوە، هەرچەندە هات و هاواریش دەکەن، کەچی پۆلیس پارەکە بۆ داپیرە دەگێڕێتەوە. داپیەر ڕێز و شکۆیەکی تایبەتی لەلایەن سەرپەرشتیاران و کارگێڕی گازینۆکە هەبوو. کاتێك داپیرە پارەی نەما، ناوبانگی بەتەواوی شارەکە بڵاوبۆوە، تەنانەت ئەو خەڵکەی لەسەرتاسەری وڵاتەوە بۆ خۆشووشتن لە ئاوە کانزاییەکان دەهاتن، بەناوبانگ و بەخەڵکە سادەکەشەوە، بەرەو گازینۆکە دەهاتن، بۆئەوەی ئەو کۆنتێسە رووسیە بەساڵاچووە ببینن، کە گەڕاوەتەوە سەردەمی منداڵی و لەسەر مێزی ڕۆلێت (چەند ملیۆنێکی) دۆڕاندووە.



داپیره زۆر کەم نەبێت، ئەگینا نەیدەتوانی لە پۆلۆنییەکان نەجاتی بێت، کاتێك دوو پۆلۆنییەکە دەرکرا، ئەوا پۆلی سێیەم دەرکەوت، خزمەتەکانی خۆی بۆ داپیره پێشنیاز دەکرد، ئەوەی سێیەم زمانی رووسی بەتەواوی دەزانی، نایابترین جلی خانەدانەکانی پۆشی بوو، سەرەڕای ئەوەش بەخزمەتکار دەچوو. ئەم پۆلۆنییە سەرەتای شوێن پێی داپیرەی ماچ دەکرد و لەژێر پێی دەخزا، کەچی دواتر بەفیزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەوروبەری خۆی دەکرد، وەك دەسەلاتدارێکی ستەمکار فرمانی دەکرد، جۆرێك خۆی دەنواند وەك ئەوەی راسپاردەی داپیره بێت، هەر کەرەتێکی یارییەکە ئاوڕی لەداپیره دەدایەوە، سوێندی بەپیرۆزترین شت دەخوارد گوایە ئەو( پیاوێکی بەرێزە) تەنانەت یەك فلس لەداپیره وەرناگرێت. سەرەتا بەدروستی یاری دەکرد، بەڵام کاتێك دەیبردەوە، ئەوا داپیره خۆی نیازی نەبوو دەستبەرداری بێت، دوای کاتژمێرێك هەردوو پۆلۆنییەکەی دیکە گەڕانەوە، کەپێشتر لەگازینۆکە دەرکرابوون، لەدوای کورسییەکەی داپیره وەستان، دووبارە پێشنیازی خزمەتکردنیان دەکرد، پێیان دەگوت ئامادەن بچن شتی بۆ بکڕن. بۆتاپیچ سوێندی خوارد ئەو (پیاوە بەرێزە) چاوی لە دوو پۆلۆنییەکەی دیکە داگرتووە، پارەی بەنهێنی پێداون، تا بچن لای بۆفییەکە قاپێك سووپ، یان چاییەك بۆ داپیره بهێنن. هەردوو پۆلۆنییەکە کۆششیان دەکرد، تەنانەت لە ئێوارەکە کاتێك خەڵکەکە زانیان داپیره دوایین پارەی خۆی دەدۆڕێنێ، ئەوکاتە شەش پۆلۆنی



لەدەوروبەری داپیرە بوون، کەس پێشتر ئەوانی نەدیبوو، کاتێکیش داپیرە تەواوی پارەکەی دۆڕاند، ئەوا ئەوان هەرگیز بایەخیان بەداپیرە نەدەدا، لەسەر شانی ئەو یارییان دەکرد، فرمانیان دەکرد، قسەیان لەگەڵ (پیاوە بەڕێزەکە) دەکرد، ئەم پیاوەش بەتەواوی بوونی داپیرەی فەرامۆش کردبوو، داپیرە کاتێك بەتەواوی مایەپووچ بوو، کاتژمێر هەشتی ئێوارە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، ئەوکاتەش سێ چوار پۆڵۆنی بەدوایەوە بوون، بڕیاریان دابوو وازی لێ نەهێنن، ئەوان بەدوای کورسییەکەی رایان دەکرد و هاوریان دەکرد، بە ئاشکرا دەیگوت داپیرە فێڵی لێ کردوون، قەرزاری ئەوانە، کاتێك گەیشتنە هوتێلەکە، لەوێ پۆلۆنییەکان بەشەق دەرکران.

ئەگەر حسێبەکانی پۆتاپیچ ڕاست بێت، ئەوا داپیرە ئەو ڕۆژە نزیکەی هەشتا و شەش هەزار روبڵی دۆڕاندووە، جگەلەوەی دوێنێ دۆڕاندوویەتی. هەموو چەکەکانی بەسووی سەدا پێنج گۆڕیوەتەوە، هەموو پشکەکانی یەك لەدوای یەك فرۆشتووە. ئەوەی سەرسامی کردم ئەوەبوو داپیرە چۆن دەیتوانی ماوەی حەوت یان هەشت کاتژمێر لەسەر مێزی قومار بمێنێتەوە، یەك چرکە ئەوێ جێنەهێڵێ. پۆتاپیچ باسی ئەوەی دەکرد، دوو سێ جار داپیرە پارەیەکی زۆر وزەوەندی بدرۆتەوە، ئەمەش مکوڕبوونی زیاتر کردووە، ئومێدەکانی زیندووکردۆتەوە، بۆیە نەیتوانیوە بڕوا. قومارچییەکان چاك دەزانن، قومارچییەك لەتوانای هەیە، بیست وچوار کاتژمێر لە شوێنێك

بمێنێتـەوە، کاغـەزەکانی بەدەسـتەوە بێـت و چـاوی بـۆ ڕاسـت و چەپیش نەڕوانی.

لەم ڕۆژەدا، هەندێك ڕووداوی یەکلاکەرەوە لە هوتێلەکەمان ڕوویـدا، بەیانییەکـەی بـەر لـە کاتـژمێر یـانزە، هێشـتا داپـیرە لـە شـوێنی حەوانـەوەی خـۆی بـوو، هاوڕێیـان لەسـەر ئـەوە ڕێکـەوتن دوایـین کۆشـش بکـەن (ئەمـە بۆچـوونی ژەنـەڕاڵ و دی گرێـۆ بـوو) زانیـان داپیرە لە سـەفەرەکەی پاشـگەزبۆتەوە، گەڕاوەتـەوە گـازینۆ، بۆیـە هاتنە لای (تەنها پاولینا نەبێت) قسەی یەکلاکەرەوەیان لەگەڵ کرد، تەنانـەت زۆر دڵسـۆز وڕاسـتگۆیانە بـوون. ژەنـەڕاڵ دەلـەرزی و بەتەواوی ئەژنۆی دەشکا کاتێك وێنای ئـەو ئەنجامانـەی دەکـرد، لـە ڕەفتاری داپـیرە دەکەوێتـەوە.نـەیتوانی خـۆی لـەوە بگرێـت قسـەی توند بکات، دوای ئەوەی ماوەی نیو کاتژمێر تکا لـەدوای تکـا، لێـی پاڕایـەوە، تەنانـەت دانـی بـە خۆشەویسـتیەکی نـابۆ خـاتوو بلانـش (تەواو عەقڵی لەدەست دابوو) هاواری دەکرد و دەیقیژاند، پێیـەکانی لەئەرزەکە دەدات، بەهاوارکردنەوە دەیگوت داپیرە شەڕەفی هـەموو خێزانەکـەی لەکـەدار کـردووە، تەنانـەت شـەڕەفی هـەموو شـارەکە، بەڵکوو نـاوی رووسـەکانی زڕانـدووە. لـەکۆتایی قسـەکانی ژەنـەڕاڵ وتی" خاتوونەکە ئەمە کارێکە پۆلیس ڕێگریت لـێ دەکـات". داپیـەر تـەنها ئەوەنـدەی کـرد دارعەسـاکەی لـە ژەنـەڕاڵ بـەرز کـردەوە و دارعەسایەکی لێدا و دەری کرد.



هـەر ئـەو بەیانییـە، ژەنـەڕاڵ و دی گرێـۆ ، جارێـك یـان دووجـاری دیكە، قسەیان لەسەر بابەتەكە كرد: ئایا دەتـوانن پـەنا بـۆ پـۆلیس بەرن، ئایا دەتوانن بە پـۆلیس بڵـێن ئـافرەتێكی بەستەزمان هەیـە، بەساڵاچوو و بـەرێز، بـۆ هەڵسوكەوتی منداڵی گەڕاوەتـەوە، ئێسـتا خەریكـە سـامانەكەی بـەقومار لـەناو دەبـات... هتـد. ئایادەكرێـت بەرێگەیەك لە رێگەكان رێگری لێ بكرێت؟ بـەڵام دی گرێـۆ هێنـدەی نـەبرد، بەگاڵتـەوە شـانی هەڵتەكانـد، بـەرووی ژەنـەڕاڵ پێكـەنی، ژەنەڕاڵ بێ ئۆقرە ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەكەی دەكرد. دی گرێـۆ دەسـتەی بەجوڵەیـەكی رقـەوە بـەرزكردەوە، هـەرگیز نەگەڕایـەوە. ئێوارە زانرا دوای ئەوەی گفتوگۆیەكی نهێنی لەگەڵ بلانش كـردووە، هۆتیلەكەی بەجێهێشتووە. سەبارەت بەخاتوو بلاَنش ئـەو بەیانییـە هەندێك رێكاری توندی ئەنجام دا: بۆ دوایین جار ژەنـەڕاڵی دەركـرد، تەنانەت بەرگەی ئـەوە نـاگرێ لـەدوورەوەش سـەیری بكـات. كاتێـك ژەنەڕاڵ بەدوای بلانش دەچێتە گازینۆ، دەبینی ئەم خاتوونـە خـۆی بـەقۆڵی مـیری بچـووك هەڵواسـیوە، خـاتوو بلاَنـش و دی كـۆمێنگی بێوەژن خۆیان لەژەنەراڵ نەناس دەكەن، تەنانـەت مـیری بچـووكیش سـلاَوی لێ ناكـات. خـاتوو بلانـش تـەواوی رۆژەكـە خـەریكی مـیری بچـووك دەبێـت، بەهــەموو شـێوەیەك دەوروخـولی دەدات و خـۆی خۆشەویسـت دەكـات، بــۆ ئــەوەی دواجــار ئــەویش شــتێكی یەكلاكەرەوەی پێ بڵێ! كەچی مەزنـدەكانی بلانـش زۆر هەڵـە بـوو، بەداخەوە! ئێوارە دەركەوت میر لـە ئـەیوب هـەژارترە. تەنانـەت بـۆ



ئەوە پەنای بۆ بلانش هێناوە هەندێك پارەی بەقەرز پێ بدات، تا لە رۆلێت قومار بکات، بەمشێوەیە بلانش بەتورەیی مێر دەردەکات، بەخەمباری ئەو ئافرەتە خۆی لە ژوورەکەی زیندانی دەکات، هەرگیز نەدەهاتە دەرەوە.

بەیانی هەمان رۆژ چوومە لای مستەر ئاستلی، یان بڵێ تەواوی بەیانییەکە بەدوای گەڕام، لەهیچ شوێنێك نەبوو، لەماڵەوە نەبوو، لەگازینۆ، لە باخچەکەش نەبوو، تەنانەت نانیشی لە هوتێل نەخواردبوو، کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕ چاوم پێکەوت لە وێستگەی شەمەندەفەر بەرەو هۆتێل ئینگلتەرا دەگەڕایەوە. بەخەمباری هەنگاوی دەنا، هەرچەندە بۆ کەسێك زەحمەتە هەست بە شلەژان و سەرقاڵی بکات لەسیمای ئاستلی. بەخۆشەویستی دەستی تەوقەکردنی درێژکرد و بەشێوازە باوەکەی خۆی وتی (ها !)، بەڵام نەوەستا بەڵکوو هەنگاوەکانی خێراتر بوو، منیش بەدوای کەوتم، سەرەڕای ئەوە من هەستم بەشەرمەزاری دەکرد باسی پاولینای لەگەڵ بکەم، بەڵام ئەو بایەخێکی بەم بابەتە نەدەدا، باسی ئەوەم بۆ کرد چی بەسەر داپیرە هاتووە، ئەو بە بایەخەوە گوێگرت بوو، دواتر شانی هەڵتەکاند.

وتم:

—هەموو شتێك دەدۆڕێنی.

وەلامی دایەوە:



-ئۆی، هەڵبەتە... کاتێك سەفەرم کرد، بینیم بۆ قومارکردن دەچووە گازینۆ، من بێگومان بووم کە دەدۆڕێ. ئەگەر کاتم هەبوو دەچمە گازینۆ، بۆ خۆم سەیری دەکەم، بەزمێکی خۆشە..

-بۆ کوێ سەفەرت کرد؟

-بۆ فرانکفورت.

-بۆ ئیش وکار؟

-بەڵێ.

لەچی دەمتوانی پرسیاری زیاتر لێ بکەم؟ کاتێك من لەگەڵی دەڕۆیشتم ئەوا لەناکاو بەرەو هۆتێلی (چوار وەرزەکە) ڕۆیشت، کەلەسەر ڕێگەکەوە بوو، بەسەر خواحافیزی لێکردم و ون بوو. کاتێك بەرەو شوێنەکەی خۆم دەگەڕامەوە لەوە دڵنیام بوو دوو کاتژمێری دیکە قسەم لەگەڵ بکردبووایە نەمدەتوانی شتێکی لێ هەڵکرێنم، چونکە من پرسیارێکم نەبوو ئاراستەی بکەم! بەڵی بەدڵنیایی وا بوو، من نەمدەتوانی پرسیارەکانم بۆ ئەو داڕێژم.

پاولینا تەواوی ڕۆژ لەگەڵ منداڵەکان و خزمەتکارەکە لە باخچەکە پیاسەی دەکرد، یانیش بەتەنها لەماڵەوە دەمایەوە. ماوەیەکە لەدیداری ژەنەڕاڵ رادەکات، هیچ قسەیەکی لەگەڵ ناکات، یان بەلایەنی کەمەوە قسەی جددی لەگەڵ ناکات. ماوەیەکە تێبینی ئەوەم کردووە. لەگەڵئەوەشدا من دەمزانی بارودۆخی ژەنەڕاڵ



چـوونە، ئـەو دەبێـت قسـەی لەگـەڵ ئەوکچـە کردبـێ، لەوانیـە بەشێوەیەکی گشتی قسەیان لەسەر کاروبـاری گرنگـی خێزانەکـەیان کردبێ. من دوای قسەکردنم لەگەڵ مستەر ئاستلی گەڕامەوە هوتێـل، بە پاولینا و منداڵەکان گەیشـتم، لـە چـاوەکانی نیشـانەی هێمنـی و لەسەرخۆییم بەدی کـرد، وەك ئـەوەی گێـژەنی خێزانەکـە پێوەنـدی بەو نەبووبێت. کاتێك سلاوم لێکرد بە جوڵەی سەر وەلامـی دامـەوە، بە نیگەرانی چوومە ژوورەکەی خۆم.

بێگومـان خـۆم لـەوە دووردەگـرت قسـەی لەگـەڵ بکـەم، لـەکاتی ڕووداوەکەی باڕۆنەوە جارێك ڕێکەوتی ئەوم نەکردووە. بابەتـەکم بـە بابەتی شەڕەف لەقەڵەم دەدا، بـەلام بەتێپـەڕبوونی ڕۆژگـار تـوڕەیی من زیاتر و زیاتر دەکولا: وا دابنێ منی خۆشناوێ، ئەمە مانای ئـەوە نییە بەمشێوەیە پێ لـە سـۆزی مـن بنـێ، یـان بـەو ڕقـە ڕووبـەڕووی هەستی من ببێتەوە. دەیزانی بەڕاستی من ئەوم خۆشدەوێ. ڕێگـەی پێدام بەم شێوەیە قسە بکەم، ڕاستە بابەتەکە بەنامۆیی دەستی پێ کرد، ماوەیەکە تێبینی ئەوەم کـردووە (ئـەم ماوەیـە تێپـەڕیوە، دوو مانگی بەسەرچووە) ئەو دەیویسـت بمکاتـە هـاوڕێی خـۆی، جێگـەی دڵنەوایی نهێنی پارێزی بم، لـەم پێنـاوەدا چـەندان هـەوڵی دا، بـەلام سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە پێوەندییـەکانمان بەشـێوە سـەیر و نامۆکـە بەردەوام بـوو. بۆیـە بەمشـێوەیە کـە هـەبوو قسـەم لەگـەڵ دەکـرد،



ئەمــەش خۆشەویســتیەکەی شـێواند، کەچـی ئـەو هـیچ ڕێگرییــەکم
لەقسەکانم نەدەکرد؟

ئەو هیچ شتێکی بۆ ڕێگری کردن لـەمن نـەدەکرد، تەنانـەت زۆرجـا
هانی دەدام قسە بکەم.. بێگومان بۆئـەوەی گاڵتـەم پـێ بکـات، مـز
تـەواو لـەوە دڵنیـام. هەسـتم بـەوەکردبوو، چـێژی لەقسـەکانی مـر
وەردەگرت، گوێبیستی من دەبـوو، تـا ئەوپـەڕی ئـازارم دەچەشـت،
کەچـی لـەناکاو هەڵسـوکەوتێکی دەنوانـد نیشـانی ڕقبوونـەوە و بـێ
بایەخی و کەمتەرخەمی بێت. ئەو چاك دەزانێ من بێ ئەو ناژیم، هـ
ئەوەتا سـێ ڕۆژ بەسـەر ڕووداوەکـەی بـاڕۆن تێپـەڕیوە، کەچـی مـز
تائێستا ناتوانم بەرگەی جیابوونەوە بگرم. چەند ساتێك لەمەوبەر کا
لەنزیك گازینۆکە بینیم، دڵم کەوتە خورپەوە، ڕەنگم بزڕکـا، ئـەویش
ناتوانێ بێ من بژی! وەو پێویستی بەمنە ...ئایا دەکرێت وەك ئەو
بێت پێویستی بە بەهلولێك هەبێت؟

پاولینا نهێنیەکی هەیە.... ئەمە ڕوونە. گفتوگۆکانی لەگـەڵ داپـیرە
وەك خەنجەرێك بوو، بۆ دڵم. من هەزار جار داوام لێ کردووە، لەگەڵ
ڕاشـکاو وڕاسـتگۆ بێـت، کەچـی ئـەو هـەردەم بـە ڕق و کینـە منـی
دوورخسـتۆتەوە. لـەبری ئـەوە داوام لـێ بکـات ژیـانی خـۆم بکەمـا
قوربانی ئەو، داوای ئەنجامدانی کاری ڕیزپـەڕی لێکـردووم، وەك ئـەو
کارەی لەبەرانبەر باڕۆن ئەنجامم دا. ئایا ئەمە بابەتێك نییـە جێگـای
سەرنج بێت؟ ئایا دەکرێـت فەڕەنسـیەکە لـەلای ئـەو هـەموو شـتێك



بێت؟ یان مستەر ئاستلی؟ لێرەدا تێگەیشتن لەبابەتەکە ئەستەم دەبێ، گومانی تێدانییە.... لەگەڵئەوەشدا خودایە من چ سەخترین ئازار دەکێشم !

کاتێك گەیشتمە ژوورەکەم، تورە و بێزار، ئەم چەند دێرەم بۆ پاولینا نووسی:

" پاولینا ئەلسکەندرۆڤنا ! من لە کۆتاییەکە نزیك دەبمەوە. ئەمە روونە پێوەندی بەتۆش هەیە. بۆ چەندەمین جار دووبارەی دەکەمەوە: ئایا پێویستت بەژیانی منە؟ ئەگەر دەزانی لەکارێك سوودبەخش دەبم بۆ تۆ، بە پێی خواستی خۆت هەڵسوکەوت بکە. ئێستا من لەژوورەکەی خۆمم، زۆرترین کات لەوێ دەمێنمەوە، ناچمە هیچ شوێنێك، ئەگەر پێویستت بەمن بوو بەدوام بنێرە، یان بۆم بنووسە".

نامەکەم پێچا، فرمانم بە خزمەتکاری نهۆمەکە کرد، بۆ پاولینای ببات، بیداتە دەستی خۆی، من چاوەڕوانی وەڵامم نەدەکرد، کەچی خزمەتکارەکە دوای سێ خولەکە گەڕایەوە، وتی سڵاوی بۆ تۆ هەیە.

کاتژمێر حەوتی ئێوارە ژەنەڕاڵ بەدوای منی نارد.

ژەنەڕاڵ لەژوورەکەی بوو، بەشێوەیەك جلی پشوو بوو، لەوەدەچوو بەنیازی چوونە دەرەوە بێت، کڵاو و عەساکەی لەدیوەخانەکە بوو. کاتێك چوومە ژوورەوە بینیم لەناوەڕاستی



ژوورەکە وەستاوە قاچەکانی کردووەتـەوە، سـەری نـزم بـوو، لەبـەر خـۆی قسـەی دەکـرد. هەرکـە منـی بینـی، بـەرەو رووی مـن هـات، هێنـدەی نـەمابوو هـاوار بکـات، مـن بـێ خواسـتی خـۆم هـەنگاوێك گەڕامەوە، لەوانەبوو ڕابکـەم، بـەڵام هـەردوو دەسـتی گـرتم، بـەرەو قەنەفەکەی بـردم، خـۆی دانیشـت و منـی لەبـەردەمی خـۆی لەسـەر کورسیەك دانا، دەستی کرد بـە پاڕانـەوە و کڕوزانـەوە، دەسـتەکانی منـــی بەرنـــەدەدا، لێوەکـــانی دەلـــەرزین، فرمێســـك بەچـــاوەکانی دەهاتەخوارەوە:

– ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، رزگـارم بکـە، رزگـارم بکـە، بـەزەییت بـەمن بێتەوە.

ماوەیەکی زۆر نەمدەتوانی لەشـتێك بگـەم، بێوچـان قسـەی دەکـردو هەرچرکەسـاتێکیش ئەمـەی دووبـارە دەکـردەوە" بـەزەییت بـەمن بێتـەوە". دواجـار مەزنـدە ئـەوەم کـرد ئـەو داوای شـتێکی وەك ئامۆژگـاریم لـێ دەکـات، دەزانـێ هـەموو جێیـان هێشـتووە، پـەژارە بەرۆکی گرتووە، بۆیە منی وەبیرهاتووەتەوە، بۆشتێك بـەدوای منـی نەناردووە، بەڵکوو دەیەوێ قسە بکات، بەردەوام قسە بکا.

ئەو عەقڵی لەسەر نـەماوە، یـان بەلایـەنی کەمـەوە، گیرۆدە بـووە، ئەو دەستەکانی بـە پاڕانـەوە دەخسـتە سـەر یـەك، هێنـدە نـەمابوو بکەوێتە سەرئەژنۆم، تکاکارم بێـت. ( ئایـا دەزانـن تکایەکـەی لـەمن



چی بوو؟) یەکسەر بچمە لای بلانش، بپارێمەوە و هانی بدەم بگەڕێتەوە لای ژەنەڕاڵ زەماوەندی لەگەڵ بکات.

بە هەڵپەوە وتم:

-ژەنەراڵ ڕێگەم بدە! خاتوو بلانش بەهیچ شێوەیەك سەرنجی بوونی من نادات، من دەتوانم چی بکەم؟

بیانوگرتن و خۆ دوروخستنەوە بێهودە بوو، ئەو لەهیچ شتێك نەدەگەیشت کە بۆی باسدەکرا، تەنانەت قسەیەکی زۆری لەبارەی داپیرەوە کرد، قسەکانی بێسەروبەر بوون، تەنانەت لە بیرۆکەی پەنابردنە بەر پۆلیس پاشگەزنەبۆوە.

لەکاتێکدا لە تورەیی دەکولاً، لەناکاو وتی:

-لە ولاّتی ئێمە... لەولاّتی ئێمە... مەبەستم ... لەو ولاّتەی ڕێکوپێکە دەسەلاّتی بەرپرسی هەیە، ئەم جۆرە پیرەژنانە ڕاستەوخۆ دەخرێنە ژێر ڕاسپاردەیی..

لەناکاو بەزمانی شکۆوە قسەی دەکرد، لە شوێنی خۆی هەڵسایەوە، بە هاتۆچۆ ژوورەکەی دەپێوا، وەك ئەوەی بەخەیاڵی قسە لەگەڵ کەسێك بکات لەسووچێکی ئەم ژوورە بێت:

-بەڵی پیاوی بەڕێز و ئازیز... تۆ ئەمە دەزانی.. دەبێ بزانی کارەکەش بەم شێوەیە دەبێت. .. بەڵی.. لەولاّتی ئێمە پیرەژنی لەم جۆرە رادەگیرێت. بەڵێ بەڕێزم ... ئای . ئای لەبەدبەختی من.



دووباره کەوتەوە سەر ئەرز، دوای چرکەیەك، بەپەلە و بەهەناسە سوواری وەك ئەوەی بخنکێ، قسەکانی دەست پێ کردووە، وەك ئەوەی خەون ببینێ، باسی ئەوە بۆ کردم چۆن خاتوو بلانش نایەوێ شووی پێ بکات، چونکە داپیرە لەبری هەواڵی مردنەکەی، خۆی هاتووە، کەواتە ڕوون ژەنەڕاڵ میراتی نابێت، ژەنەڕاڵ هێشتا وادەزانی من هیچ شتێك نازانم، ویستم قسە لەسەر دی گرێو بکەم، بەڵام بە ئاماژە منی وەستاند و وتی:

–بێ نامووس! هەموو شتەکانم لای ئەو کردۆتە بارمتە، ئێستا وەك کرمۆڵەیەك ڕووتم، ئەو پارەیەی تۆ بۆ منت هێنابوو... ئەو پارەیە... نازانم چەندە... بەهەر حاڵ ئەو بڕە پارەیە، واز بزانم حەوسەد فرانك... هەر هێندەم لاماوە، هەر هێندە ماوە. ئێستاش نازانم ... نازانم...

بەسەرسامییەوە هاوارم کرد:

–ئەی چۆن کرێی هوتێلەکە دەدەی؟ ئەی دواتر.....؟

بەخێرایی سەیری کردم، وا دیارە لەهیچ شتێك ناگات، تەنانەت نابیستێ. ویستم قسەکانم بێنمە سەر پاولینا ئەلکسەندرۆڤنا و منداڵەکان، بەپەلە دەیوت (بەڵێ، بەڵێ) دواتر یەکسەر ڕژایەوە سەر بابەتی ئەو میری سەفەری کردوو، لەگەڵ خاتوو بلانش... ئەوکاتەش. .. ئەوکاتەش.



ئەو کاتە لەناکاو رووی لەمن کرد و وتی:

–ئەو کاتە من پەنا بۆچی ببەم... ئەی ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ؟ چیم بەسەر دێت؟ ئەی خودا ئەی خودایە... پێم بڵێ ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ: ئەمە ناهەقییە؟ ئەمە ناهەقییە؟ ئەی ئەمە ناهەقی نییە؟

لەپڕ دەستی بەگریان کرد و بەسەخاوەت فرمێسکی دەڕشت.

بەڵام کاتێك پیاوەکە لەم حاڵەتە بێت، مرۆڤ چی لەدەست دێ بۆی بکات، تەنانەت جێهێشتن بەتەنیا دوور نییە لەمەترسی: لەوانەیە شتێکی بەسەر بێت. هەر چۆنێك بێت بە رێگەیەك خۆم لێی نەجات دا، بەڵام بەخزمەتکارە ژنەکەم وت ناوە ناوە سەری لێ بدات، لەحاڵی ژەنەراڵ ئاگادار بێتەوە، لەگەڵ خزمەتکاری نهۆمەکەش قسەم کرد، ئەو گەنجێکی زۆر وریایە، بەڵێنی پێدام، کە زۆر وریا دەبێت.

هەرکە ژەنەراڵم بەجێ هێشت، پۆتاپیچ هات تکای لێکردم بچمە لای داپیرە، کات نزیك هەشتی ئێوارە بوو، داپیرە تازە لەگازینۆکە گەڕابووەوە، هەڵبەتە دوای ئەوەی دوایین فلسی دۆڕاندبوو. چوومە لای داپیرە، ئەم پیرەژنە بەساڵاچووە، لەسەر کورسیەکەی بەشەکەتی کەوتبوو، بەڕوونی دیار بوو نەخۆش بوو، ماریتا چایەکی بۆ هێندە بەزۆری هەندێکی لێ فڕکرد، دەنگی داپیرە بەتەواوی گۆڕا بوو.



به هێواشی سەری دانەواند و بەسەنگینی وتی:

–ئێـوارەت بـاش، ئازیزەکـەم ئەلێکسـی ئیڤـانۆڤیچ، لـێم ببـوورە جـارێکی دیکـە نیگـەرانت دەکـەم، وادەزانم تـۆ لەبەرانبـەر ژنێکـی بەساڵاچـوو لێبوردەیـت. هاورێیەکـەم هـەموو شـتێکم لـەوێ دانـا، نزیکـەی سـەد هـەزار رۆبڵـم دۆڕانـد. تـۆ لەسـەر هـەق بوویـت کاتێـك رەتکـردەوە یـاوەریم بکـەیت. ئێسـتا هـیچ شـتێکم نییـە، تەنانـەت فلێسـکم نییـە، حەزناکـەم چـرکە سـاتێك لێـرە بمێنمـەوە، دەبێـت کاتژمێر نۆ و نیو سەفرە بکەم، بۆیە بـەدوای هـاورێ ئینگلیزەکـەی تۆم ناردووە کە ناوی مستەر ئاستلییە، بۆ ئەوەی سێ هەزار فـرانکم بەقەرز پێ بدا، دوای هەشت رۆژ بۆی دەگەرێنمەوە. پێی بڵێ خـراپ تێنەگات، رەتیشـی نەکاتـەوە قـەرزم پـێ بـدات، ئازیزەکـەم هێشـتا دەوڵەمەندم، من سێ گوند و دووخانووم هەیە، هێشتا پـارەم مـاوە، بەڵام خۆ هەموو پارەو سامانەکەم لەگەڵ خۆم نەهێناوە. ئەم قسانە دەکەم بۆ ئەوەی هاورێیەکـەت دڵنیـا بـێ و نیگـەران نـەبێت... هـا. ئەوەتا گەیشت، وا دیارە پیاوێکی جوامێرە.

مستەر ئاستلی بە پەلە بەپیر هاواری داپـیرە هـاتبوو، هـەر یەکسـەر سێ هەزار فرانکی بەقەرز دا، بێ هیچ دوودڵی و قسەکردنێك، داپـیرە کۆمپیاڵیەکی بۆ ئیمزا کرد و ئەویش خواحافیزی کرد و رۆیشت.

– ئێستایش ئەلێکسـی ئیڤـانۆڤیچ وازم لـێ بهێنـە، تـەنها کاتـژمێر و نیوێك بۆ سەفەرەکەم ماوە، تۆزێك لەجێگاکەم رادەکشێم، ئێسـقانم



ئـازارم دەدا، داوای لێبـوردن دەکـەم.. مـن پیرەژنێکـی گـەوجم، لەمەودوا لەبەردەبەنگی گلەیی لەگەنجان ناکەم، تەنانەت من ئێستا شەرم دەکەم گلەیی لە هاوڕێ بەستەزمانەکەت ژەنەڕاڵ بکەم، بـەلآم هیچ پارەیەکی پێ نادەم. نابێ ئەمەی پێناخۆش بێ، ئەو ئـاژەڵێکی گەورەیە... کەچی مریشکێکی پیرم، ژیرییم لەو زیاتر نییە، خـوا زوو یـان درەنـگ تۆڵـە لـە تاوانکـاران دەکاتـەوە. دەی خـوات لەگـەڵ... ماریتا هەڵمستنەوە.

دەمویسـت داپـیرە بـەڕی بکـەم، کەچـی لەهـەمان کـات پێشـبینی ڕوودانی شتێکی دیکـەم دەکرد، وا خـەیاڵم دەکـرد هـەر لـەو کاتـەدا شـتێك ڕوودەدا، نـەمتوانی لەژوورەکـەم بمێنمـەوە، چـوومە نـاو هۆڵـەکان دواتـریش بەڕێگـەی داربـەڕووەکان تێپـەڕیم بـۆ ئـەوەی پیاسەیەك بکەم. نامەکەم بۆ پاولینا یەکلاکەرەوە و زۆر ڕۆشن بـوو، بێگومان کارەساتێك ڕوودەدات، لـە هۆتێلەکەم بیستووە دی گریـۆ ڕۆیشـتووە، کەواتـە پوختەکـەی ئەوەیـە: ئەگـەر پاولینـا مـن وەك هاوڕێیەك ڕەت دەکاتـەوە، ئـەوا وەك خزمـەتکارێك قبـوولّم دەکـات، چونکە ئەو پێویستیی بە منە، تەنانەت بۆ شت کڕینیش بێـت، بـەڵی پێویستی بەمنە ئەمە زۆر ڕۆشنە !

کاتی ڕۆیشتنی داپیرە هات بـە پەلـە چـوومە وێسـتگەکە، سـواری شەمەندەفەرەکەم کرد، کاتێك هەموو شوێنی خۆیان گرت، داپیرە بە ماڵئاواییکردن وتـی:

-ئەی هاوڕێکەم، سوپاسی ئەم بەڕێکردنەت دەکەم کە خاڵی بوو لەهەر مەبەستێك، ئەمە بۆ پراسکۆڤیا دووبارە بکەوە، کە دوێنی پێم وت، من چاوڕوانی ئەوم.

بەرەو ژوورەکەم بە قاندرمەکە سەرکەوتم،کاتێك بەلای ژوورەکەی ژەنەراڵ تێپەڕیم، خزمەتکارەکەم بینی، لە ئەحواڵی ژەنەراڵم پرسی بەدڵتەنگی وەلأمدایەوە وتی:

-کێشەیەکی نییە، گەورەم

چوومە لای کەچی لەلای دەرگا تووشی شۆك بووم، ژەنەراڵ و خاتوو بلانش بەقاقا پێدەکەنین. دی کۆمێنگی بێوەژنیش لەلایان بوو، لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو. ئاشکرا بوو ژەنەراڵ لەخۆشیا عەقڵی لەکەللە نەمابوو. بەردەوام قسەی پڕوپووچی دەکرد. تووشی تۆرەی خۆشی وشادیی بووبوو، دەموچاوی بە گەندەموو داپۆشراو و تەنانەت چاوەکانیشی ون کردبوو.

دواتر زانیم، کاتێك خاتوو بلانش مێر دەردەکات و دەزانێ چ خەم وپەژارەیەك بەسەر ژەنەراڵ هاتووە، بڕیار دەدا دڵنەوایی بکات و سەردانێکی کورتی بکات، بەلأم ژەنەراڵی داماو نازانێ لەو کاتەدا چارەنووسەکەی دیار بووە، بلانش جانتاکانی پێچاوەتەوە و کەلوپەلەکەی ئامادەکردووە، بۆ ئەوەی بە شەمەندەفەری بەیانی سەفەری پاریس بکات.



ماوەیەکی کورت لەبەردەم ژوورەکەی ژەنەڕاڵ ماوەمەوە، لە چوونە ژوورەوە پاشگەزبوومەوە، بێئەوەی کەس چاوی بەمن بکەوێ، ڕۆیشتم، بەرەو ژوورەکەم سەرکەوتم، کاتێك دەرگەکەم کردەوە، لە تاریکایی ژوورەکە بینیم کەسێك لەسەر کورسی لەنزیك پەنجەرەکە دانیشتووە، کە چوومە ژوورەوە هەڵسایەوە، بەپەلە لێی نزیك کەوتمەوە.. بینیم، هەناسەم نەدەهات، ئەمە پاولینایە.





# بەشی چواردەم

قیژەیەکم لەدەم دەرچوو.

بەدەنگێکی سەیر وتی:

–چیتە؟ چیت بەسەرهاتووە؟

ڕەنگی هەڵبزرکابوو، بێ سەلیقە دیاربوو:

–چیمە؟ چیم بەسەر هاتووە؟ تۆ.... ئەوە تۆی ... لێرە.. لەلای من؟

– کاتێك من دێم، بەتەواوی دێم، ئەمە نەریتی منە. ئێستا ئەمە دەبینی. ئەم مۆمە داگیرسێنە.

گوێڕایەڵی فرمانەکەی بووم، کە هەڵسامەوە و لەمێزەکە نزیك بوومەوە، بیینم نامەیەکی هەڵپچڕاو لەسەر مێزەکە دانراوە، فرمانی کرد بی خوێنمەوە:

–بخوێنەوە.

بێدەنگ بوو، منیش دەستم بۆ نامەکە برد:

–ئەمە دەسخەتی دی گرپۆیە.



دەستەکانم دەلەرزی، ڕستەکان لەبەردەمم سەمای دەکرد، ئێستا ناوەڕۆکی نامەکەم لەبیرکردووە، بەلام نامەکە بەم مانایە ئەبوو، ئەگەر وشە بە وشە بەمجۆرە نەبێت:

" خاتوونەکەم، هەندێك بارودۆخی ئازاریەخش وادەکات بێ دواکەوتن سەفەر بکەم، تێبینی ئەوەم کردووە، بێگومان تۆ بەئەنقەست خۆت لەوە بەدوور گرتەوە، بەر لەوەی هەموو شتێك ڕوون بێتەوە، لەگەلّ یەکتر ڕاشکاو بین. گەیشتنی پیرەژن لەبری بروسکەی مردنی، ڕەفتاری دەبەنگانەی ئەو، هەموو دوودڵییەکانی ڕەواندەوە. شڵەژانی کاروباری تایبەتم، ڕێگەم پێ نادات، لەو خەیاڵە شیرینانە بەردەوام بوو، کەماوەیەکە بۆ خۆم دروستم کردووە. بەداخم بۆ ئەو شتانەی روویدا، بەلاّم تکا دەکەم وا لە ڕەفتاری من نەگەی، کە پیاوێکی بەرز و مرۆڤێکی شەڕەفمەند لەکەدار بکات. من سامانی خۆم هەمووی بۆ دانەوەی قەرزی مێردی دایکت تەرخان کرد، بۆیە ئێستا ناچارم ئەوەی ماوە بۆ کاروباری تایبەتی خۆم بێت. بە هاوڕێیانم ڕاگەیاندووە لە پترۆسبۆرگ، پەلە بکەن لەفرۆشتنی ئەو موڵکانەی وەك بارمتە لەلای منە. ئەوەندەی دەزانم مێردی دایکت سەروەتەکەی تۆی هەموو لەناوبردووە.، منیش بڕیارم دا لە پەنجا هەزار فرانك لێی خۆش بم، بۆیە بەقەد ئەوە کۆمپیاڵەی بارمتەکانم بۆ گێڕاوەتەوە، جا تۆ دەتوانی پەنابەریتە بەر داداگ بۆ ئەوەی ئەم بەشەی خۆت بگێڕیتەوە. خاتوونەکەم



هیواخوازم ئەو دەستپێشخەریەی من لەبارۆدخی شێواوی ئێستات سوودێك بگەینێ. هەروەها هیوام وایە بەم دەستپێشخەرییە وەك پیاوێکی بەشەرەف ئەرکی خۆم بەجێگەیاندبێ، متمانەت هەبێت یادی تۆ وەك نەخشێك هەتاهەتایە لەدڵما دەمێنێ".

رووم بۆ پاولین وەرگێڕا و وتم:

-بابەتەکە روونە.

دواتر بە هەڵپە و بەتوورەیی وتم:

-جگە لەمە پێشبینی شتێکی دیکەت دەکرد؟

بە هێمنییەکی رووکەش، بەڵام لەرزینێك بەدەنگی دیار بوو، وتی:

-پێشبینی هیچ شتێکم نەکردووە، ماوەیەکی دوور و درێژە هەمان بۆچوونی منت هەیە: من بیرۆکەکانی ئەوم دەخوێندەوە.. وایدەزانی من هەوڵ دەدەم... وایزانی پێداگری دەکەم.....

ئەمەی وت و دواتر وەستا، لێوەکانی دەگەز لەنیوەی ڕستەکە وەستا و بێدەنگ بوو.

دوای چرکەساتێك وتی:

-بە ئەنقەست ڕقی خۆم بۆ ئەو دەردەبڕی، دەمویست بزانم چی دەکات. ئەگەر بروسکەکە دەگەیشت ئەوا ئەو پارەیەم پێ دەدایەوە، کە ئەو دەبەنگە (مێردی دایکم) قەرزاریەتی، دواتریش

دەرم دەکرد. ماوەیەکە بەرگەی بینینی ناگرم.. ئای ! پێشتر پیاوێکی دیکە بوو، بەتەواوی پیاوێکی دیکە بوو ! بەلاّم ئێستا چەند دڵخۆش دەبم بەوەی هەلی ئەوەم هەبێت ئەو پەنجا هەزار فرەنکەی بۆ فڕێ دەم و دواتریش تفێك لە رووخساری بکەم.

– بەلاّم ئەو کۆمپیالە و بەلگەی پەنجا هەزارییەکە لەلای ژەنەڕالە، دەتوانی بیگێڕێتەوە و بە دی گرێۆی بدەیتەوە !

– ئای ... بابەتەکان وەك یەکتر نین، وەك یەك نین !

–ڕاستە ڕاستە، ئێستا باروودۆخی ژەنەڕاڵ چییە؟ دەیەوێ چی بکات؟

دواتر لەناکاو وتم:

–ئەی داپیرە.

پاولینا بە پەشۆکاوی سەیری کردم و بە بێتاقەتی وتی:

–بۆ پرسیاری داپیرە دەکەی؟ من ناتوانم بچمە لای ئەو...

دواتر بەتووڕەیی وتی:

–داوای بەزەیی لەکەس ناکەم.

بەهەلپەوە وتم:



–چی بکەین؟ بەلاّم پێم بلێ: چۆن، چۆن توانیت دی گرێوت خۆشبویّ؟ ئەو زۆڵە چەپلەّە، ئەو زۆڵ و چەپەڵە، ئایا دەتەویّ بە شەرەشمشێر بیکوژم؟ ئێستا ئەو لەکوێیە؟

– لە فرانکفۆرتە، سیّ ڕۆژ لەویّ دەمینێتەوە.

بەجۆش و خرۆش و هەڵەشەوە وتم:

–یەك وشە بدرکێنە، سبەی بەیەکەم شەمەندەفەر دەڕۆمە لای .

دەستی کرد بە پێکەنین و وتی:

–لەوانەیە پێت بلێّ (سەرەتا پەنجا هەزارەکەم بۆ بگێڕنەوە!) پێتوایە رازی دەبیّ شەڕت لەگەڵ بکات؟ ئەم دەبەنگییە چییە!....

– چەند جارێك ددانەکانم جیڕ دەکردەوە، وەك ئەوەی لەناکاو بتوانم پارەکە لە سەر زەوی بدۆزمەوە، وتم:

– بەلاّم لەکویّ ئەو پەنجا هەزارە پەیدا بکەین، لەکویّ؟

لەناکاو بیرۆکەیەکی نامۆ بە زەینم هات و وتم:

–گویّ بگرە! ئەی مستەر ئاستلی؟

چاوەکانی بریسکەکەی دەدا، دواتر چاوەکانی لەسەر من جێگیرکرد و بە زەردەخەنەیەکی تاڵ وتی:

–ئایا دەتەویّ لەپێناو ئەو ئینگلیزە واز لەتۆ بهێنم؟



ئەوە یەکەم جارە بە راناوی تاك قسەم لەگەڵ دەکات. بێگومان لەبەر تووشی هەڵچوونەکەی سەری گێژی دەخوارد، بۆیە کەوتە سەر قەرەوێڵەکە ، زۆر ئاشکرا بوو تووشی شەکەتی و بێزاری بووە. منیش هەستم بەتارماییەك کرد چاوەکانمی دادەپۆشی، وەك ئەوەی لەبرووسکەیەك بینابیم لەدەست دابێ، لەشوێنی خۆم وشك بوو، چاو و گوێچکەم باوەڕ ناکات. ئەوا ئەو منی خۆشدەوێ. ئەوەتا هاتووەتە لام، نەچووەتە لای مستەر ئاستلی! ئەو کچێکی پاکیزەیە بە تەنیا بە بەرچاوی تەواوی خەڵك دێتە ژوورەکەم! بەردەوام لەشوێنی خۆم مامەوە، لە هیچ شتێك نەدەگەیشتم!...

لەناکاو بیرۆکەیەکی شێتانە لەلام گەڵاڵە بوو!

وتم:

-پاولینا، کاتژمێرێك دەرفەتم پێ بدە! تەنها یەك کاتژمێر چاوەڕوانم بکە.... دواتر دەگەڕێمەوە لات... دەبێت ئەوە... دەبینی.. لێرە بە.. لێرە بمێنەرەوە!

بەڕاکردن لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە، بێئەوەی وەڵامی نیگای پڕ لەپرسیاری بدەمەوە، هاواری کرد شتێکی وت، بەڵام من نەگەڕامەوە.

بەڵێ، خەیاڵەکەم زیاتر نزیك بوو لەشێتی، یان بەلایەنی کەمەوە، مەحاڵ بوو. ئەم جۆرە خەیاڵانە بەشێوەیەك لە بیرکردنەوەی مرۆڤ

دەچەسپن، وا دەزانیێ بەدی دێت، تەنانەت ئەگەر خەیاڵەکە پەیوەست بێت بەئارەزوویەکی بەهێز و سەرکێش، ئەوا کەسەکە دواجار وادەزانیێ بابەتێکی حەتمی و پێویستە، قەدەر هەر لە ئەزەلەوە سەپاندوویەتی. بۆیە دەبێت هەر بوونی هەبێت، دەبێت هەر رووبدات! لەوانەشە شتێکی دیکە زیاتر لەوە هەبێت: لێرەوە لەوانەیە هەندێك پێشبینی هەبێت مرۆڤ هەستی پیێ بکات، لە کۆششێکی لەرادەبەدەرەوە بێت کە ویست دەیسەپێنیێ، مرۆڤ بەخەیاڵ خۆی ژەهراوی دەکات، یان لەشتی دیکە... نازانم.....
بەلآم ئەو ئێوارەیە ( تا ماوم ئەوئێوارەیە لەبیر ناکەم) من تووشی سەرکێشییەك بوو وەك موعجیزە بوو. ئەگەر موعجیزە بە حیسابکردن لێك بدرێتەوە، ئەوا من هەر بە موعجیزەی دەزانم، بۆچی، بۆچی ئەو هەموو متمانەیە لە ناخ و دەروونم چەسپاوە، ماوەیەکی دوور ودرێژە؟ من بیری لیێ دەکەمەوە (دووبارەی دەکەمەوە) بیرکردنەوەم لەبارەی شتێکی شیاو نییە (کە جێگای دڵنیایی نییە) بەڵکوو بیرکردنەوەم لەسەر شتێك بوو کەهەر دەبێت روو بدات.

کاتژمێر چارەگێکی دەویست بۆ دە، چوومە گازینۆکە، پڕ بووم لە ئومێدێکی بەهێز، تەژی بووم لە هەڵچوونێکی بەهێز کە پێشتر نموونەی نەبووە. خەڵك هێشتا لە هۆڵەکانی قومار مابوون، هەرچەندە ژمارەیان نیوەی ژمارەی بەیانی دەبوو.

کاتژمێر یانزە کەسێك بەدەوری مێزەکانی قومار نامێنێتەوە، تەنها قومارچییە ڕاستەقینەکان نەبێت، ئەو قومارچییانەی بە تێڕوانینی ئەوان شتێك لە شاری ئاوە کانزاییەکان نییە، تەنها ڕۆلێت نەبێت. ئەوان تەنها لەپێناو ڕۆلێت هاتوون، خەریکە هەست بەوە ناکەن چی لەدەوروبەریان دەگوزەرێ، تەنانەت تەواوی وەرزەکە بایەخ بەهیچ شتێکی دیکە نادەن، هیچ کارێکیان نییە تەنها ئەوە نەبێت بەیانی و ئێوارە قومار دەکەن. بێگومان ئەو جۆرە قومارچییانە ئەگەر بکرێت، ئامادەن تەواوی شەو تا بەرەبەیان یاری بکەن، ئەوان تەنها بەداخ و پەژارەوە پەرت دەبن، کاتێك لەنیوەی شەودا دەرگای گازینۆکە دادەخرێت، بەر لەداخستنی دەرگای گازینۆ، واتە بەر لەنیوەشە یەکێك لە سەرپەرشتیارەکان رایدەگەینێ:" بەرێزان تەنها سێ هەڵدان ماوە". من بینیومە هەندێك جار ئەو جۆرە قومارچییانە ئامادەن لەو سێ کەڕەتە هەرچی لە گیرفانیان هەیە دای بنێن، هەر بۆیە لەو کاتەدا گەورەترین دۆڕان ڕوودەدات. بەرەو هەمان ئەو مێزە چووم کە داپیرە یاری تێدا دەکرد، لەبەر ئەوەی قەرەباڵغی زۆر نەبوو، زوو توانیم شوێنێك بۆ خۆم بگرم، تەواو لەمێزە سەوزەکە نزیك بووم کە وشەی (پاس)ی لەسەر نووسرابوو.

پاس ئەو زنجیرە ژمارەیە کە لە ١٩ دەوە دەڕوات تا ٣٦، کەچی زنجیرە ژمارەی ١ هەتا ١٨ بە (مانك) ناودەبرێت، بەلآم ئایا ئەو شتانە بەلامەوە گرنگ بوو؟ من حسێبم بۆ ئەو شتانە نەدەکرد،



تەنانەت نەمزانی کامە ژمارە دەرکەوت. هیچ پرسیارێکیشم نەکرد کاتێك دەستم بەیاری کرد، وەك هەر یاریکەرێك کەمێك ئاگاداریی و وریای هەبێت، بیست فردریکم لە گیرفانم دەرهێنا لەسەر پاسم دانا.
سەرپەرشتیارەکە هاواری کرد:

–بیست و دوو

بردمەوە، دووبارە بەهەمان برِ سەرکێشیم کرد، واتە دوو هێندەی یەکەمجار دامنابوو.

سەرپەرشتیار هاواری کرد:

–سی ویەك

دووبارە بردمەوە، کەواتە هەشتا فردریکم هەیە، تەواوی پارەکەم لە دوانزە ژمارەکەی ناوەڕاست دانا، ( قازانج لێرە سێ دەبێت نەوەك دوو، بەلاّم ئەگەری پێچەوانەیش هەر سێ دەبێت نەوەك دوو) یارییەکە خولایەوە، ژمارە بیستوچوار دەرچوو، سێ لوولپێچی پەنجا فردریکیم وەرگرت، لەگەلّ دە پارەی زێڕ، ئێستا دووسەد فردریکم هەیە.

جۆرە تایەك دایگرتم، تەواوی پارەکەم لەسەر سوور دانا. لەناکاو هاتمەوە سەر خۆم، ئەم ئێوارەیە یەکەمجار بوو هەستم بەترس کرد، بووم بە سەهۆلّ، دەست وقاچەکانم دەلەرزین، تۆقیو و وشك بووم، دۆڕان ئەو کاتە لەلای من مانای چی دەگەیاند!



قومارم به هەموو ژیانی خۆم کرد!

سەرپەرشتیار هاواری کرد:

–سوور.

گیانم هاتەوە بەر خۆم ، هەستم دەکرد مێرووولەیەك بە تەواوی جەستەم دێت و دەچێت. پارە کاغەزەم پێ درا، ئەو جارە پارەکە چوار هەزار فلۆرین و هەشتا فردریك بوو ( هێشتا توانای هەژمارکردن مابوو). دواتر وەك بەبیرم دێتەوە، دوو هەزار فلۆرینم لە دوانزە ژمارەکەی ناوەڕاست دانا، دۆڕاندم، ئەمجارە هەموو زێڕەکەم لەگەڵ هەشتار فردریکەکە دانا، دووبارە دۆڕاندم، زۆر تووڕە بووم: ئەو دوو هەزار فلۆرینەی لام مابوو، هەمووم لە دوانزە ژمارەکەی یەکەم دانا، هەر هەڕەمەکی دامنا، بێهیچ حسێبکردنێك، ساتی چاوەڕوانی کەوتمە هەڵچوونێکەوە، لەوانە هاوشێوەی هەڵچوومەکەی مەدام بلانشار بێت، کاتێك لە پاریز لە پەڕەشووتەکەی خۆی هەڵدایە خوارەوە.

سەرپەرشتیار هاواری کرد:

سەرلەنوێ بوومە خاوەنی شەش هەزار فلۆرین. ئێستا وەك سەرکەوتوویەکم، کۆڵ نادەم، چوار هەزار فلۆرینم خستە سەر ڕەش، نزیکەی دە کەسێك لەدوای من پارەکانیان لەسەر ڕەش دانا...



سەرپەرشتیارەکان لەنێو خۆیان کەوتنە مقۆمقۆ، خەڵکەکە بەدەم چاوەڕوانی قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد.

ڕەش دەرکەوت، لەو کاتەوە نە ئاگاداری بڕە پارەکە بووم، نە ژمارەی هەڵدانەکەم دەزانی، هەر هێندە دەزانم نزیکەی شانزە هەزار فلۆرینم بردەوە، وەك خەونێك بوو، دواتر بە سێ هەڵدانی نەگریس دوانزە هەزارم دۆڕاند، چوار هەزارەکەی ترم لە پاس دانا ( بەلاّم لەوکاتە خەریك بوو هەستم بەهیچ شتێك نەدەکرد، بەڵکوو وەك ئامێرێك بێ بیرکردنەوە چاوەڕوانم دەکرد) دووبارە بردمەوە، دواتر لە چوار هەڵدان بردمەوە، ئەوەندەم بەبیر هەزار هەزار فلۆرینم هەڵدەگرت، هەروەها لەبیرمە زیاتر پەیوەست بووم بە ژمارەکانی ناوەڕاست، کە زۆرجار دەردەچوو. تەنانەت وەك ڕێسایەك سێ چوار جار بەدوای یەك دەردەچوو، دوو کەڕەت ون دەبوو، دووبارە سێ چوار جاری دیکە دەردەکەوتەوە، ئەم جۆرە ڕێسایە کە هەندێك جار ڕوودەدات مایەی سەرسامییە، هەر ئەمەشە قومارچییە شارەزاکان سەرسام دەکات ، کە قەڵەم بەدەستەوە دەگرن و حسێبەکان لێکدەدەنەوە، لێرە بەخت چ گاڵتەجارییەکی تۆقێنەر دەرناخات؟

وابزانم هێشتا نیو کاتژمێر بەسەر گەیشتنم تێنەپەڕی بوو، کە سەرپەرشتیارێك پێ گوتم قازانجەکەی من گەیشتۆتە سێ هەزار فلۆرین، بۆیە خەزێنە لەیەك دانیشتندا لەو بڕە پارەیە زیاتر، بەرپرس نابێت، بۆیە ڕۆلێت تا سبەی بەیانیەکەی دادەخرێت. بۆیە

زێڕەکـەم هـەڵگرت و گیرفـانم پڕکـرد، دواتـر پـارە کاغـەزەکانم کۆکردەوە، بـەرەو هـۆڵێکی دیکـە ڕۆیشـتم کـە یـاری ڕۆڵێتـی تێـدا دەکرا، جەماوەرەکە بەراکردنەوە بەدوامەوە هاتن، زوو جێگایەکم بۆ کراوە، بێ حیسابکردن و هەڕەمەکی دەستم کردەوە بە قومارکردن. نازانم ئەوکاتە چ شتێك منی نەجات دا!

هەندێك جاریش بیرۆکەی ژمارەکان لەمێشکم دەهـات و دەچـوون، بەهەندێك ژمارەوە پەیوەست دەبووم، بەهەنـدێك ئەگـەر، دواتـر زوو وازم لـێ دەهێنـا، دووبـارە بێهـیچ هەسـتێك دەسـتم دەکـردەوە بەقومارکردن. گومـانی تێـدا نییـە مـن لـە حاڵـەتێکی تـەواو شـڵەژان بووم، لەبیرمـە چـەند جارێك سەرپەرشـتیارەکان یارییەکـەی منیـان ڕاسـت دەکـردەوە، ئـەگینا هەڵـەی کوشـندەم ئـەنجام دەدا، پۆلۆنییەکان هەڵـەپیان بـوو، خزمەتـەکانی خۆیـان بـۆ مـن پێشـنیاز دەکرد، بەڵام من گـوێم لەکەسێك نـەگرت. بـەخت یـاوەرم بـوو، لـێم دانەدەبڕا. لەناکاو هاوار و قاقا لەدەوروبەرم بەرز دەبووەوە، خـەڵك دەیـانگوت (بـژی ، هـەر بـژی !) تەنانـەت هەنـدێکیان چـەپڵەیان دەکوتـا، قازانجەکـەم جـارێکی دیکـە گەیشـتە سـی هـەزار فلـۆرین، دووبارە خەزێنە داخرایەوە، بۆ سبەی.

–بڕۆ، وازبێنە.



پیاوێک بەم شێوەیە لەلای ڕاستی من کەوتە منگە منگ، ئەو جولەکەیەکی فرانکفۆرت بوو، تەواوی کاتەکە لەتەکمەوە وەستابوو، وابزانم جارێك دووجار بەکەڵکەم هات.

دەنگێکی دیکە بە چرپەوە لە گوێچەکەی چەپم وتی:

-بۆ خاتری خودا تکات لێ دەکەم برۆ.

نیگایەکی خێرام کرد، بینم خانمێکی تەمەن سی ساڵی دەبوو، جلوبەرگێکی ساکاری پۆشیبوو، بەڵام ڕێکوپێك بوو، لە سیمای ماندوێتی و نەخۆشی دەردەکەت، بەڵام ئەوەی سەیری بکات دەزانێ جوانییەکی مەزنی هەیە، لەو ساتەدا گیرفانەکانم پڕ بوون لە پارەی کاغەز، پارەی زێڕیش لەسەر مێزەکە نەمابوو، سەفتەیەك پارەم دەرهێنا کە نزیکەی پەنجا فردریك دەبوو، بێئەوەی کەس تێبینی بکات، لە دەستی خاتوونە ڕەنگ بزرکاوەکەم نا، ئەمەیش وەك ئیعترافێك بوو بە شۆخییەکەی، ئەمە هەموو تەنها چرکەیەکی خایاند.

کاتێك هەموو پارەکانم کۆکردەوە، بە پەلە چوومە مێزی یاری (چلوسیێ). مێزی یاری چلوسیێ، خەڵکی ئەرستۆکراتی هامشۆی دەکەن، وەك رۆلێت نییە، بەڵکوو یاری کاغەزە، خەزێنەی ئەوێ بەرگەی سەد هەزار (تالێر) دەگرێت، گەورەترین دانانیش لەوێ چوار هەزار فلۆرینە، بەتەواوی لە ڕێساکانی ئەو یارییە ناشارەزا بووم، تەنانەت نەمدەزانی چۆن دابنێم، تەنها ئەوەندە نەبێت ڕەش و سوور



لەم یارییەش هەبوو، بۆیە پەیوەست بووم بەم دووانەوە. خەڵکی گازینۆ هەموو بەدوامەوە بوون، وابزانم ئەم ئێوارەیە تەنها یەکجار پاولینا هاتە خەیاڵم، کاتێك پارە کاغەزەکانم بەدەستەوە دەگرت و لەپێشم کەڵەکە دەبوو، هەستم بەچێژێك دەکرد، نەمدەتوانی بەرەنگاری ببمەوە.

وەك ئەوەی قەدەر بەراستی پاڵنەرم بێت، لەو کاتەدا شتێکی سەیر رووی دا، وەك ئەوەی بەئەنقەست بێت، هەرچەندە زۆر جار لەقومار روودەدات. بۆ نموونە بەخت پەیوەست دەبوو بە سوورەوە، وازی لێ نەدەهێنا، تەنها دوای دە یان پانزە کەرەت نەبێت، دوێنێ گوێبیستی ئەوە بووم، هەفتەی رابردوو بیستودوو جار سوور لەسەر یەك دەرچووە. کەسێك باسی ئەوە ناکات، تەنها دەڵێن لە رۆڵێت یەکجار ئەمە روویداوە و خەڵك پێیوە سەرسام بووە. بۆیە کارێکی ئاساییە، یاریکەرەکان واز لە سوور ناهێنن، دوای ئەوەی دە جار دەردەچێ کەسێك بوێری نییە لە سوور دابنێ. بەلاّم قومارچی شارەزا ئەو کاتە لەسەر رەش دادەنێت، کە دژەکەیەتی. قومارچی بەئەزموون دەزانی مانای (سەرکێشی رێکەوت) چییە. بۆ نموونە ئەگەر سوور شانزە جار دەرچوو، ئەوا قومارچییەکان دەزانن بە حەتمی کەرەتی حەڤدە رەش دەردەچێ، ئەو کاتە یاریکەری بەئەزمون پارەکانیان سێ هێندە لەرەش دادەنێن، بۆیە دۆرانەکەیان کوشندە دەبێت.



بەلاَم من سەرکێشیەکی سەیرم هەبوو، دوای دەرکەوتنی سوور بۆ حەوتەمین جار بەدوای یەکەوە، پێیوە پەیوەست دەبەم، من دەزانم حەزی خۆدەرخستن پاڵنەرێك بوو لەم سەرکێشییە، دەمویست بە سەرکێشی و لاساری سەرسامی بخەمە دڵی تەماشاکەرانەوە( بەڕاستی ئەمەش هەستێکی نامۆیە !)، بەلاَم بەڕوونی بەبیرمە، تینوێتیم بۆ سەرکێشی لەناکاو وایکرد، زیاتر بەرەو حەزی خۆدەرخستن بچم. دەروونی مرۆڤ وایە کاتێك بەدەست کۆمەڵێك هەستەوە دەناڵێنیّ، لێی تێر نابێت، بەڵکوو داوای هەستی نوێتر دەکات، بەردەوام توندتر دەبێت، تا دەگاتە حاڵەتی شەکەت بوون. من درۆ ناکەم کاتێك دەڵێم ئامادە بووم بە یەك کەڕەت سەرکێشی بە پەنجا هەزار فلۆرین بکەم، بەلاَم ڕێساکە ڕێگەی نەدەدا، خەڵك دەوروبەرم هاواری دەکرد و دەیانگوت (ئەمە شێتە) سوور چواردە جار لەسەر یەك دەرچوو.

ئەو پیاوەی لەتەنیشتم بوو وتی:

–ئەم بەڕێزە هەتا ئێستا سەد هەزار فلۆرینی بردووەتەوە.

هەرکە گوێم لەقسەکەی بوو، لەناکاو وریا بوومەوە. چۆن؟ ئەم ئێوارەیە سەد هەزار فلۆرینم بردۆتەوە؟ بەلاَم من پێویستیم بەوەندە زیاتر نییە! هەر یەکسەر بەپەلە پارە کاغەزەکانم خستە گیرفانمەوە بێئەوەی ڕێکیان بخەم، بێ هە ژمارکردن، دواتریش پارە زێڕەکانم کۆدەکردەوە، بە پەلە لە گازینۆکە دەرچووم. هەموو



خەڵکەکە پێدەکەنین کاتێك دەیانبینی بە گیرفانی پڕەوە، بەهۆی پارە زێڕەکانەوە بەزەحمەت هەنگاو دەهاوێژم و بە هۆڵەکان تێدەپەڕیم. پێموایە کێشی ئەو زێڕەی هەڵمگرتبوو نزیکەی نیو (پاود) دەبوو، چەندان کەس دەستیان پان دەکردەوە، منیش هێندەی دەهاتە بەردەستم پارەم پێ دەدان، دوو جولەکە منیان لەبەردەم دەرگاکە وەستاند و وتیان:

– تۆ سەرەڕۆی، زۆر سەرەڕۆی ! بەیانی سەفەر بکە، سبەی لە زووترین کاتی بەیانییەکە، ئەگینا هەموو شتێك دەدۆڕێنی !

گوێم نەگرت. تاریکییەکی ئەوتۆ لەڕێگەی داربەڕووەکان بوو، تەنانەت نەمدەتوانی دەستەکانم لەیەکتر جیا بکەمەوە، دووریی نێوان من و هۆتێلەکەش نزیکەی نیو فەرسەخ دەبوو. من هەر لەمنداڵییەوە، هەرگیز ڕۆژێك لە دز و ڕێگر نەترساوم، تەنانەت ئەو کاتەش نەترسام، دواتر بیرم نایەتەوە لەڕێگەی بیرم لەشتێك کردبێتەوە، مێشکم خاڵی، بەڵام هەستم بەچێژێك بەهێز و توند دەکرد، ئەویش چێژ بردنەوە، سەرکەوتن، هێز. نازانم چۆن گوزارشت لەحاڵەتی دەروونی ئەو کات بکەم، خەیاڵی پاولینا بەبەرچاوم بوو، بەرەو لای ئەو دەچووم.... بەزەحمەت ئەو شتەم بەبیر دەهاتەوە کە تازە کەمێك بوو بەمنی گوت بوو، هەر ئەوەش وای کرد بچمە گازینۆکە هەموو ئەو هەستە نوێیانەی لە کاتژمێر و نیوێك ناخی پڕکردبووم، ئێستا بووەتە بەشێك لەڕابردوو و



بەسەرچوو، تەنانەت سەیریشی ناکەین، هەموو شتێك لەنوێیەوە دەست پێ دەکاتەوە.

لەکۆتایی ڕێگەی داربەڕووەکان نزیك دەبوومەوە، ترسێك بەسەرم زاڵبوو، بەخۆم گوت" چی ئەگەر کوژرام و سامانەکە دزرا؟" هەنگاو بەهەنگاو ئەو ترسەم زیاتر دەبوو، تەنانەت لە ڕێگەی رام دەکرد، لەناکاو لەکۆتایی ڕێگەکە رووی دەرەوەی هوتێلەکەم بە هەزار ڕووناکییەوە لێ دەرکەوت، سوپاس بۆ خوا، ئەوا گەیشتم.

چوار پلەی قاندرمەکە بەیەکەوە دەبڕی، تا گەیشتمە ژوورەکەم، دەرگاکەم کردەوە، بینیم پاولین لەوێ دانیشتووە، لەبەردەم مۆمێك دەستەکانی لەیەکتر گیرکردبوو، دۆشدامابوو، سەیری دەکردم، بێگومان لەوکاتەدا رووخسارم نامۆ بووە، لەبەردەم وەستام، پارەکانم خستە سەرمێزەکە.





# بەشی پانزەم

پاولینـا سـەیری دەکـردم، بـێ ئـەوەی جوڵـە بکـات، تەنانـەت بـێ ئەوەی بـارودۆخی خـۆی تێـك بدا، منـیش دوایـن پـارەی لوولـدراوی گیرفانم دەرهێنا و بەهەڵپەوە وتم:

–سەد هەزار فرانکم بردەوە.

کۆمەڵێك پارەی کاغەز و دراوی زێڕ سـەر مێزەکـەی داپۆشـی بـوو. من نەمدەتوانی سەیری پاولینا بکەم، تەنانـەت هەنـدێك کـات بـوونی ئەوم لەیاد دەچوو، جارێك پارە کاغەزەکانم ڕێـك دەخسـت، لەسـەر یەك سەفتم دەکردن، جارێکی دیکە پـارە زێڕەکـان بـەجیا، جـارێکی دیکە هەمووم پەرت دەکرد و لەژوورەکە ئەمسەر و ئەوسـەرم دەکـرد لە خەونەکانم نقوم دەبووم، لە ناکـاو دەگەڕامـەوە سـەر ژماردنیـان، عەقڵم هاتەوە سەر لەناکاو چـووم دەرگاکـەم بـە دووجـار سـوڕاندنی کلیلەکـە قوفـڵ دا، دواتـر لەبەرانبـەر جانتاکـەم سەرسـام و دووڵ وەستام.

پاولینا پرسیاری کرد، منیش ئەوم بیرهاتەوە و ئاوڕم دایەوە:





-دەبێت هەتا بەیانی ئەو پارانە لەجانتاکە هەڵبگرم؟

هێشتا پاولینا لەشوێنی خۆی دانیشتبوو، جوڵەی نەکردبوو، بەلاّم سەیری منی نەدەکرد. گوزارشتێکی سەیر لەسیمای بەدی دەکرا، هەڵە نیم ئەگەر بڵێم گوزارشتی ڕقوکینە بوو.

بەپەلە لێی نزیك بوومەوە و وتم:

-پاولینا، پەنجا هەزار فلۆرین ببە، ئەمە زیاترە لە پەنجا هەزار فرانك، سبەی پارەکە ببە بەدەموچاوی بکێشە.

وەلاّمی نەدایەوە.

-ئەگەر دەتەوێ من سبەی خۆم پارەکەی بۆ دەبەم، ئایا دەتەوێ؟

لەناکاو دایە قاقای پێکەنین، ماوەیەکی زۆر پێدەکەنی. منیشی بەسەرسامی و بە ئازارەوە سەیرم دەکرد، ئەم پێکەنینە هاوشێوەی ئەو پێکەنیانە گاڵتەجارییەیە کە پێشتر لەبەرانبەر منی هەبوو (بەتایبەتی لەکاتی قسەکردن) کاتێك باسی هەستی خۆم و گڕی خۆشەویستی خۆم دەکرد. دواجار پێکەنینەکەی وەستا، بڕۆکانی تێك نا، بەنیگایەکی توند سەیری کردم، بە ڕقەوە وتی:

-هیچ شتێکی تۆم ناوێ؟

هاوارم کرد و وتم:

-چۆن ئەمە دەبێت؟ چی بووە؟ بۆچی ئەوها پاولینا؟

- بێ هۆکار هیچ شتێك نابەم.



–بەلاّم من وەك هاورێیەك پێشکەشت دەکەم، من ئامادەم هەموو ژیانم بۆ تۆ ببەخشم.

ماوەیەکی زۆر بە وردی سەیری کردم، وەك ئەوەی بیەوێ بەناخم ڕوو بچێ. بە پێکەنینەوە وتی:

–تۆ پیاوێکی بەخشندەی، دۆستەکەی دی گرییۆ شایەنی پەنجا هەزار فرانك نییە.

بەزمانی گلەیی وتم:

–پاولینا، چۆن دەتوانی بەم شێوەیە لەگەڵم بدوێی؟ من وەك دی گرییۆ نییم!

چاوەکانی سوور بووبوو، قیژاندی و وتی:

–ڕقم لێتە! بەڵێ.... بەڵێ.. زیاتر لە دی گرییۆ خۆشم ناوێی.

ئەمەی وت بەدەستەکانی ڕووخساری خۆی داپۆشت، تەوژمی توورەیی گرتی، بۆ لای ئەو چەمامەوە، زانیم لە کاتی ئامادەنەبوونم شتێکی بەسەرهاتووە، ئەوعەقڵی لەسەردا نەمابوو.

بە گریان وفیغانەوە دەیگوت:

–دەی بمکرە! ئەوت دەوێ؟ وەك دی گرییۆ بە پەنجا هەزار فرانك بمکرە! پاولینام خستە ناو باوەشی خۆمەوە، دەستەکانی و پێیەکانی ئەوم ماچ کرد، بۆی کەوتمە سەر ئەژنۆ.



تووڕەییەکەی نەما، دەستەکانی خستە سەر شانم، لە سیمای منی دەڕوانی، وەك ئەوەیە شتێك لەسیمام بخوێنێتەوە، گوێبیستی من بوو، بەڵام دیار بوو نەیدەزانی چی دەڵێم، لە دەموچاوی خەمێك دەردەکەوت، وەك ئەوەی لەخەونێك بێت. نیگەران بووم، وا هەستم کرد بەرەو شێتبوون دەچێت، بەنەرمونیانی لەخۆی دەگرتم، زەردەخەنەی متمانە و دڵنیایی لەسەر لێوانی دەرژا، لەناکاو منی لەخۆی دوورخستەوە، دووبارە لەمن دەڕوانی، دەموچاوی گرژ بوو.

لەناکاو قۆڵی دەگرتم و دەیگوت:

—تۆ منت خۆشدەوێ، ئەی وانییە؟ مادەمەکێ... تۆ لە پێناو من ئامادەبوویت لەگەڵ بارۆن بجەنگی!

لەناکاو قاقا پێکەنینی دەتەقییەوە، کاتێك یادگارییە پێکەنیناوییەکەی وەبیرهاتەوە، پێدەکەنی لەهەمان کاتدا دەگریا.

لەو کاتەدا دەمتوانی چی بکەم؟ خۆشم سەرگەردان بووم، دەستی کرد بە قسەکردن... بەڵام من لە شتێك نەدەگەیشتم. قسەکانی جۆرێك بوون لە وڕێنە، کاتێك بە پچڕپچڕ دەیویست باسی بابەتێکم بۆ بکات، بە پەلە قسەی دەکرد، لەناکاو دەکەوتە وڕێنە و ئینجا قاقای پێکەنین، منی ترساند.

ئەمەی دووبارە دەکردەوە،:

—نا،نا، تۆ کەسێکی باشی، تۆ دڵسۆزی منی.



دووباره دەستی دەخستەوە سەرشانم، لێم وردەبووەوە، دووباره دەیگوت:

–تۆ منت خۆشدەوێ، تۆ منت خۆشدەوێ... هەر منت خۆشدەوێ؟

چاوەکانم لەسەر لانەدا، هەرگیز پێشتر بەم حاڵەتە پڕ ناسکی و سۆز و خۆشەویستییەم نەبینیوە. ڕاستە ئەمە وڕێنەیەك بوو، ئێستا ئەو سەیری نیگا پەرۆشەکانی من دەکات، زەردەخەنەیەکی مەکربازانە و چەپەڵی لەسەر لێوەکانە، لەناکاو قسەی لەسەر مستەر ئاستلی دەکرد.

ئەو بێوچان قسەی لەسەر مستەر ئاستای دەکرد ( بەتایبەتی ماوەیەك لەمەوبەر کە دەیوست باسی بابەتێکم بۆ بکات) کەچی من نەمدەتوانی بەوردی لە مەبەستەکانی بگەم، تەنانەت پێموابوو گاڵتەی بەمن دەکرد، هەردەم ئەوەی دووباره دەکردەوە کە مستەر چاوەڕوانە، من لەوە حاڵی نەدەبووم کە ئەو لەژێر پەنجەرەکە لەچاوەڕوانی دایە.

–بەڵێ ، بەڵی ، لەژێر پەنجەرەکە لە خوارەوە، پەنجەرەکە بکەرەوە، سەیری ئەوێ بکە، وا لەوێیە !

ئەمەی وت و منی بەرەو پەنجەرەکە پاڵنا، هەرکە چومە لای پەنجەرەکە پێکەنینێکی شێتانەی کرد، لەنزیکی مامەوە، خۆ بەسەر من دادە و منی خستە باوەشی خۆیەوە.

–سەفەر دەکەین، بەیانی سەفەر دەکەین؟



منیش یەکسەر بە بیرۆکەکەی ڕازی بووم، بە بیرکردنەوەیەکی پەرتەوازەوە وتی:

-فریای داپیرە دەکەوین؟ تۆ چی دەڵێی؟ لەوانەیە بتوانین لە بەرلین بیدۆزینەوە، بە بۆچوونی تۆ چی دەڵێ کاتێك ئێمە دەبینی؟ ئەی مستەر ئاستلی؟.... مستەر ئاستلی لە لوتکەکانی شاخی شیلانگ بێرگ خۆی هەڵناداتە خوارەوە... ئەی وانییە؟ ( ئەمەی وت و دایە قاقای پێکەنین) گوێ بگرە: ئایا دەزانی ئەو دەیەوێ هاوینی داهاتوو بۆ کوێ بچێ؟ دەیەوێ بچێتە جەمسەری باکوور بۆ ئەوەی توێژینەوەیەکی زانستی بکات، داوای لێ کردم لەو گەشتەدا بەشداربم... ها ها ها! دەشڵێ ئەگەر ئەوروپا نەبووایە ئێمە ڕووس شتێکمان نەدەزانی، ئێمە کەڵکی هیچ شتێکمان نییە، بەڵام پیاوێکی باشە. ئایا دەزانی؟ ئەو پاساوی بۆ ژەنەڕاڵ دەهێنایەوە و دەیگوت خاتوو بلانش ... شەیدا بوون.... نازانم چی دەگوت ( ئەمەی دووبارەکردەوە قسەی بۆ نەدەهات). ئەوان داماون! زۆر بەزەییم پێیان دێتەوە، هەروەها بەزەییم بە داپیرە دێتەوە! گوێ بگرە، گوێبگرە، چۆن دەتوانی دی گرییۆ بکوژی؟ بەڵام تۆ نەتوانی بارۆن بکوژی ( ئەمەی وت دووبارە پێدەکەنی) ئەو ڕۆژە تۆ لەگەڵ بارۆن چەند پێکەنیناوی بووی! لەسەر کورسیەکەی خۆم سەیری هەردووکتانم دەکرد... چەند پەست و نیگەران بووی کە تۆم

رەوانەی لای ئەو کرد، ئەو ڕۆژە چەند پێکەنیم ! چەند پێکەینم ( پێدەکەنی و دەیویست رێگری لە قاقاکانی بکات).

دووبارە منی ماچکردەوە، منی بەسنگی خۆیەوە نووساند، بەسۆز وخۆشەوستی نیوچەوانی بەنیوچەوانی من دەنوساند،من بیرم لەهیچ شتێك نەدەکردەوە، گوێبیستی هیچ شتێك نەبووم، سەرم گێژ ببوو....

وابزانم کاتژمێر حەوتی بەیانی بوو هاتەوە هۆش خۆم، خۆر ژوورەکەی ڕووناك دەکرەوە، پاولینا لەشوێنەکەی خۆی دانیشتبوو، بەشێوەیەکی نامۆ سەیری شتەکانی دەوروبەری دەکرد، وەك ئەوەی لەتارکیی دەرچوویێ یادەوەرییەکانی کۆبکاتەوە، ئەمیش ماوەیەکی کەم بوو بێدار ببۆوە، بەوردی سەیری مێز و پارەکەی دەکرد. ویستم دەستەکانی بگرم، رێگری کرد، لەناکاو هەڵسایەوە. ئەم ڕۆژە زۆر سامانڵ نەبوو، بەر لەسپێدە باران باری بوو. پاولینا لە پەنجەرەکە نزیك بۆوە، پەنجەرەکەی کردەوە، نیوەی جەستەی بردە دەرەوە، چەند خولەکێك بەمشێویە مایەوە، ئاوڕی نەدەدایەوە، گوێبیستی قسەکانی من نەبوو. بیرۆکەیەکی ترسناکم بۆهات: دەبێت ئێستا چی ڕووبدات؟ بابەتەکە چۆن کۆتایی بێت؟ لەناکاو پەنجەرەکەی جێهێشت و گەڕایەوە لای مێزەکە، ڕقێکی بێ ئەندازە لە سیمای دەردەکەوت، لێوەکانی لە توڕەییان دەلەرزی،

وتی:

–ئێستا پەنجا هەزار فرانکەکەم خۆم بدەرێ!

منیش وتم:

–چیت بەسەرهاتووە؟ دیسان دەگەڕێینەوە سەر هەمان بابەت؟

– ئاخۆ بۆچوونی خۆت گۆڕیوە! ها ها ها. چییە پەشیمان بوویتەوە.

ئەو بیستوپێنج هەزار فلۆرینەی دوێنێ شەو ژماردبووم، هێشتا لەسەر مێزەکە بوو، پارەکەم دایە دەستی.

کاتێك پارەکەی بەدەستەوە گرت، بەنیگایەکی پڕ ڕق و کینە وتی:

–ئەمە ئێستا هی منە؟ وایە؟ وایە؟

پێم گوت:

–هەر لەسەرەتاوە هی تۆ بوو.

– باشە، ها ئێستا پەنجا هەزارەکەت بگرە !

ئەمەی وت و پارەکەی بەنێو چاوی من کێشا، پارەکە بەژوورەکە پەرت بوو، پاولیناش بەراکردن لە ژوورەکە چووە دەرەوە. من دەمزانی ئەو کاتەی عەقڵی لەسەر خۆی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەو شێتییە نەگەیشت. ڕاستە ئەو هێشتا نەخۆشە، چەند مانگێکە نەخۆشە، بەڵام هۆکاری ئەو حاڵەتە چییە، ئایا بۆ بەم شێوەیە



بەڕووی من دەتەقێتەوە؟ ئایا سووکایەتی بەکەسێتی ئەو کراوە؟ ئایا زۆر لەوە خەمبارە کە هاتووەتە لای من؟ ئایا بۆی دەرکەوتووە، من بە کامەرانییەکەم ریسوام، بۆیە دەمەوێ وەك دی گریۆ، بە پەنجا هەزار فرانك لەکۆڵ خۆمی بکەمەوە؟ بەڵام هیچ شتێکی لەم جۆرە ڕووی نەداوە... پێموابێ خەتاکە تەنها هی لەخۆبایی بوونی ئەوە، فیز و لەخۆبایی پاڵنەر بووە، تا متمانە بەمن نەکات و سووکایەتیم پێ بکات. هەموو ئەوانە لە زەینی ئەو ڕۆشن نەبوو، بەڵکوو بەپێچەوانەوە تەواو لێڵ بوو، بۆیە منی بەو شێوەیە سزادا، کە دەبوو دی گریۆی پێ سزا بدات، لەوانەیە منی بەخەتابار زانی بێت، کەچی من خەتایەکی ئەوتۆم نەبوو. ڕاستە هەموو ئەوانە هورێنە بوون، منیش دەمزانی ورێنە دەکات... بەڵام من سەرنجی ئەوم بۆ ئەم بابەتە ڕانەکێشا، ئایان ناتوانێ ئێستا لەمن خۆش بێت؟ بەڵام ئەگەر ئەم قسەیە بۆ ئێستا ڕاست بێت، ئەی ئەوەی دوێنێ. سەبارەت بە دوێنێ چی دەبێ؟ ورێنە و نەخۆشییەکەی بەم شێوەیە بەهێز نەبوو تا وا بکات ئەوە لەبیر بکات و نامەکەی دی گریۆ بهێنێتە لای من! کەواتە دەیزانی چی دەکات.

بەپەلە هەموو پارە و زێڕەکانم خستە ژێر جێگاکە و داپۆشی. تەواو بە دە خولەك دوای پاولینا لەژوورەکەم هاتمە دەرەوە، من لەوا دڵنیا بووم بۆ شوقەکەی خۆی گەڕاوەتەوە، بۆیە ویستم بێ هەرا و دەنگەدەنگ بخزێمە شوقەکەیان، لەسەر قاندرمەکە



پرسیاری پاولینام له خزمەتمەتکارەکە کرد، ئەو سەرسامی کردم کەو تیی پاولینا هێشتا نەگەڕاوەتەوە، بۆیە خزمەتکارەکە هاتووە بەدوای بگەڕێ.

بە خزمەتکارەکەم وت:

-ماوەیەکی کورتە لەلای من هاتە دەرەوە، نزیکەی دە خولەکێك دەبێ، دەبێ بۆ کوێ ڕۆیشت بێ؟

خزمەتکارەکە بەنیگایەك سەرزەنشتی کردم.

لەم کاتەدا بەسەرهاتەکە لە تەواوی هوتێلەکە باس دەکرا. میوانەکان بە چرپەوە قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، لەلای دەرگەوانەکە، لەلای بەڕێوەبەری خزمەتکارەکان، لەهەموو شوێنێك باسی ئەوە دەکرا ئەم کچە بەیانی کاتژمێر شەش بە راکردن، لەبەر باران رایکردووە بەرەو هوتێلی ئینگلترا ڕۆیشتووە. لە قسە وتوانجی ئەوان، لەوە گەیشتم هەموویان دەزانن ئەمشەو پاولینا لەژوورەکەی من بووە. دواتر دەستیان کرد بە قسەهەڵبەستن بۆ خانەوادەکەی ژەنەڕاڵ. ئەوان دەزانن دوێنێ ئەم کچە هۆشی لەدەست داوە، بەشێوەیەك گریاوە، تەواوی هوتێلەکە گوێیان لە گریان و فیغانی ئەو بووە. هەر بەم بۆنەشەوە وتوویانە داپیرە دایکی ژەنەڕاڵ لەرووسیا بە تایبەتی بۆ ئەوە هاتووە رێگری لەکوڕەکەی بکات زەماوەند لەگەڵ خاتوو دی گۆمێنگ بکات، ئەگیان لە میراتەکەی بێبەشی دەکات، ئەمیش بەداواکەی دایکی رازی نەبووە، بۆیە دایکی



بەئەنقەست دەیەویٚ سامانەکەی لە رۆلێت بدۆڕێنیٚ، تا شتێك بۆ کوڕەکەی نەمێنێتەوە. بەڕێوەبەری خزمەتکارەکان بە نارەزایی و بەرقەوە سەری دەلاقاندەوە و دەیگوت ( ئای لە رووسەکان! ) ئەوانی دیکەش پێدەکەنین. بەڕێوەبەری خزمەتکارەکان سەرقاڵی ئامادەکردن لیستی حیسابەکە بوو، دەیزانی دوێنیٚ شەو زۆرم بردۆتەوە، کارل کە خزمەتکاری نهۆمەکەی ئێمە بوو، بەر لەهەموو کەسێك پیرۆزبایی لیٚ کردم، منیش مێشکم بەشتێکی دیکەوە سەرقالٚ بوو، بۆیە بەپەلە بەرەو هوتێلٚ ئینگلترا رام کرد.

هێشتا کات بەرە بەیانە، مستەر ئاستلی لەم کاتەدا پێشوازی لەکەس ناکات، بەلاٚم کاتێك زانی ئەوەی هاتووە منم، بۆیە هاتە هۆلٚەکەوە، دەمێك بە بەردەوامی سەیری منی دەکرد، چاوەڕوانی قسەکانی من بوو، کاتێك پرسیاری پاولینام لیٚ کرد، چاوەکانی لەچاوی من بڕی بوو وتی:

– ئەو نەخۆشە.

–کەواتە ئەو لێرەیە؟

– بەڵی لێرەیە.

–بە نیازی لەلای خۆت دالٚدەی بدەی؟

– بەڵی.



– ئەی مستەر ئاستلی، ئەمە ئابڕووچوونە، ئەمە کارێکی مەحاڵە دواتر ئەو تەواو نەخۆشە... لەوانە تۆ تێبینی ئەوەت کردبێ.

–بەڵێ، پێشتریش پێم وتی ئەو نەخۆشە، ئەگەر نەخۆش نەبووایە تەواوی شەو لەلای تۆ نەدەبوو.

– ئایا تۆیش ئەمە دەزانی؟

–بەڵێ، دەبووایە بێتە لای من، ئەگەر دەهاتە لای من ئەوا رەوانەی ژنێکی نزیکی خۆم دەکرد، بەڵام ڕێگەی ون کردووە، هاتۆتە لای تۆ.

– کەواتە من دەست خۆی لەتۆ دەکەم ئەی مستەر ئاستلی؟ هەر بەم بۆنەیەوە، ئێستا شتێکت بیرخستمەوە، ئایا تۆ تەواوی شەو لەژێر پەنجەرەکەی من چاوەڕوان نەبویت؟ خاتوو پاولینا ناو ناوە داوای لێ دەکردم سەیری تۆ بکەم لەژێر پەنجەرەکەوە تێی دەڕوانی، ئەمە بۆ مایەی پێکەنین بوو.

–ئایا ئەمە دەکرێت؟ نەخێر لەژێر پەنجەرەکە نەبووم، من لەهۆڵەکە چاوەڕوان بووم، لەنزیکەوە هاتوچۆم دەکرد.

– دەبێت چارەسەر بکرێ.

– بەڵێ بەدوای پزیشکێکم ناردووە، ئەگەر بمرێ، دەزانم چۆن تۆڵەت لێ دەکەمەوە.

تووشی شۆک بووم.

–ئایا دەکرێ پێم بڵێی مەبەستت چییە؟



–ئایا ڕاستە دوێنێ تۆ دوو هەزار تالێرت بردووەتەوە؟

– تەنها هەزار فلۆرین بوو.

–ئەوها.... کەواتە دوای ماوەیەکی کورت دەچیتە پاریس

–بۆچی؟

– چونکە هەموو رووسەکان کاتێك پارەیان دەبێ دەچنە پاریس.... بەم شێوەیە مستەر ئاستلی قسەی دەکرد وەك ئەوەی کتێب بخوێنێتەوە.

– ئێستا لە پاریس چی بکەم، لە هاوین؟ مستەر ئاستلی من ئەوم خۆشدەوێ! تۆ ئەوە دەزانی.

–بەڕاستی؟ من پێموایە بەپێچەوانەوە... دواتر تۆ ئەگەر لێرە بمێنیتەوە، هەموو پارەکەت دەدۆڕێنی، ئەو کاتە پارەیەکی وەهات نابێ تۆ بگەینێتە پاریس. دەی خوات لەگەڵ، من تەواو دڵنیام ئەمڕۆ تۆ دەچیتە پاریس.

– باشە، ماڵئاوا، بەڵام من سەفەری پاریس ناکەم، بیر بکەوە مستەر ئاستی چی ڕوودەدا! ..... ژەنەڕاڵ... چیرۆکی پاولینا بەتەواوی شارەکە بلاو دەبێتەوە.

–بەڵی بەتەواوی شارەکە، من پێم وایە ژەنەڕاڵ هەر لەبنەڕەتەوە ئاگاداری ئەم بابەتە نییە، شتی دیکە هەیە پێیوە سەرقاڵ و بیری لێ دەکاتەوە. دواتریش خاتوو پاولینا دەتوانێ بەخواستی خۆی،



چەند بخوازیّ، لێرە بمێنێتەوە، سەبارەت بە خێزانەکەشی لە ڕاستیدا ئەم خێزانە هەر بوونی نەماوە.

کاتێك ڕۆیشتم بەسەرسامییەوە، بەو دڵنیابوونەی سەیرەی ئەو پێدەکەنیم، کە گوایە من ئەمڕۆ سەفەری پاریس دەکەم. لەبەرخۆمەوە دەمگوت: ئەگەر پاولینا بمریّ، ئەو دەیەویّ بەشەڕە شمێر بمکوژیّ... شتێکی نایابە! ... سوێند دەخۆم بەزەییم بە پاولینا دەهاتەوە... لەگەڵئەوەشد شتێکی نامۆ ڕوویدا، هەرکە لە مێزی قومار نزیك بوومەوە پارەکانم دەخستە سەر یەکەوە، ئەگەر گوزارشتەکەم ڕاست بێت، خۆشەویستی بووە بابەتێکی پلە دوو، من ئێستا ئەو قسەیە دەکەم، بەلأم ئەو کات بەڕۆشنی درکم بەو بابەتە نەدەکرد، کەواتە ئێستا من قومار چییم؟ ئایا خۆشەویستی من بۆ پاولینا... هێندە سەیر بوو؟ نەخێر..... من هێشتا خۆشم دەویّ، خودا شاهێدە... کاتێك لەلای مستەر ئاستلی ڕۆیشتم زۆر ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە ئازارم دەچەشت. کاتێك گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم بە توندی سەرزەنشتی خۆم دەکرد... کەچی لەو کاتەدا سەرکێشیەکی زۆر سەیر و دەبەنگانە ڕوویدا.

بە هەنگاوی خێرا بەرەو لای ژەنەڕاڵ دەڕۆیشتم، لەنزیك شوققەکەی ئەوان بینیم دەرگایەك کرایەوە، کەسێك بانگی کردم، ئەوە خاتوو دی کۆمێنگی بێوەژنە، بەفرمانی خاتوو بلانش بانگم دەکات، بۆیە منیش چوومە شوقەی خاتوونە گەنجەکەوە.

ئەوان لە شوقەیەکی بچووکی دوو ژووری بوون، پێکەنین و دەنگی خاتوو بلأنش لە ژووری نووستەکە دەهات، خەریك بوو لەنێو جێگای خەوتنەکەی هەڵدەستایەوە وتی:

–ها ... کەواتە تۆ؟ وەرە وەرە گەونجە! ئایا ڕاستە تۆ شاخێك لە زێڕ وزیوت بدرۆتەوە؟ بەهەرحاڵ من بەزێر کاریگەر دەبم.

بەپێکەنینەوە وتم:

–بەڵی بردمەوە.

–چەند؟

– سەد هەزار فلۆرین.

– چەند گەوجی! وەرە ژووریٚ وەرە! من گوێبیست نەبووم. جلەویٚ خۆمان بەردەدەین .. ئەی وانییە؟

کاتێك چوومە ژوورەکەی، لەنێو جێگاکەی ڕاکشا بوو، خۆی بە پێخەفێکی ئاوریشمی پەمەیی داپۆشتبوو، هەرچەندە هەردوو شانی ئەسمەر و خڕپی بەدەرەوە بوو، زۆر نایاب بوو، پیاو لە خەونیش نموونەی ئەو شانە نابینی، کراسێکی پەمووی تەنکی لەبەر دابوو، کە بە ئۆییەکی سادە نەخشابوو، جوانی پێستە بڕۆنزییەکەی زیاتر دەردەخست.

سەیری دەکردم و وتی:

–دڵت هەیە کوڕەکەم

بەخۆشـییەوە پێدەکـەنی، تەنانـەت پێکەنینەکـەی زۆر ڕاشـکاوانە بووم، منیش ڕستەکەی کۆرنیم تەواوکرد:

–شتێکی دیکە....

بە هەڵەشەوە وتی:

–هـا بینینـت ؟ بینیـت؟ دەی گۆرەوییـەکانم بێنـە لەپێیـەکانم هەڵکێشە. دواتر ئەگەر زۆر گەونج نەبی، ئەوا لەگـەڵ خـۆم دەتبەمـە پاریس،تۆ دەزانی من ئێستا سەفەر دەکەم.

–هەر ئێستا؟

– دوای نیو کاتژمێر

بەڕاسـتیش هـەموو شـتێك ئامـادەکرابوو، جانتاکـان پێچـرابوونەوە. قاوەشیان خواردبۆوە.

–ئەگەر ویستت، پاریست بینیوە ! پێم بڵێ: مانای وشەی ئۆچـیتل (بەخێوکەر) چییە؟ ئای چەند گەوج بووی، کاتێك بەخێوکەر بـووی! کوا گۆرەوییەکانم؟ بۆچی گورەوییەکان لەپێ ناکەی؟

ئەمەی وت پێیە بچووکەکانی دەرخست، بەڕاسـتی جـوان بـوو، دوو پێی ئەسمەر، ورد، هیچ پەڵەیەك یان شتێکی دیکە نەبوو، ئەم پێیـە بچـووکانە زۆر جـوانن کاتێـك لـەنێو پێڵاوەکـانی دەبـن، منـیش گۆرەویەکانم تا قاچەکانی هەڵکێشا، من پێدەکەنیم و ئەویش لەسـەر قەرەوێڵەکەی دانیشتبوو، بەردەوام هەڵەوەڕی دەکرد:



– هێی! ئەگەر لەگەڵ خۆمت بەرم چی دەکەی؟ سەرەتا من پەنجا هەزار فرانکم دەوێ، ئەو بڕە پارەیەم لە فرانکفۆرت پێ دەدەی، دواتر دەچینە پاریس، لەوێ بەیەکەوە دەژین، من بەڕۆژی ڕووناک ئەستێرەت نیشان دەدەم. لەوێ ژنی وەها دەبینی، لەژیانت نەتدیوە. گوێ بگرە...

– بزانە، من ئەگەر پەنجا هەزار فرانکت پێ بدەم چی بۆ خۆم دەمێنێتەوە؟

–ئایا سەد و پەنجا هەزار فرانکەکەت لەبیرچووە؟ دواتر من ڕازی دەبم، مانگێك، دوو مانگ لەگەڵت بژیم، نازانم؟ بێگومان لەماوەی ئەم دوو مانگەدا سەدوپەنجا هەزار فرانکەکە خەرج دەکەین. بینیت؟ کیژۆڵەیەکی چەند چاکم، من لەئێستاوە ئاگادارت دەکەمەوە. بەڵام وادەکەم ئەستێرەکان ببینی!

– ئەمە چۆن دەکرێت؟ هەر هەمووی بە دوو مانگ خەرج بکەین؟

–ئەمە دەتۆقێنێ؟ ئای کە تۆ کۆیلەیەکی خراپی! ئایا دەزانی مانگێك بەمجۆرە بژی لەهەموو ژیانت باشترە؟ تەنها مانگێك... دواتریش تۆفان! بەڵام ئێستا تۆ ناتوانی لەمە بگەیت! دە بڕۆ ڕێگەی خۆت. دەی دەی. تۆ نازانی چ شتێك شایەنی تۆییە. ئێی چی دەکەی؟



من خەریك بووم تاکی دووەم گۆرەوییەکەم لەپێی ئەو دەکرد، بەڵام نەمتوانی بەرگە بگرم، پێیەکانی ئەوم ماچ کرد، ئەویشت پێیەکانی کێشایەوە، بەنووکی پێی لەمنی دەدا، دواتر دەریکردم....

-دەی .. ئەی بەخێوکەر... ئەگەر ویستت چاوەڕوانت دەکەم. من دوای چارەکێکی دیکە سەفەر دەکەم.

بەهاوارکردنەوە وای گوت.

کاتێك گەڕامەوە ژوورەکەم، سەرم گێژ دەخواد.

لەبەر خۆمەوە وتم: کاتێك خاتوو پاولینا پارەکەی بەرووم کێشا، گوناهی من نەبوو، ئەم ئێوارە مستەر ئاستلی لەگەڵم مکووڕ بوو! هێشتا چەند کاغەزێکی پارە لەسەر زەوییەکە مابوو، من سەیرم دەکرد، ئەو کاتە لە دەرگای ژوورەکەم درا، بەڕێوەبەری خزمەتگوزارانی هوتێلەکە هاتە ژوورەوە (پێشتر حەزی بەچاری من نەبوو، سەیری نەدەکردم) داوای کرد شوێنی خۆم بۆ خوارەوە بگوازمەوە، شوقەیەکی نایابە، کە کۆنت (ك) ماوەیەکی کورت تێیدا دەحەوایەوە.

ساتێك بیرم دەکردەوە، دواتر وتم:

-لیستی حیسابەکەم بۆ بهێنە، من دوای دە خولەکی دیکە سەفەری پاریس دەکەم.

لەبەر خۆمەوە وتم: کەواتە بەرەو پاریس



بێگومان ئەوە قەدەری من بووە، ئەوەم لەچارە نووسراوە.

دوای چـارەگێکی دیکـە، بەیەکـەوە لەشـوێنێکی تایبـەتی نـاو شـەمەندەفەرەکە بەیەکـەوە دانیشـتین، مـن و خـاتوو بلانـش و دی کۆمێنگی بێوەژن. خاتوو بلانش سەیری منـی دەکرد و پێدەکەنی، هێنـدە پێکـەنی چاوەکانی تـەڕ ببـوو. نـاتوانم بڵـێم ئـەو سـاتە مـن دڵخۆش بووم، بەڵام ژیانم بۆ دوو بەش دابەشببووە. دوێنـێ پێـداگریم کرد لەوەی قومـار لەسـەر کاغـەز بکـەم، چـونکە پـارەم نـەبوو، مـن عەقڵی خۆم لەدەست دابـوو، ڕاسـتە هـیچ چارەیەکی لـەوە باشـترم نەبوو! لەچـرکە سـاتێك ئـەوەم بـۆ دەردەکـەوت کـە چوارچێوەکە گۆڕاوە:" من دوای مانگێك دەگەڕێمەوە.... ئەوکاتە چی لـەنێوانمان ڕوو دەدا.... لـەنێوان مـن و مسـتەر ئاسـتلی" بـەڵی ، ئەگـەر یادەوەرییـەکانم دروسـت بێـت، مـن ئـەو کاتـە هەسـتم بەخـەمێکی ترسـناك دەکـرد، کەچـی پـڕ بەگـەرووم لەگـەڵ بلانشـی دەبـەنگ پێدەکەنیم....

بلانش لەپێکەنینەکەی وەستا، بەسەرزەنشتکردنەوە وتی:

–بەڵام چیت دەوێ؟ بەڕاسـتی تـۆ دەبـەنگی... چـەند دەبـەنگی ! بەڵێ بەڵی دووسەد هەزار فرانکەکە بەیەکەوە خەرج دەکـەین، بـەڵام تۆ وەك پاشـایەکی بچـووك دڵخـۆش دەبیـت، مـن بۆیەنباغەکـەت بـۆ دەبەستم، بە (هۆتنس)ت دەناسێنم، ئەگـەریش هـەموو پارەکـەمان تەواو بوو، ئـەوا تـۆ جـارێکی دیکـە دەگەڕێیتـەوە ئێـرە، خەزێنەکـە



بەتاڵ دەکەیتەوە. دوو جولەکەکە چییان وت؟ بوێری و سەرەڕۆیی هەردووکیان یەک رەگیان هەیە، تۆ مرۆڤێکی بوێر و سەرەڕۆیی. چەندان جاری دیکە دێیتە پاریس پارەم بۆ دەهێنی. منیش داهاتێکم دەوێ نزیکەی پەنجا هەزار فرانك بێت. ئەو کاتەش....

قسەکانم بڕی و وتم:

–ئەی ژەنەڕاڵ؟

–ژەنەڕاڵ؟ خۆت دەزانی هەموو بەیانییەك ئەم کاتانە دەچێت دەستەگوڵێکم بۆ دەکڕێ، ئەو جارەیان بە ئەنقەست داوای گوڵێکم لێ کردووە، بوونی دەگمەن بێت، کاتێك گەڕایەوە، بەستەزمانە، دەزانێ باڵندەکە هەڵفڕیوە، ئەوجا بەدوامانەوە دێت.. دەبینی..ها هاها ئەمەیش زۆر دڵخۆشم دەکات، زۆر سوودم پێ دەگەیەنێ، مستەر ئاستلیش لێرە پارەکە لەبری ئەو دەدا....

بەم شێوەیە سەفەری پاریسم کرد







# بەشی شانزەم

پاریس، چی لەبارەی پاریسەوە بڵێم!

گومـانی تێـدا نییـە، هـەموو ورێنــە و ڕیزپــەری بـوو. تـەنها سـێ هەفتەیەك لەوێ مامەوە، لەماوەی ئەم سێ هەفتەیەی کۆتـایی سـەد هەزار فرانکم پێ بوو، دەڵێم تـەنها سـەد هـەزار، سـەدە هەزارەکـەی دیکە بە نەختینە و بەژمار بە خاتوو بلانشـم دا، پـەنجا هـەزاریان لـە فرانکفـۆرت و پـەنجا هەزارەکـەی دیکـە لـە پـاریس دوای سـێ ڕۆژ. دوای هەفتەیـەکیش هـەموو کۆمپیاڵـەکانم لەسـەر فـەرمانی ئـەو گۆڕیەوە.

– سـەد هـەزارمان مـاوە، بەخێوکـەری خۆشەویسـت لەگـەڵ مـن دەیخۆی ( هەر بە بەخێوکەر ناوی دەبردم).

بەلای مرۆڤەوە قورسە خەیاڵی بوونی کەسانێکی وەك بلانش بکات، بەو ڕادەیە بەگومان بێت، بەو رادەیە قرچۆك و پیسەکە بێت لەسـەر بابەتێك کە پێوەندی بە سامانی ئـەو هـەبێت. سـەبارەت بـەو سـەد



هەزارەی لەلای من مابووەوە، ئەوا بەڕاشکاو و بە پوختی پێی گوتم ئەو دەیەوێ لە پاریس سەقامگیر بێت، دەشیگوت:

– ئا ئەوەتا من دواجار لە پێگەیەکی گونجاو لەسەر پێی خۆم وەستام، کەس نابێت لەو شوێنە دامبەزێنێ. بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەکی زۆر ڕێکاری پێویستیم گرتووەتەبەر.

دواتر بە دڵنیایی، بەچاوەکانی خۆم ڕەنگی ئەو هەزاران فرەنکەم دەبینی: خاتوو بلانش خۆی سەرپەرشتی خەرجییەکانی دەکرد، لە جزدانەکەی کە هەموو ڕۆژێك بەسەری دەکردەوە، زیاتر لە سەد هەزار فرانك هەبوو، زۆرترین کات زیاتری تێدا بووە.

زۆر جار بەنیازپاکی دەردەکەوت کە دەیگوت:

–تۆ چ پێویستیەکت بە پارە هەیە؟

من دەمەقاڵێ و مشتومڕم لەگەڵ نەدەکرد.

لەبەرانبەر ئەوە، بەو پارەیە، ماڵێکی زۆر جوانی دانا، کاتێك منی بردە ناو خانووە نوێیەکە، من بەتەواوی خانووەکە گێڕا و وتی:

– ئەها بزانە بە کەمترین نرخ و لاوازترین داهات، چ فەراهەمی و سەلیقەیەك دابین دەکرێت.

لەگەڵئەوەشدا ئەو کەمترین نرخە،نزیکەی پەنجا هەزار فرانك بوو، بە پەنجا هەزارەکەی دیکەش گالیسکەیەك و ئەسپی کڕی، دواتر دوو ئاهەنگی سەماکردن سازکرد، مەبەستم ئاهەنگی شەوە، لەو ئاهەنگە



هەر یەکە لە (هۆرتنس) و (لیزیت) و (کیلۆپاترا) ئامادە بوون، ئەمانەش ژنانی خاوەن ناوبانگ، سەرەڕای ئەمەش سۆزانی چاکن. ناچار بوو لەکاتی ئەم ئاهەنگانە رۆڵی خاوەن ماڵ بگێڕم، پێشوازی لەمیوانەکان بکەم، قسە لەگەڵ هاوسەری بازرگانە تازە دەوڵەمەندبووەکان بکەم، کە ئەم ژنانەن بەشێکی مەزن لەبێ عەقڵی و فیکر بۆگەن بوون. هەروەها دەبووایە پێشواز لە ئەفسەرانی بچووك بکەم کە بەرگەی ئەوانم نەدەگرت، لەبەر نەزانی و دەبەنگی و کەشوفشیان، ئەمە سەرەڕای خەڵکێك گوایە نووسەری خەت خەتۆکی دەنووسن، یان ڕۆژنامەنووسی بێ مانا، کە نوێترین جلیان دەپۆشێ، خۆیان بەفیزەوە دەردەخست. بەشێوەیەك ئێمە لە بترۆسبۆرگ ناتوانین وێنای بوونیان بکەین، لێرەش کەم نیین.. .. تەنانەت گاڵتەیان بەمن دەکرد، بەڵام من رووم لە شامپانیا دەکرد، دەمخواردەوە تا تەواو مەست دەبووم، ئێنجا دەچومە ژوورەکەم دەنووستم.

خاتوو بلانش دەیگوت:

–ئەمە بەختێوەکەر بوو، دوو سەد هەزار فرانکی بردەوە، ئەگەر من نەبوومایە نەیدەزانی چۆن پارەکانی خەرج بکات، دواتر دەگەڕێتەوە سەر پیشەکەی خۆی، کەسێك هەیە لەئێوە کارێکی بۆ بدۆزێتەوە؟ دەبێت شتێك لەپێناوی ئەو بکەین.



من زۆرترین کات پەنام بۆ شامپانیا دەبرد، چونکە هەمیشە غەمبار بووم، بەشێوەیەکی ترسناك پەست بووبووم. لە ژینگەیەك دەژیام، تەواو بۆرژوازی و بازرگانی بوو، هەر فلێسك بەو ژینگەیە بەهەژمار بوو. بلانش لە پانزە ڕۆژی یەکەم ڕقی لەچارەی من بوو، من تێبینی ئەوەم کردبوو. ڕاستە ئەو بایەخی بە پۆشاکی من دەدا، هەموو ڕۆژێك خۆی بۆیانباغەکەی منی دەبەست، بەلاَم لەڕاستیدا ڕقی لەمن بوو، بەلاَم ڕقێکی بێوەی و دۆستانە! من بایەخێکم بەو ڕقە نەدەدا، لەبەر بێزاری و دلَتەنگی زۆر لەمالَەوە دەچوومە دەرەوە، زۆرترین کات بۆ (کۆشکی گولَەکان) دەچووم. تەواوی ئێوارەکانیش سەرخۆش بووم، دواتر خۆم فێری سەمای کانکان کرد (ئەمە جۆرە سەمایەك بوو، خالَی بوو لە ئابڕوویەك ) تەنانەت وام لێهات زۆر بەو سەماکردنە ناسرابووم. دواجار بلانش لەوە گەیشت هەلَسوکەوت لەگەلَ چ پیاوێك دەکات: سەرەتا وا خەیالَی دەکرد من تەواوی ماوەی پێوەندی نێوانمان بەدوای دەبم، قەلَەم وکاغەزێك بەدەستەوە دەگرم، خەرجییەکانی ئەو هەژمار دەکەم، دزییەکانی ئەو حیساب دەکەم، بڕوای وابوو دەبێت بەململانێیەکی پارەیەکی لەجۆری دە فرانکی لەمن وەربگرێت، وەلاَمی بۆ هەر هێرشێکی من ئامادەکرد بوو، کەچی تێبینی کرد من هیچ هێرشێك ناکەم، بۆیە ئەو پێش من کەوت، زمانی بەرەلاَ دەکرد، هێرشی دەکردە سەرم، کەچی من بێدەنگ دەبووم یەك وشەم نەدەدرکاند، بەلَکوو لە سەر قەنەفەکە ڕادەکشام سەیری ساپیتەی خانووەکەم دەکرد بەمەیش



سەرسام دەبوو. سەرەتا وایدەزانی من تەنها مرۆڤێکی گێلم نە زیاتر نەکەمتر، تەنها بەخێوەکەرێکم. بۆیە لەقسەکانی بێدەنگ دەبوو دەیگوت" مرۆڤی گێل تووڕە نابێت، لەخۆوە تێناگات". هەندێك جار لەماڵەوە دەردەچوو، دوای دە خولەکێك دەگەڕایەوە ( لەم ماوە کورتەدا شێتانە پارەیەکی زۆری خەرج دەکرد، کە داهاتەکانی ئێمە ڕێگە بەو خەرجییە نادات، وەك ئەو ڕۆژەی ئەسپەکەی بە دوو ئەسپی دیکە گۆڕیوە، شانزە هەزار فرانکیشی لەسەردا).

ئەو ڕۆژە لەمن نزیك بۆوە و وتی:

–ئازیزەکەم لەمن تۆڕە نییت؟

منیش بەدەستەکانم لەخۆم دوور خستەوە و وتم:

–نەخێر ... بەڵام تۆ پەستم دەکەی...!

بەڵام ئەو وەڵامەی زۆر بەلاوە سەیر بوو، بۆیە لەتەنیشتم دانیشت و وتی:

–گوێ بگرە، من پارەیەکی زۆرم بەو دوو ئەسپە داوە، چونکە بە هەلم زانی... دەتوانم ماوەیەکی دیکە بە بیست هەزار فرانك بیان فرۆشمەوە.

– باوەڕت پێ دەکەم، باوەڕت پێ دەکەم، دوو ئەسپی جوانن، ئێستا تۆ کەژاوەیەکی مەزن و نایابت هەیە، ئەمەیش سوودی بۆ تۆ دەبێت، لەمەودوا باسی ئەو بابەتەم لەگەڵ مەکە؟

–کەواتە تووڕە نییت؟

–بۆچی تووڕە بم؟ تۆ لەسەرهەقی کاتێك کڕیوتە، کەواتە دەبی بیکڕی، ئەمەیش لە داهاتوو سوودی بۆ تۆ دەبێ، من دەزانم تۆ پێویستت بەوەیە بەچەسپاوی لەسەر پێی خۆت بوەستێ، ئەگینا ملیۆن بەدەست ناهێنی، ئەو سەد هەزار فرانکەی هەمانە هێشتا سەرەتایە، تەنها دڵۆپێکە لە دەریاییەك.

من ئەو قسانەم کرد، کەچی بلانش چاوەڕوانی شتێکی دیکە بوو، ئەو چاوەڕوانی هاوار و گلەیی و سەرزەنشتکردن و ئەو جۆرە شتانە بوو، کەچ وانەبوو، بۆیە وەك کەسێك بوو، لەسەر هەوارەکانەوە دابەزیوە، وتی:

–کەواتە تۆ ئەوهای؟ بیرکردنەوەت هەیە و لەو حاڵەتە تێدەگەی ! دەزانی ڕۆڵەکەم؟ هەرچەندە تۆ بەخێوکەری، بەڵام بێگومان وەك مێرێك خەڵق کراوی، کەواتە تۆ داخت بۆ ئەو پارەیە نییە، کە بەخێرایی لەدەستمان رادەکات؟

– نەخێر، هیچ داخێکم بۆی نییە... ئەو سامانە با بۆ شەیتان بێت.... بە زووترین کات!



—بـەڵام ..... دەزانـی.... پـێم بڵـێ: ئایـا تـۆ دەوڵەمەنـد دەبـی؟ بەڵام.... تۆ ڕقت لەپارەیە، بە ڕقەوە خـەرجی دەکـەی، دواتـر چـی دەکەی.؟ پێم بڵێ....

—دەچمە هامبۆرگ، سەد هەزار فرانکی دیکە دەبمەوە.

— بـەڵێ، بـەڵێ.... دەبـێ ئەمـە بکـەی! نایابـە! مـن دڵنیـام تـۆ جارێکی دیکەش براوە دەبی. بە پارەکەتەوە بۆ ئێرە دێی، پێم بڵێ: هەر بەم شێوە چاکە هەڵسوکەوت دەکـەی، منـیش تـا کۆتـایی تـۆم خۆشـدەوێ، تـەواوی کاتـەکان تـۆم خۆشـدەوێ. هـەرگیز ناپاکییـت لەگەڵ ناکەم. دەبینی؟ ڕاستە بەم دواییە تۆم خۆشنەویستووە، مـن وامدەزانی تەنها بەخێوکەرێکی ( واتە خزمەتکارێکی، ئـەی وانییـە؟) لەگەڵئەوەشدا من دڵسۆزم بـۆ تـۆ، ناپـاکییم لەگـەڵ نـەکردووی. مـن کیژۆڵەیەکم ڕەوشتم بەرزە.

— واز لەو قسانە بهێنە! ئـەی تـۆ نـەبووی لەگـەڵ ئـەلبێر ناپاکیـت لەگەڵ کردم، ئەو ئەفسـەرە بچووکە ئەسمـەرە؟ وادەزانـی مـن بـەم دواییە تێبینیم نەکردووە؟

— ئۆی.... ئۆی.... بەڵام تۆ.....

— تـۆ درۆ دەکـەی، تـۆ درۆ دەکـەی، بـەڵام وا خـەیاڵ مەکـە ئەمـە تووڕەم بکات. بەهەر شـێوەیەك بێـت تـۆ دەری ناکـەی، ئـەو لـەمن



لەپێشترە، تۆش خۆشت دەوێ، بەڵام نەکەی پارەی پێ بدەی، ئایا گوێت لێیە؟

– کەواتە تۆ تەنانەت لەمەش توورە نییت؟ بەڕاستی تۆ فەیلەسوفی، ئایا دەزانی؟ بەڕاستی فەیلەسوفی...

بەجۆش وخرۆشەوە هەڵسایەوە و وتی:

–ئەوجا تۆم خۆشدەوێ، ئەوجا تۆم خۆشدەوێ... دەبینی، لێشم ڕازی دەبی!

لەوکاتەوە تۆزێك پەیوەست بوو بەمنەوە، تەنانەت تۆزێك هاوڕێیەتی خۆی من دەرخست. بەم شێوەیە دە ڕۆژی کۆتاییمان بەڕێکرد کەچی من ئەو ئەستێرانەم نەبینی کە بەڵێنی پێدابووم. لەهەندێك ڕووە بەڵێنەکانی خۆی بەجێهێنا، لەوانە بە هۆرتنسی ناساندم، ئەو ئافرەتێکی بێ وێنەیە، ئێمە بە تیریزی فەیلەسووف ناومان دەبرد.

لەگەڵ ئەوەیش لێرە بوار نییە، زیاتر باسی ئەو بابەتە بکە، ئەو خۆی لەخۆیدا بابەتی چیرۆکێکە، لە ڕەنگێکی تایبەت، بۆیە نامەوێ ئەم ڕۆمانەمی پێ بڕازێنمەوە. بەڕاستی من هیوای ئەوەم دەخواست هەموو شتێك بەخێرایی کۆتایی بێت، کەچی ئەو سەد هەزار فرانکەی هەمانبوو نزیکەی مانگێکی خایاند، بەڕاستی ئەمە سەرسامی کردم. بلانش لەو ماوەیەدا چەندان شتی جۆراوجۆری



کرپیوه، بەلایەنی کەمەوە نزیکەی هەشتا هەزار فرانکی خەرج کردووه، کەواتە ئێمە تەنها بیست هەزار فرانکمان سەرف کردووه... هێندەش بەسە، بۆ بلانشیش ددانم بەوەنا، ئێستا ئەویش لەگەڵ من ڕاستگۆیە(یان بەلایەنی کەمەوە لەهەموو شتێك درۆم لەگەڵ ناكات). ئەو ئیعترافی بەوە کرد من بەرپرسیار نییم لەو قەرزانە هەیەتی.

وتی:

–هەندێك لیست و چەکی پارە هەیە بە ئیمزای تۆیە، بەلاّم من بەزەییم بەتۆ دێتەوە، ئەگەر ژنێکی دیکە بووایە بێگومان ئەوەی دەکرد و تۆی ڕەوانەی زیندان دەکرد، دەبینی چەند تۆم خۆشدەوێ، دڵێکی باشم بۆ تۆ هەیە! ئەم هاوسەرگرییە نەگریسە، بۆمن پارەیەکی زۆری لێ دەکەوێتەوە.

لەگەڵ ئەوەیشدا هاوسەرگیرییەکە ئەنجام درا، ئەمەیش لە کۆتایی ئەو مانگە بوو کە بەیەکەوە بووین، دوایین پارەی سەد هەزار فرانکەکەمان خەرج دەکرد، بەم زەماوەندەیش چیرۆکەکە کۆتایی هات، واتە ئەو مانگە کۆتایی هات کە بەیەکەوە بە هاوبەشی دەژیایین، دواتر بابەتەکە بەفەرمی خرایە سەر مووچەکەوە.

بزانە ڕووداوەکان بەم شێوەیە بوو: دوای ئەوەی هەشت ڕۆژ لە پاریس نیشتەجێ بووین، ژەنەراڵ ڕاستەوخۆ هاتە لای بلانش، سەرەتا خەریك بوو لەگەڵ ئێمە دەمایەوە...

دواتر ڕاستییەکەی، شوقەیەکی بچووکی لەشوێنێك هەبوو. بلانش بە خۆشحاڵی پێشوازی لێکرد، ئەمەش بەهاواری سەرسامی و بە قاقای پێکەنین بوو. تەنانەت خۆی پێوە هەڵواسی. بابەتەکان بەشێوەیەك بەڕێوە دەچوو، دەتوانین بڵێین بلانش خۆی بە ژەنەراڵەوە هەڵدەواسی. دەبوایە لەگەڵی بچێتە هەموو شوێنێك: لەهەموو شەقامەکان یاوەری دەکرد، لەپیاسەکان، لەشانۆ، لەسەردانی هاوڕێیەکانی، لەهەموو شوێنێك لەگەڵ ژەنەڕاڵ بوو. ژەنەڕاڵ هێشتا شکۆی ماوە، سیمایەکی بە ویقاری هەیە، پێگەیەکی بەرز، باڵەیەکی کەلەگەت، ڕیش و سمێڵێکی ڕێك ( ژەنەڕاڵ لە سوپا لە خزمەتی سوارچاکی بوو)، هەرچەندە ڕووخساریشی کەمێك سیس بووە، لەگەڵئەوەشدا جوان هەڵسوکەوت دەکات، شارەزاییەکی بێوێنەی لە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان هەیە. لەپاریس هەموو نیشانەکانی قارەمانێتی دەرهێنا بە سنگی هەڵدەواسی. تەنانەت دەتوانرێت بگوترێ پیاسەکردن لەگەڵ پیاوێکی وەها نەوەك شیاو بوو، بەڵکوو زۆر پەسند و جێگای قبووڵکردنیش بوو.

ژەنەراڵی جوامێر و دەبەنگ لەوپەڕی خۆشحاڵی دابوو، ئەو کاتێك هاتە ماڵەکەمان لەپاریس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، بەڵکوو لە ترسا دەلەرزی، وایدەزانی بلانش بە هاوار و قیژە بەرەو ڕووی دەبێتەوە، یەکسەر فرمانی وەدەرنانی دەکات، کەچی ڕووداوەکان بەمشێوەیە نەبوو، ئەمەش سیحرێك بوو بۆ ئەو، بۆیە تەواوی مانگێکی بە



خۆشحاڵی و دڵخۆشییەك بەسەربرد، کە وەسف ناکرێت، وەك ئەو حاڵەتە بوو کە جێهێشتبوو. وەك زانیمان دوای سەفەرە لەناکاوکەمان لەرۆلتنبێرگ، ژەنەڕاڵ لەهۆش دەیێ، تەواوی هەفتیەك وەك شێت هەڵسوکەوت دەکات، قسەگەلێك دەکات، هیچ پێوەندییان بەیەکەوە نییە، تەنانەت قسەی پڕ وپوچ و بێ مانا دەکات. دەیانەوێ چارەسەری بکەن، بەڵام لە ناکاو هەموو شتێك لەوێ جێدەهێڵێ، سواری شەمەندەفەر دەبێت، یەکسەر بەرەو پاریس دێت. بۆ ماوەیەکی زۆر نیشانەکانی نەخۆشیەکە لەگەڵ دەژیا، هەرچەندە زۆر هەستی بەخۆش و شادی دەکرد، کەچی توانای بیرکردنەوەی نەمابوو، تەنانەت توانای نەبوو گوێ لە قسە بگرێت. کاتێك قسەت لەگەڵ دەکرد، دەیگوت (ئەوها) سەری رەزامەندی دەلەقاند، ئیتر هەموو بابەتەکە تەواو دەبوو، کێشەکە چارەسەر دەبوو. زۆربەی کاتەکان پێدەکەنی، بەڵام پێکەنینێکی شێتانە و نەخۆش. هەندێك جاریش بە مچ و مۆڕی دەمایەوە، سیمای وەك شەوی ئەنگوستەچاو بوو، برۆ ئەستورەکانی تێکدەنا. زۆر بابەت هەبوو لەبیر کردبوون، زۆرجاریش سەرگەردان بەتەنها لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد. تەنها بلانش دەتوانی ئەو بگرێنێتەوە ناو ژیان. کاتێك تەوژمی دڵتەنگی و خەمباری بۆ دەهات و خۆی لە سووچێك دەنا ئەمە بەڵگەی ئەوە بوو، بۆ ماوەیەکی زۆر بلانشی نەبینیوە، یان بلانش چۆتە دەرەوە لەگەڵ خۆی نەبردووە، یان لەبیری کردووە دڵنەوایی بکات. ئەگەر ئەو کاتانە پرسیارت لێ دەکرد، سۆراخی چی



دەکـات، نـەیتوانی وەڵامـت بداتـەوە، تەنانـەت خۆشـی نەیـدەزانی دڵتەنگە و ناخی غـەمبارە، بۆیـە کاتـژمێرێك یـان دووان، لەشـوێنێك دەمایەوە ( تێبینـی ئـەوەم کردبـوو کاتێـك بلانـش تـەواوی ڕۆژەکـە لەماڵ نەدەبوو، بەدوای ئەلبێرەوە بوو) لەناکاو سەیری دەوروبـەری خۆی دەکرد، بەشڵەژاوەی جوڵـەی دەکـرد، جارێـك سـەیری ئـەملا و جارێــك ســەیری ئــەولای دەکــرد، وەك ئــەوەی بیــەوێ شــتێکی بیربکەوێتــەوە، کەچــی ئــەو کــەس نــەدەبینی و شتێکیشــی بــیر نەدەهاتەوە، دووبارە دەگەڕایەوە حاڵەتی بێ جووڵەیی. بەمشێوەیە دەمایەوە تا بلانش بەدڵخۆشی و بـەرازاوەیی دەگەڕایـەوە، بـەقاقای پێکەنینــەوە، ماچـەکانی ژەنـەڕاڵی ژێـر دەکـردەوە، ئەمـەیش بـۆ ژەنەڕاڵ بەخششێکی بێهاوتا بوو. تەنانەت جارێکیان لە خۆشـحاڵیان ژەنەڕاڵ فرمێسکی هاتەخوارەوە، ئەمەیش تووشی سەرسامی کردم.

لەوەتەی ژەنەڕاڵ گەیشتووە، بلانش لەبەرانبەر من داکۆکی لـەخۆی دەکات، قسەی زۆر دەکات و لەشـێوەی وتـاری درێـژ. ئـەوەم بـەبیر دەهێنێتەوە گوایە بە هۆی منەوە ژەنەڕاڵی فریـوداوە، ئـەو شێوەی دەستگیرانێك بووە، بـەڵێنی شـەرەفی پێـداوە، ژەنـەڕاڵیش لـەپێناو ئــەو وازی لەخێزانەکـەی هێنــاوە، کەواتــە ئــەو لەخزمــەتی ژەنــەڕاڵ دەبــێ، بۆیــە دەبێـت مــن تێبگــەم... ئەگــەر مــن شــتێك لەویــژدانم هەبووایە نەدەبوو، لەوکاتانـەدا بـە یـەك وشـە وەڵای بدمـەوە، بۆیـە دواجار دامە قاقای پێکەنین، لێرە ئەو وەستا، ئەمەش مانای ئەوەیە



ئەو سەرەتا منی بە دەبەنگێك زانیوە، دواتر وای بەخەیاڵ هاتووە، من کوڕێکی جوامێرم ئاکار و خەسڵەتم بەرزە، دواجاریش من بەوە دڵخۆش بوو کە لەکۆتاییدا ڕەزامەندیی ئەو کچە بەڕێزەم بەدەست هێناوە ( بەڕاستی بلانش کچێکی نایاب بوو، بێگومان لە توخمی خۆی! سەرەتا بەهەق هەڵسەنگاندنم بۆ نەکردبوو! )

بەر لەکۆتاییەکە بەمنی وت:

–تۆ پیاوێکی چاك و ژیری.... لەگەڵ ئەوەشدا حەیف هێندە ئاژەڵی! ئەوەندەی دەژی شتێك قازانج ناکەی، نەخێر هیچ شتێك قازانج ناکەی! بەڕاستی تۆ رووسی !

چەندان جار بلانش داوای لێ دەکرم پیاسەیە بە ژەنەڕاڵ بکەم، وەك ئەوەی داوا لە خزمەتکارەکەی بکات لە هەوایەکی سافدا سەگەکەی بباتە دەرەوە، منیش ژەنەڕاڵم دەبردە شانۆ، بردمە نمایشی سەمای (مابیل)، چووینە چەندان رێستۆرانت. هەموو جارێك بلانش بڕێك پارەی پێدەدام تا لەو پیاسانە خەرجی بکەم، سەرەڕای ئەوەی ژەنەڕاڵ پارەی پێ بوو، حەزیشی دەکرد بەبەرچاوی خەڵکەوە جزدانەکەی دەربهێنێ. جارێکیان ناچار بووم پەنا بۆ هێز ببەم بۆ ئەوەی رێگری لە ژەنەڕاڵ بکەم خشڵێك نەکڕێ، کە پێشتر بلانش سەرسامی لە شەقامی (بورویال) خشڵەکەی بینی بوو، پێیەوە سەرسام بوو. ژەنەڕاڵ پێداگریەکی زۆری کرد ئەم دیارەییە بکڕێ کە نرخەکەی حەوسەد فرانك بوو، حەوسەد فرانك بۆ بلانش چییە؟



کەچی ژەنەڕاڵ خۆی هەزار فرانکی هەبوو. هەتا ئێستاش نەمزانی ئەو پارەیەی لەکوێ هێنابوو، بەڵام مەزندەی ئەوە دەکەم پارەکەی لەمستەر ئاستلی وەرگرتبێ، بەتایبەتیش کەدەزانی مستەر ئاسلی خەرجی هوتێلەکەی داوە.

سەبارەت بەوەی لەماوەیە ژەنەڕاڵ بایەخی بەمن داوە و بۆلای من گەڕاوەتەوە، بەمەزندەی من هۆکارەکە ئەوەیە هیچ کاتێك خەیاڵی ئەوەی نەکردووە، پێوەندی ڕاستەقینە لەنێوان من و بلانش هەبێت. ئەو بیستویەتی من سامانێکی زۆرم لە قومار بردۆتەوە، بەڵام گریمانەی ئەوە دەکات من وەك سکرتێری تایبەتی بلانش بم، یان خزمەتکار بم. بەهەرحاڵ بەفیزەوە قسەی لەگەڵ دەکردم، بەزمانی فرمان، تەنانەت ڕێگەی بەخۆی دەدا هەندێك جار سەرزەنشتم بکات. بەیانییەك کاتێك قاوەمان دەخواردەوە، ڕەفتارێکی نواند من و بلانش زۆر پێکەنین، ئەو زوو ئازاری خەڵکی نەدەدا، بەڵام نازانم بۆ بەو بەیانییە لە ئامادەبوونی من پەست بووبوو،( تەنانەت ئێستاش نازانم، لەوانەشە خۆشی هۆکارەکەی نەدەزانی) بۆیە دەستی کرد بەوتارخوێندن، قسەکانی سەر وژێری نەبوو، نە سەرەتا نەکۆتایی، تێکەڵ وپێکەڵ، وتی گوایە من هەرزکارێکی بەدفەڕم، ئەو فێرم دەکات چۆن بژیم، چۆن تێ بگەم... هتد. کەس نەیتوانی شتێك لە قسەکانی بگات، بلانش هێندە پێکەنی هێندەی نەمابوو لەهۆش خۆی بچێ، دواتر ئارامیمان کردەوە بەیەکەوە پیاسەیەکمان کرد.



تێبینـی ئـەوەم کـردووە هەنـدێك جـار تـەوژمی خـەمێکی گـەورە دایدەگرێ، وەك ئەوەی کەسەری بۆ بابەتێکی هـەبێت، بـۆ کەسـێك، یان هەسـت بکـات پێویسـتی بەکەسـێکە، سـەرەڕای بـوونی بلانـش. دووجار یان سێ جار هەوڵم دا، دڵنەوایی بکەم، ویستی ئەوەی نـاخی هەڵبڕێژی بەڵام من شتێکی ڕوونم لەقسەکانی دەست نەکەوت: قسەی لەسـەر خزمـەتی سـەربازی خـۆی دەکـرد، لەسـەر هاوسـەرە خواڵێخۆشبووەکەی، لەسەر زەوی و سامانەکەی. ئەگـەر وشـەیەکی پێ خـۆش دەبـوو، لـە ڕۆژێکـدا سـەدان جـار دووبـارەی دەکـردەوە، سـەرەڕای ئـەوەیش هـیچ شـتێکی لـەبارەی سـۆز وخـەیاڵی خـۆی نەدەدرکاند. هەوڵم دەدا قسە لەسـەرمنداڵەکانی بکـات، کەچـی وەك پێشوو، کاتێك دەکەوتە ناو قسان، دەچووە سەر بابەتێکی دیکە.

تەنها جارێك دڵی نەرم بـوو، سـۆزی جـولاً، ئـەو کاتـە بـەرەو شـانۆ دەچووین، وتی:

-بەڵێ بەڵی، منداڵەکان..... تۆ لەسەرهەقی... منداڵەکان.

دواتر لە ناکاو وتی:

-ئـەوان منـداڵی بەدبـەخت بـوو، بـەڵی ئازیزەکـەم، ئـەوان منـداڵی بەدبەخت بوون.

ئەو ئێوارەیە چەندان جار ئەو ڕسـتەیەی دووبـارە کـردەوە" ئـەوان منداڵی بەدبەخت بوون".



کاتێك ویستم قسه لەسەر پاولینا بکات، تووڕه بوو هاواری کرد:

– ئەو کچێك بوو سەرپێچی کرد! کچێکی شەڕانگیز بوو سەرپێچی کرد! شەرەفی خێزانەکەی لەکەدار کرد!

ئەگەر یاسا دەبوو خۆم دەمزانی چۆن تەمێی دەکەم.. بەڵێ بەڵێ!

بەڵام ژەنەراڵ هەرگیز بەرگەی ناوهێنانی دی گرێۆی نەدەگرت و وتی:

–منی وێران کرد.... لەهەموو شتێکی دامالّیم.... منی سەربڕی.... ئەو بۆ ماوەی دوو ساڵ دێوەزمەی من بوو. لەسنگم بوو لەخەونەکانم بوو.... ئەو ... وازی لێ بهێنە! هەرگیز لەلای من باسی مەکە!

تێبینی ئەوەم کردبوو، ڕێکەوتنێك لەنێوان ژەنەراڵ وبلانش هەیە، بەڵام وەك نەریتی خۆم بێدەنگ بووم هیچ شتێکم نەگوت. دواتر بلانش باسی ڕێکەوتنەکەی بۆ کردم، ئەمەیش هەشت ڕۆژ بەر لەرۆیشتنم بوو. نهێنیەکەی ئاشکرا کرد و وتی:

–ژەنەراڵ ئومێدی میراتی داپیرە هەیە. ئێستا بەڕاستی داپیرە لەسەرە مەرگە. مستەر ئاستلی نامەی ناردووە، باسی ئەوەی کردووە. بێگومان ژەنەراڵ میراتگریەتی. وا دابنێ ژەنەراڵ میراتیش وەرنەگرت، ئەوا هەرگیز نیگەرانم ناکات. یەکەم ژەنەراڵ مووچەی خانەنیشینی خۆی هەیە. دووەم لە ژوورێکی ئەوسەری ماڵەکە



نیشـتەجێیە زۆر بەمـە دڵخۆشـە.. منـیش ئەوکاتـە دەبم مـەدام ژەنـەراڵ، دەچـمە نـاو چـینێکی بـەرز(ئەمـە خـەونی بلانـش بـوو) دواتریش لە ڕووسەکان دەبم، کۆشـکم هەیـە، جووتیـارم دەبـێ، ئـەو ملیۆنەشم دەبێ کەی دەمەوێ هەمبێ!

وتم:

= چی دەکەی ئەگەر لێت هەڵگەڕایەوە.... خودا دەزانێ چی دەبێ؟ لە مەبەستم تێدەگەی ؟

—بەڵێ..... نا نا ئەمە هەرگیز ڕوونادات... ئـەو بـوێری نییـە ! مـن ڕێوشوێنی پێویسـتم گرتۆتـە بـەر، لـەم ڕووە هـیچ نیگـەران مەبـە ! ناچارم کردووە هەندێك چەکی بانك بەناوی ئـەلبێرەوە ئیمـزا بکـات، لەم ڕووەوە هیچ خەیاڵێکی نییە... ئەگەر وا بکات ئەوا یەکسەر سـزا دەدرێت:.. بۆیە جورئەت ناکات ئەم کارە بکات!

— کەواتە شووی پێ دەکەی.

بەڕاسـتیش زەماوەندەکـە بـێ ڕێـورەسمی تایبـەت ئەنجامـدرا، لەکەشێکی سادەی تـەواو خێزانـی، تـەنها ئـەلبێرو چـەند دۆسـتێکی نزیك بانگهێشت کران، بە ئەنقەست هـۆرتنس و کیلۆبـاترا و ئـەوانی دیکـە لـە ئاهەنگەکـە دوورخرانـەوە. زاوا زۆر بەجـددی دەرکـەوت، بلانش بۆیانباغەکەی بۆ بەست، ژەنەڕاڵی گوڵاوپرژێن کـرد، ژەنـەڕاڵ

جلێکی فەرمی و چاکتێکی سپی پۆشی بوو، وەك پیاوێکی شایستە و بەشکۆ دەردەکەوت.

کاتێك بلانش لە ژوورەکەی ژەنەراڵ هاتە دەرەکەوە، بەهێمنی وتی:

–لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی شایستەیە.

من نەچوومە ناو وردەکارییەکانی بابەتەکەوە، بەشداریم لەهەموو ئەو بابەتانە نەکرد، بەڵکوو تەنها وەك بێنەرێکی بێباك مامەوە. بەشێکی زۆری ئەو ڕووداوانەی ئەوسام لەبیرکردووە، بەلاّم ئەوەم بەبیردێتەوە، بلانش ناوی دو کۆمێنگ نەبوو(تەنانەت دایکیشی دی کۆمێنگی بێوەژن نەبوو) بەڵکوو ناوی دوپلاسیە بوو، بەلاّم بۆچی ئەو ناوەیان هەڵبژاردبوو.... هەتا ئێستا نازانم. ژەنەڕاڵ زۆر بەو ناوە کاریگەر بوو، تەنانەت ئەم ناوەی زۆر بەلاوە خۆشتر بوو نەوەك دوکۆمێنگ. ئەو بەیانییەی زەماوەندەکە کرا، ژەنەڕاڵ جلەکانی بەتەواوی پۆشی بوو، لە هۆڵەکە دەهات و دەچوو، بێوچان زۆر بە ڕشتی ئەوەی دووبارە دەکردەوە و دەیگوت:

( مەدمۆزیل بلانش دوپلاسیە، مەدمۆزێل بلانکا دیو پلاسیتا !..........)

ئەمەی دووبارە دەکردەوە، لە سیمای مانای ڕەزامەندی و ئاسوودەیی بەدی دەکرا، لە کڵێسا و لەماڵەوە لەکاتی نانخواردن، تەنها خۆشحاڵی بەسیمای دیارنەبوو،بەڵکوو سەرسامبوون و



خۆهەڵکێشی لێی بەدەردەکەوت. شتێك بەسەر هەردووکیان هاتبوو، تەنانەت بلانشیش بەسەنگینی و ویقارەوە هەڵسوکەوتی دەکرد.

رووخساری زۆربەسەنگینی دەردەکەوت کاتێك بەمنی وت:

–دەبێت لەمڕۆ بەجۆرێکی دیکە هەڵسوکەوت بکەم.... بەڵام دەزانی؟ شتێکی زۆر بێزارکەر بە خەیاڵم هات...دەزانی تەنانەت ناتوانم ناوی خانەوادەکەشم بیر بکەوێتەوە! زانگۆریانسکی، زاگۆریانسکی، مەدام ژەنەڕاڵ دی ساگۆ..... ساگۆ.... نەفرەت لەو ناوە رووسیانە ! هەر چۆنێك بێت.... ناوەکەم مەدام ژەنەڕاڵ دەبێت... لە چواردە پیت ! ئەمەش شتێکی چێژبەخشە.. ئەی وانییە؟

دواجار کە لەیەکتر جیابووینەوە، بلانشی دەبەنگ، کاتێك ماڵئاوایی کرد، هەندێك فرمێسکی رشت و وتی:

–دەزانی تۆ کوڕێکی چاك... وامزانی ئاژەڵی..... وا دەردەکەوتی، لەوانەیە ئەمەش بۆ تۆ گونجاو بێت.

دواجار کە تەوقەی لەگەڵ کردم، لەناکاو وتی (بوەستە!) ڕۆیشت لەژێر سەرینەکەی دوو کاغەزی دراوی هەزار فرانکی پێدام، پێشبینیم نەدەکرد ئەوە بکات!

وتی:



– ئەمــە ببــە، ســوودی لــیٚ دەبینــی. تــۆ وەك بەخێوکــەرێك زۆر ڕۆشنبیری، بەڵام وەك پیاوێك زۆر بــیٚ سـەوادی. مـن لەوەنـدە زیـاتر پـارەت پــیٚ نـادەم، دەزانم هــەمووی دەدۆڕێنــی. دەی . ماڵئــاوا ! هەردەم وەك دوو هاوڕیٚ دەمێنینەوە، ئەگەر جارێکی دیکە بردتەوە، هەلی ئەوە لەدەست خۆت مەدە، وەرەوە لام، زۆر دڵخۆش دەبیت!

هێشتا پێـنج سـەد فرانـك مـاوە، جیـا لـەوەیش کاتـژمێرێکی جـوانم هەیـە، نرخەکـەی هــەزار فرانـك دەبێـت، چـەندان دوگمـەی ئەڵماسـم هەیە، بەو هەموو دەتوانم ماوەیەك زۆر بیٚ خەم بژیم. ماوەیـەك لـەو شارۆچــکە بچــووکە بێزارکــەرە نیشــتەجێم، دەمــەویٚ بیرۆکــەکانم کۆبکەمــەوە، بەتایبــەتیش چـاوەڕوانی مســتەر ئاســتلی دەکــەم، لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بیسـتوومە، بـۆ مـاوەی بیسـت وچـوار کاتژمێر دێتە ئێرە بۆ ئەنجامدانی هەنـدێك کـاری تایبــەتی خـۆی.... ئەو کاتە هەموو شتێك دەزام.. ... دواتر.. دواتر .. یەکسەر دەچمە هامبۆرگ، بەلایەنی کەمـەوە، دوای سـاڵێك ناگەڕێمـەوە ڕۆلتنبێـرگ، دەگوترێت باش نییە، مرۆڤ دووجار بەختی خۆی لەیەك مێزی قومـار تاقیی بکاتەوە، بۆیە دەچمە هامبۆرگ لەویٚ یاری قومارکردن هەیە.







# بەشی حەفدەم

ماوەی بیست مانگ دەبیّ، سەیری ئەو یاداشتانەم نەکردووە، بەخەیاڵم نەهاتووە دووبارە بیانخوێنمەوە، ئەمڕۆ نەبێت، بەهیوای ئەوەم نیگەرانییەکانم لە بیر بباتەوە، بەشێك لە خەم و پەژارەم کەم بکاتەوە. لەقسەکانی ڕابردووم گەیشتمە ئەو شوێنەی کە بەرەو هامبۆرگ ڕۆیشتم. ئەی خودایە ! چەند سەرەڕۆ و چەندە بێعەقڵ بووم کە ئەو چەند دێڕەم نووسی، ئەگەر بابەتەکە سەرەڕۆیی و کەم عەقڵی نەبێت، ئەوا پێوەندی بە متمانەی دەروون و ئومێدەوە هەیە کە شوێنی لەق نابێت! ئایا هیچ گومانێکم لەخۆم هەبوو؟ ئەوا هەژدە مانگ بەسەر ئەو کاتەوە تێپەڕیوە، من لە حاڵێك دەژیم، حاڵی سواڵکەرێك لەمن باشترە! بەڵکوو من لەکویّ، سواڵکەر لەکویّ؟ من تەنها مرۆڤێکی سەرگەردان و هیچی تر! بارودۆخی من ناکرێت بە بارودۆخی کەس بەراورد بکرێت. من ئێستا بە زمانی ئامۆژگاری قسە ناکامە، لەو بارودۆخەی ئێستام هیچ شتێك لە ئامۆژگاری و وەعزخوێندن بیّ ماناتر نییە! ئاخ بۆ ئەوانەی لە خۆیان ڕازیین! ئای ئەو فیز و لەخۆباییەی لە قسەی کەسانی



زۆربڵـێ دەردەکـەوێت، کاتێـك ئامۆژگـاری خـەڵك دەکـەن و قسـەی نەسـتەق بـەکاردەهێنن! کاتێـك ئـەو جـۆرە کەسـانە هەسـت بـە بـارودۆخی ئێسـتای مـن دەکـەن، ئـەوا نـاتوانن وشـەی شـیاو بـۆ ئامۆژگاری و وانەکانیان بەکار بهێنن، ئایا ئەوان دەتـوانن پـێم بڵـێن من پێشتر چیم نەزانیوە؟ بەڵێ، بابەتەکە بەمشـێوەیەیە، بێگومـان بەم شێوەیەیە.... خولانەوەی چەرخەکە یەك کـەڕەتی دیکـە بێـت، هەموو شتەکان دەگۆڕێ، ئەوکاتەش ئـەو جـۆرە وەعزخوێنانـە، بـەر لەهـەموو کەسـێك دێنـە لام و (مـن دڵنیـام لـەوە) دەستخۆشـیم لـێ دەکـەن، وەك کەسـێك گاڵتەوگـەپ لەگـەڵ هاوڕێکانیـان بکـەن. وەك ئێستا سەرزەنشتم ناکەن، بەڵام من تف لە ڕووی ئەو جۆرە کەسـانە دەکەم! ئایا ئێستا من چیم؟ سفر! سبەی دەبم بەچی؟ دەکرێـت، مـن مردێتـی خـۆم زینـدوو بکەمـەوە و دەسـت بـەژیان بکەمـەوە. دەتوانم لـە دەروونـی خـۆم مرۆڤێکـی دیکـە بدۆزمـەوە، بـەر لـەوەی لەناوبچم.

بە ڕاستی چوومە هامبۆرگ.. دواتر بۆ ڕۆلتنبێرگ، سپا، بـادن، مـن ئەو کاتە وەك خزمەتکارێك بووم، خزمەتکاری ڕاوێژکار هێنـزی، ئـەو ڕۆڵـەی ببـووە سـەردار و گـەورەم. بـەڵێ، مـاوەی پێـنج مـانگ وەك خزمەتکار مامەوە، ئەمە یەکسەر دوای دەرچوونم بوو لە زیندان (مـن بـەهۆی نەدانـەوەی قـەرز دەسـتگیر کـرام، بـەڵام دواتـر کەسـێکی نەزانراو پارەکەی منی دابوو، نازانم مستەر ئاستلی بوو، پاولینا بوو،



یان هەر کەسێکی دیکە، بەلآم قەرزەکە نزیکەی دوو سەد تـالێر بـوو درایەوە و منیش ئـازاد کـرام) دەمتـوانی بـۆ کـویێ بچـم؟ ئـەو کاتـە چوومە خزمەتی ئەو پیاوەی ناوی هێنزی بوو، ئەو گـەنجێکی بـەرەلآ بوو، شەیدای تەمبەڵی بوو، من سیێ زمان بۆ قسە و نووسین دەزانم، سەرەتا منی وەك سکرتێر وەرگرت، بە مانگانەی سی فلۆرین، دواتـر کە نەیدەتوانی سکرتێری هەبێت، ئەوا مووچەکەی بڕیم، منیش هـیچ شـوێنێکم نـەبوو، بۆیـە لـەلای ئـەو مامـەوە خـۆم کـردە خزمـەتکار، لەبەرانبەر خزمەتەکەم خواردن وخواردنـەوەم هـەبوو، جیـا لـەوەیش لەماوەی پێنج مانگ توانیم حەفتا فلۆرین کۆبکەمەوە.

ئێوارەیـەکیان ئـەو کاتـەی لـەبادن بـووین، مـن پـێم وات وازم لـە کارەکەم دەهێنم، هەر ئەو ئێوارەیـە چـوومە رۆلێـت! ئەوکاتـە دڵـم کەوتە خورپەوە! لەبەر ئەوە نا دەبێت ئاگاداری ئەو پارە کەمە بم! .. نەخێر.... بـەڵکوو دەمویسـت ئـەو جـۆرە پیاوانـەی وەك هینـزی ببینم، بەڕێوەبـەری هوتێلـەکان، هـەموو ئـەو ژنـە شـۆخانەی بـادن، دەمویسـت هـەموو ئەوانـە قسـە لەسـەر مـن بکـەن وچـیرۆکی مـن بگێڕنەوە، بەمنەوە سەرسـام بن، هـەموویان ستایشـم بکـەن و پـێم هەڵبدەن، لەبەرانبـەر شـکۆی مـن بمێنـەوە، چـونکە بـەختێکی نـوێم هـەبووە... هـەموو ئەمانـە خـەونی منداڵانـە بـوو... بـەلآم ... کـێ دەزانێ...؟ لەوانە پاولینا ببینم، باسی بەسـەرهاتەکانی خـۆمی بـۆ دەکـەم، بـۆی دەسـەلمێنم کـە مـن لەسـەرووی هـەموو ئـەو بەختـە



پڕوپووچانەم! بەڵی ئەو پارەیە نەبوو دەبوایە ئاگاداری بم! من دڵنیام ئەگەر دووبارە قازانجێکی زۆر بکەمەوە، ئەوا بەژنێکی هاوشێوەی بلانشی دەدەم، سێ هەفتەی دیکە خۆ لە پاریس دەردەخەم، گالیسکەکەم دوو ئەسپ رایدەکێشن کە بەهاکەیان شانزە هەزار فرانك دەبێت. من دەزانم قرچۆك نیم... من دەزانم دەستبلاّو و زێدەڕۆم. لەگەڵ ئەوەشدا هەڵچوونێکی توندم هەبوو، دڵم تەنگ بووبوو، کاتێك گوێبیستی سەرپەرشتیارەکە دەبووم، هاواری دەکرد: سیویەك، سوور، تاك، پاس، چوار، ڕەش، جووت، مانك! چەند چاوبرسی و تەماعکار سەیری ئەو پارە زێڕانە و فردریك و تالیرانەم دەکرد، کە لێرەو لەوێ دانرابوون، یان ئەو زێڕانەی وەك پشکۆ دەبرسیکانەوە، سەرپەرشتیارەکە کۆی دەکردەوە، ئەی ئەو هەموو زیوانەی لەسەر یەکەوە کۆکرابوونەوە. بەر لەوەی بگەمە هۆڵەکە هێندەی نەمابوو بێ هۆش بم کاتێك گوێم لە زرینگانەوەی پارەی زێر و زیو دەبوو.

ئەم ئێوارەیەی بەرەو مێزی قومار چووم، حەفتا فلۆرینەکەی خۆم تێدا دانا، ئێوارەیەکی نایاب بوو. بە دە فلۆرین دەستم پێکرد لە پاسم دانا، لەخەیاڵم شتێکی وەك وروژاندن بۆ پاس هەبوو، دۆڕاندم. شەست فلۆرینم پێماوە، پارەکان زیون.. بیرم کردەوە، بژاردەکەم سفر بوو، پێنج فلۆرینم لە سفرِ دانا، ئەوا سفرِ سێ جار بەسەر یەکەوە دەرچوو، وام هەست دەکرد لە خۆشیان دەمرم،



کاتێك سەدو حەفتا و پێنج فلۆرینم وەرگرت، تەنانەت لەو ڕۆژەیش دڵخۆشتر بوو کە سەد هەزار فلۆرینم تێدا بردەوە. ئەوجارە سەد فلۆرینەکەم لەسوور دانا... بردمەوە... دواتر دووسەد فلۆرین لە سوور بردمەوە، ئەم جارە چوارسەد فلۆرین لە ڕەش بردمەوە، هەشت سەد فلۆرینم لە پاس دانا بردمەوە، ئەوەی ئێستا هەوا هەزار و حەوسەد فلۆرینە... ئەمە تەنها لەماوەی پێنج خولەك بوو. مرۆڤ لەوکاتە هەموو نەهامەتییەکانی ڕابردووی لەبیر دەچێتەوە. بۆیە جورئەتم کرد دەست بەسەرکێشی بکەم... ئەوەتا جارێکی دیکە لەریز پیاوانم !

ژوورێکم لە هوتێل بەکرێ گرت، دەرگاکەم بە کلیل قوفڵدا، سێ کاتژمێر مامەوە تا هەموو پارەکەم ژمارد. کاتێك هەڵسامەوە من ئیتر پیاوێکی ئازاد بووم، نەوەك خزمەتکارێکی ملکەچ بڕیارم دا ئەو ڕۆژە سەفەری هامبۆرگ بکەم، لەوێ وەك خزمەتکار نابم، ناچمە زیندانیشتەوە، بەڵام نیوکاتژمێر بەر لەسەفەرەکە چوومە رۆڵێت بۆ ئەوەی تەنها دووجار یان زیاتر قومار بکەم، لەوێ هەزار و پێنج سەد فلۆرینم دۆڕاند. لەگەڵئەوەشدا سەفەری هامبۆرگم کرد، مانەوەم لەوێ تا ئێستا دوو مانگی خایاندووە.

ئێستا من لێرە لە نیگەرانییەکی هەمیشەیی دەژیم. قومار ناکەم، تەنها کەمێك نەبێت، من بەدان بەخۆگرتنەوە چاوەڕوانم، لێکدانەوەی زۆرم هەیە، هەندێك ڕۆژ بەتەواوی لەنزیك مێزەکەی قومار



دەمێنمەوە، تەنها سەیر دەکەم، تەنانەت خەون بە یاریکردنەوە دەبینم... لەگەڵ ئەوەیش هەست دەکەم سەرگەردانم، کەوتۆمە زڵکاوەوە.. ئەم هەستەشم کاتێك بۆ دروست بووە کە بەمستەر ئاستلی گەیشتم، پێشت هەرگیز دیداری ئەوم نەکردبوو، ئەمەش بەم شێوەیە روویدا: لە باخچەیەکی گشتی دەڕۆیشتم، دەستبەتاڵ خەریکی لێکدانەوەکانی خۆم بووم، تەنها پەنجا فلۆرینم لا مابوو، ئەمەش دوای ئەوەی دوێنێ پارەی خەرجی هۆتێلەکەم دا، بۆیە ئێستا ناتوانم قومار بکەم، تەنها یەکجار نەبێت، ئەویش ئەگەر بە پارەیەکی کەم براوە بم، ئەگەر دۆرام... ئەوا دەبێت سەرلەنوێ ببمەوە خزمەتکار، ئەم بیرۆکەیە منی سەرقاڵ کردبوو، رۆیشتم بۆ ئەوەی پیاسەی رۆژانە بە باخچەی گشتی بکەم، کە لە ئاواییەکی نزیکە، چوار کاتژمێر دەڕۆیشتم ئێنجا بە ماندویی و برسێتی دەگەڕامەوە هامبۆرگ. کاتێك چوومە باخچەکە لەناکاو چاوم بە مستەر ئاستلی کەوت، کە لەسەر کورسیەك دانیشتبوو، کاتێك منی بینی بانگی کردم، لەتەنیشتی دانیشتم. لە رووخساری ئەو تێبینی سەنگینی و رشتبوونم کرد، منیش خۆشحاڵی و هەڵچوونم پێوە دیار بوون بەڕاستی بە بینینی ئەو دڵخۆش بووم.

مستەر ئاستلی وتی:



–کەواتە تۆ لێرەی؟ پێشبینیم دەکرد ڕێکەوتی تۆ بکەم، خۆت ماندوو مەکە بەوەی شتێکم بۆ باس بکەی، من هەموو شتێك دەزانم، هەموو شتێك، دەزانم ئەو دوو مانگە چییت سەر هاتووە.

وەڵامم دایەوە و وتم:

– ئەها .. کەواتە تۆ سۆراخی هاوڕێیە کۆنەکانت دەکەی، ئەوەش مایەی شەرەفە بۆتۆ. من ئەو کەسە نیم هاوڕێیەکانم لەیاد بکەم، بەلأم پێم بڵێ: ئێتسا شتێکم هاتەوە یاد، ئەی تۆ نەبووی لەزیندانی رۆلتنبێرگ منت دەرهێنا، کاتێك قەرزەکەی منت دایەوە؟ کەسێکی نەزانراو پارەکە من دابوو.

–نا نا ، من نەبووم.... بەلأم زانیومە تۆ لە رۆڵتنبێرگ بەهۆی قەرزەوە دەستگیرکراوی.

– ئایا ئەو کەسە دەناسی لەبری من پارەکەی داوە، منی ئازاد کردووە؟

–نەخێر، ناتوانم بڵێم دەزانم کێیە

– سەیرە ! من کەسێك لە رووسەکانی ئێرە ناناسم، بەو شێوەیە پارە لەبری من بدەنەوە. لێرە نییە، بەلأم لەولأتی خۆمان ئارسۆدۆکسەکان خۆیان لەپێناو براکانیان دەکەنە قوربانی، بۆیە پێموابوو ئەوەی قەرزی منی داوەتە کەسێك ئینگلیزی سەیر بووە، ئەم کارەی بە تاکرەوانە و ریزپەڕانە کردووە.



مستەر ئاستلی بەسەرسامیەوە گوێبیستی من بوو، بێگومان ئەو پێشبینی کردبوو، من بە خەمباری و سەرگەردانی ببینی.

تۆزێك گرژی بەنێوچەوانییەوە دیاربوو کە وتی:

–هەر چۆنێك بێت، ناچێتە عەقڵمەوە ئەوها وەك جاران بە سەربەخۆیی فیکر چاوم پێت بکەوێتەوە، تەنانەت سەلیقەیەکی خۆشت هەیە.

بەپێکەنینەوە وتم:

–ئەو چ خەیاڵ ئاسوودەییەکە پەستت دەکات، ئەی نابینی دەروون شەکەتە، کەرامەتم رووشاوە.

سەرەتا لەمانای قسەکانم نەدەگەیشت، دواتر کە تێگەیشت زەردەخەنەیەکی کرد.

–سەرسامم بە تێبینیەکانی تۆ، من لە وشەکانی تۆ ئەی هاوڕێیە کۆنەکەم، جۆش وخرۆش، ژیری، لەهەمان کات گاڵتەجاڕی دەدۆزمەوە، تەنها رووسەکان دەتوانن ئەو دژانە کۆبکەنەوە. ڕاستە مرۆڤ دەیەوێ چاکترین دۆستی خۆی بەریسوایی ببینی، لەو کاتەدا دۆستایەتی ڕاستەقینە دروست دەبێت. ئەمە هەقیقەتێکی کۆنە هەموو خەڵکانی زیرەك دەیزانن، بەڵام من دڵنیات دەکەمەوە، کاتێك تۆم بەوشێوەیە بینی، لەسەرخۆ، شەکەت نەبوو، بەدڵسۆزی



قومار بهێنی؟

– ها..... قومار با بۆ دۆزەخ بچێ! ... وازی لێ دەهێنم ئەو کاتەی .....

– ئەوکاتەی پارەکەی خۆت گەڕاندەوە، ئەی وانییە؟ من پێشبینیی ئەوەم دەکرد.... تەواوی مەکە... من دەزانم ئەو قسەیەت بێ بیرکردنەوە لەدەم دەرچوو... کەواتە ئەمە هەقیقەتە... بەڵام ئێستا پێم بڵێ: جگە لە قومار شتێکی کارێکی دیکە دەکەی؟

–نەخێر.

دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی من، هیچ شتێکم نەدەزانی، چونکە تەواوی ئەو ماوەیە سەیری ڕۆژنامەکانم نەکردبوو، قەڵەمم بەدەستەوە نەگرتبوو.

مستەر ئاستلی وتی:

–تەواو بێ سەواد و بێهۆش بوویت: تەنها ئەوە نییە وازت لە ژیان هێناوە، واز لە ئەرکە تایبەتەکان هێناوە، وازت لە کۆمەڵگا و ئەکەر مرۆییەکان هێناوە، واز لە هاوڕێیەکانت هێناوە ( تۆ هاوڕێت هەبوو) وازت لەهەموو ئامانجەکانت هێناوە، تەنها قازانج و بردنەوە نەبێت، تەنانەت پشتت لە یادگارییەکان کردووە... من بیرم دێتەوە ماوەیەکی سەخت و تووند تێپەڕ بوویت، بەڵام دڵنیام هەموو ئەو



مەینەتیانەت لەبیر کردووە، جوانترین هەستت، خەونەکانت هەموو لەبیرکردووە. ئارەزووەکانی ڕۆژانەت بووەتە بیرکردنەوە لە جووت و تاك، سوور و ڕەش، ژمارەکانی ناوەڕاست... هتد. من لەوە دڵنیام.

بە پەستی تەنانەت تۆزێك بە تووڕەیی وتم:

– بەسیەتی ، بەسیەتی ئەی مستەر ئاستلی، تکا دەکەم، تکایە ڕابردووم بە بیر مەهێنەوە. بزانە من هیچ شتێکم لەبیر نەکردووە، بەڵکوو ئەمانەم لە زەینی خۆم دەرکردووە، تەنانەت یادگارییەکانیشم... تا ئەو کاتەی بارودۆخەکەم دێتەسەرخۆ... ئەو کاتە دەبینی مردوویێتی خۆم زیندوو دەکەمەوە !

مستەر ئاستلی وتی:

– ئەمەیش بیست ساڵ دەخایەنێ. گرەوت لەگەڵ دەکەم ئەو قسەیەت بەبیر دەهێنمەوە، لەسەر هەمان ئەو کورسیە، ئەگەر ژیان دەرفەتمان پێ بدا.

بێ ئوقرە، قسەکانی ئەوم پچڕاند و وتم:

–باشە باشە.... بەسە ئیتر! بۆئەوەی بسەلمێنم من یەکێك نیم شتەکان لەبیر بکەم، ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی، پرسیارت لێ دەکەم، ئێستا پاولینا لەکوێیە؟ ئەگەر تۆ قەرزەکانی منت نەداوەتەوە، منت ئازاد نەکردووە، کەواتە پاولینا ئەو کارەی کردووە، هیچ هەواڵێکی ئەوم نەبیستووە.



بەزمانێکی توند و تووڕە وتی:

–نەخێر ... نەخێر، پێم وانییە ئەو قەرزەکانی تۆ دابێتەوە! ئێستا ئەو لە سویسرایە، زۆر دڵخۆش دەبم بەوە ئەگەر لەبارەی خاتوو پاولینا پرسیارم لێ نەکەی.

بێ ویستی خۆم پێکەنیم و وتم:

–کەواتە تۆیشی بە قووڵی زامدار کردووە؟

–خاتوو پاولینا، چاکترین بوونەوەرە لەسەر ئەم گۆی زەوییە شایەنی رێزگرتن بێت. دووبارە دەیڵێمەوە، زۆر دڵخۆش دەبم بەوەی پرسیارم لەبارەی ئەو لێ نەکەی. تۆ ڕۆژێك ئەوت نەناسیوە، بۆیە ئەگەر دەمت بەناوی ئەو بجوڵێنی ئەوا ناهەقی بەرانبەر هەستی ئاکاری من دەکەی.

– بەڕاست؟ بەڵام هەرچۆنێك بێت تۆ هەڵەی، ئایا قسە لەبارەی چییەوە بکەم، ئەگەر قسە لەسەر پاولینا نەکەم؟ ئایا تۆزێك بیرت لەمە کردۆتەوە؟ هەموو بیروەرییەکانمان پەیوەستە بە پاولیناوە، ناکرێت لەهیچ شتێك بترسی، هەرگیز نامەوێ پێوەندی گەرموگوڕی نێوانتان بزانم! ئەوەی مەبەستم بێت، ئەگەر دەربڕینەکەم دروست بێت، ئەوەیە دەمەوێ بزانم ژینگەی دەوروبەری پاولینا چۆنە، دەمەوێ بارودۆخی دەرەوەی بزانم، ئەمەیش دەکرێت بە دوو وشە بگوترێت.



– با بەخواستی تۆ بێت، بەڵام بەمەرجێ لەسنووری ئەو دوو وشەیە بوەستی، تێپەڕیان نەکەی. خاتوو پاولینا ماوەیەکی زۆر نەخۆش بوو، هێشتا نەخۆشە. ماوەیەك لەگەڵ دایك و خوشکم لە باکووری ئینگلتەڕا دەحەوایەوە. شەش مانگێك دەبێت داپیرە مردووە، ( بیرت دێتەوە ئەم ئافرەتە شێتە) بەتەنیا بۆ پاولینا حەوت هەزاری جێ هێشتبوو، ئێستا پاولینا لەگەڵ خێزانی خوشکەکە لەگەشتێکن لە سویسرا. وەسیەتنامەی داپیرە بڕێك سامانی بۆ خوشك و برا بچووکەکەی پاولیناش تەرخان کردبوو، ئەوان ئێستا لە لەندەن دەخوێنن. کەچی ژەنەڕاڵ کەمێردی دایکی پاولینا بوو، مانگێك دەبێت لە ئەنجامی خوێنبەربوونی دەماغ لە پاریس مرد، خاتوو بلانش چاودێر دەکرد، بەڵام توانی هەموو میراتەکەی ژەنەڕاڵ کە لەداپیرە دەمایەوە، بەناوی خۆی تۆمار بکات. وابزانم ئەمە هەموو شتێکە.

– ئەی دی گرێۆ؟ ئێستا ئەویش گەشتی سویسڕا ناکات؟

– نەخێر.. دی گرێۆ سەردانی سویسڕا ناکات، ناشزانم لەکوێیە، بەڵام بۆ دوایین جار ئامۆژگارییت دەکەم بە غەمزەوە لە بابەتەکان نزیك مەبەوە، بەشێوەیەك نزیك دەبیتەوە کە لەشوێنی خۆی نییە. ئەگینا من خۆم دەزانم چییت لەگەڵ دەکەم!

– چی ؟ ئەوە سەرەڕای دۆستایەتی دێرینمان؟

– بەڵێ...



– ئەی مستەر ئاستلی هەزار جار داوای لێبوردن دەکەم، داوا دەکەم لێم خۆش بی!  بەڵام ڕێگەم پێ بدە بڵێم بابەتەکە هیچ سووکایەتی نییە، بابەتەکانی دیکەش بەمشێوەیە لەشوێنی خۆیان نابن، من هەرگیز خاتوو پاولینا تۆمەتبار ناکەم.. جگەلەمەش نزیکبوونەوەی پیاوێکی فەڕەنسی، خاتوونێکی ڕووسی، بەشێوەیەکی گشتی، نە من نەتۆ دەتوانین بەتەواوی ڕوونی بکەینەوە و تێی بگەین.

– ئەگەر ناوی دی گریۆ بە ناوێکی تر پەیوەست دەبوو، داوام لێ دەکردی، ئەو قسەیەم بۆ ڕوون بکەیەوە، مەبەستت لە (فەڕەنسی بچووک) و (کیژۆڵەیەکی ڕووسی)چییە. بۆچی بەمشێوەیە: فەڕەنسییەك و کیژۆڵەیەکی ڕووسی؟

–ئایا بینیت؟ بابەتەکە پێوەندی بەتۆش هەیە، بەڵام چیرۆکەکە درێژە ئەی مستەر ئاستلی، دەبێت سەرەتا زۆر شت بزانرێت، دواتریش ئەمە بابەتێکی گرنگە، کەچی لەیەکەم تێڕوانین وەك گاڵتەیەك دەردەکەوێ. ئەی مستەر ئاستلی کابرای فەڕەنسی لەڕووی ڕووخسارەوە تەواو زراڤ و پۆشتە بوو، تۆ وەك بەریتانییەك ئەمە نابینی، منیش وەك ڕووسیەك ئەمە نابینیم، یا بەلایەنی کەمەوە لەڕووی ئیرەیی بێت، بەڵام کیژۆڵەکانمان تێڕوانینی دیکەیان هەیە، (ڕاسین) بەڕووالەت خۆنواندن ، خۆ دەرخستنی تێدایە، بەریقەدارە، تەنانەت ناتوانی بیخوێنیتەوە. منیش هەمان بۆچوونم هەیە، لەزۆر ڕووەوە شایەنی گاڵتەپێکردنە، کە     چی بمانەوێ یا

نا، شاعیرێکی مەزنە، سەرنجڕاکێشە. شێوەی نەتەوەیی فەرەنسی، مەبەستم پاریسییە، لە قاڵبێکی پۆشتە داڕژاوە، کەچی ئێمە ورچین. ئەوان شۆڕشی خانەدانانیان بەمیرات بۆ ماوەتەوە، تۆ بێماناترین کەسی فەرەنسی دەبینی، خاوەن جوڵەی زراڤە، کەشخەیە، دەربڕینی جوانی هەیە، تەنانەت بیرۆکەکانیشی بەرگی کەشخەیان پۆشیوە، تەنانەت ئەمانە هیچیان لە گیان و دڵی دا نییە، هەموو ئەمانەی بەمیرات بۆ ماوەتەوە. لەوانەشە لەخودی خۆیان ڤالآترین و خراپترین بوونەوەر بن. لەلایەکی دیکەوە، لەهەموو دونیا (مستەر ئاستلی من ئەوە ئێستا بەتۆ دەڵێم ) مرۆڤێك نییە بە قەد کچی رووسی متمانەی بەخۆی بێت و کراوە بێت، چاك و زیرەك بێت، بۆیە پیاوی وەك دی گریۆ هەرچەندە بەرووکەش و درۆش بێت، دەتوانێ بەئاسانی دڵی داگیر بکات، چونکە رووخسارەکەی دی گریۆ کەشەخە و بەبریقەیە. بابەتەکە بەمشێوەیەیە مستەرئاستلی. ئەو کچە وادەزانی ئەمە وێنەیەکی سروشتی گیان و دڵیەتی، نازانێ رووالەتێکە بەمیرات بۆی ماوەتەوە. دەبێت بۆتۆ دان بەوە بنێم لەوانەشە پێت ناخۆش بێ، کە دەڵێم ئینگلیز زێدەڕۆیی لەسیستەم دەکەن، بەلآم کەشخەیی و رەونەق بێبەشن. رووسەکان جیاکردنەوەی جوانیان داهێناوە، ئەوان شەیدا و تینوون بۆ جوانی، بەلآم جیاکردنەوەی جوانی رۆح و رەسەنایەتی کەسی،پێویستی بە برێکی زۆر سەربەخۆیی بۆچوون و ئازای ناخ هەیە، ئەمەش لەسەرووی توانای ژنەکانی ئێمەیە، ئەی چی لەبارەی



کیژۆڵەکانەوە ! خاتوو پاولینا( ببوورە ئەگەر ناوی خانەوادەکەی ئەوم بیرچووە) کاتێکی زۆری دەوێ تا ئەوە یەکلا دەکاتەوە زۆڵێکی وەك دی گریۆ بە پیاوێکی وەك تۆ بگۆڕێتەوە. ئەو بەها بۆ تۆ دادەنێ وڕێزت دەگری، ئەو هاوڕێی تۆیە، دڵی بۆ تۆ دەکاتەوە، بەڵام دی گریۆی دزێو، ئەو سووخۆرە نەگریسە سەرداری دڵی ئەوە، ئەمەش ماوەیەکی زۆر دەخایەنێ، تەنانەت ئەگەر کەلەرەقی و خۆبەزالزانیشی لەگەڵ دابێت. دی گریۆ ڕۆژگارێك وەك کەسێکی کەشخە و بەبەریقە بۆی دەرکەوتووە، بیرکردنەوەی ئازاد، دوور لەوەهمەکان، تونیویەتی هاوکاری خێزانەکەی بکات، یارمەتی ئەو ژەنەراڵە سەرەڕۆییە بدات، ڕاستە دواتر یارییەکانی ئاشکرا بوو، بەڵام ئەمە کاریگەرییەکی زۆری نییە. دی گریۆی کۆن بۆ ئەو زیندوو بکەنەوە، بزانن ئەو کچە چی دەوێ، هەرچەندە ڕقی بۆ دی گریۆی نوێ زیاد بووە، ئەو حەسەرتی بۆ دی گریۆی کۆن زیاتر دەبێت، تەنانەت دی گریۆی کۆن تەنها خەیاڵێکە. مستەر ئاستلی تۆ خاوەن کارگەی، وایە؟

-بەڵێ، من هاوبەشی پاڵاوگەیەکی گەورەم، بەناوی لوول و هاوبەشەکانی.

-کەواتە مستەر ئاستلی بینیت؟ خاوەن پاڵاوگەیەکی گەورە لەلایەکەوە هەیە، لەلایەکی دیکە ئاپۆلۆنی بلڤیدیر هەیە... ئەم دوو بابەتە یەك ناگرێتەوە. کەچی من تەنانەت خاوەنی پاڵاوگەش نیینم،

من تەنها قومارچییەکی بچووکم لەیاری رۆلێت، یان خزمەتکار بوو، خاتوو پاولینا بێگومان ئەمەش دەزانێ، چونکە چەندان سەرچاوەی هەیە بۆ وەرگرتنی هەواڵ.

مستەر ئاستلی چەند ساتێك بیرکردەوە و بەسارد وسڕی وتی:

-تۆ کەسێکی قین لەدڵی، بۆیە ئەو قسە پڕوپووچانە دەکەی، دواتر هەموو قسەکانت خاڵییە لە ڕەسەنایەتی.

-ڕاستە، بەڵام شتێکی ترسناك ئەوەیە، ئەی هاوڕێیە خانەدانەکەم، هەموو تۆمەتەکانم هەرچەندە پڕوپووچ بێت، لەگەڵئەوەشدا ڕاستگۆیانەیە، هەرچۆنێك بێت ئێمە هیچمان نەگوتووە، نەمن نەتۆ!

مستەر ئاستلی هاواری کرد، دەنگی لەرزۆك ببوو، چاوەکانی دەبرسیکایەوە:

-ئەمە قسەی بێ ئابڕوویانە و دەبەنگییە.... دواتر بزانە ئەی مرۆڤی کلۆڵ، ئەی مرۆڤی دزێو و بەدبەخت و سەرگەردان، من لەسەر فرمانی پاولینا هاتومەتە هامبۆرگ، بۆئەوەی تۆ ببینم، ماوەیەکی درێژ بەدڵێکی کراوە و تەواو ڕاشکاوانە، قسەت لەگەڵ بکەم، دواتر هەموو شتێك بۆ ئەو بگێڕمەوە.... سۆزت، بیرکردنەوەت، هیواکانت، یادگارییەکانت!

فرمێسکێکی زۆر لەچاوەکانم هاتەخوارەوە و بەهەڵەپەوە هاوارم کرد:



–ئایا ئەمە دەکرێ؟ ئایا ئەمە دەکرێ؟

نەمتوانی فرمێسکەکانم لە چاوەکانم قەتیس بکەم، وابزانم ئەمە یەکەم جار لەتەواوی ژیانم فرمێسکم دێتەخوارەوە.

مستەر ئاستلی وتی:

–بەڵێ ئەی بەدبەخت، ئەو تۆی خۆشدەویست، دەتوانم ئەوەت بۆ ئاشکرا بکەم، چونکە تۆ مرۆڤێکی گومڕای تازە تەواوبووی، ئەگەر بڵێم تۆی خۆشدەوێ، هێشتا تۆی خۆشدەوێ، سەرەڕای ئەوەیش تۆ هەر لێرە دەمێنیتەوە! بەڵێ، تۆ خۆت لەناوبرد، تۆ هەندێك بەهرەت هەبوو، خەسڵێکت هەبوو لەژیانەوە هەڵدەقولاً، هەرگیز دڵێکی پیس و دەروونێکی خراپت نەبووە، دەتوانی سوود بە وڵاتەکەت بگەیەنێ، کە زۆر پێویستی بە پیاوانە... بەڵام تۆ لێرە دەمێنیتەوە، ژیانت کۆتایی پێهاتووە. من تاوانبارت ناکەم، چونکە پێموایە رووسەکان هەموو وەك تۆن، ئەوان ئامادەن وەك تۆ بن، ئەگەر نەبنە نێچیری رۆلێت ئەوا دەکەونە داوای شتێکی هاوشێوە، دەکرێت هەندێك کەسی دەگمەن هەڵکەوتبێ! تۆ یەکەم کەس نیت نکۆڵی لەکارکردن بکەیت، بەڵکو رولێت بۆ رووس داهێنراوە، تۆ هەتا ئێستا پیاوێکی شەرەفمەندی، چونکە رازی بوویت بەخزمەتکاری و دزیت نەکرد.... بەڵام تووشی شۆك دەبم کاتێك پێشبینی دەکەم لە ئایندە چییت بەسەردێ. یان هەر ئێستا، بێگومان تۆ پێویستیت بەهەندێك پارە هەیە؟ ئەو دە ریاڵی زێڕ، لەمە زیاترت پێ نادەم، چونکە یەکسەر



هەمووی دەدۆڕێنی، ئەوەندە بگرە و خوات لەگەڵ بێ، ها بۆچی پارەکە وەرناگری؟

وتم:

-نەخێر مستەر ئاستلی، دوورتر لەوەی گوتمان.....

مستەر ئاستلی هاواری کرد:

-وەربگرە !... من باوەڕم هەیە هێشتا کەسێکی خانەدانی، من وەك هاورێیەکی نزیك ئەم پارەیەت پێ دەدەم، ئەگەر قەناعەتی تەواوم هەبێت کە واز لەقومار دەهێنی، یەکسەر هامبۆرگ بەجێدەهێڵی و دەگەڕێیتەوە وڵاتەکەی خۆت، ئەوا من ئامادەم هەزار پارەی زێڕت پێ بدەم، بۆئەوەی ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەیتەوە، بەڵام ئێستا تەنها ئەو دە ریاڵەت پێ دەدەم، نەوەك هەزار، چونکە هەردوو بڕە پارە لەلای تۆ وەك یەکە، بێگومان هەردووکیان دەدۆڕێنی، بگرە، خوات لەگەڵ.

- وەری دەگرم، بەو مەرجی ڕازی بی، ماچت بکەم.

- بەخۆشحاڵییەوە.

دەسلەملانێی یەکتر بووین، مستەر ئاستلی ڕۆیشت.

نا..نا... ئەو هەڵەبوو! کاتێك من دڵڕەق و نەزان بووم لە بابەتی پاولینا و دی گریۆ، ئەوا ئەویش دڵڕەق و نەزان بوو لەبارەی رووسەکانەوە. من داکۆکی لەخۆم ناکەم. بەهەرحاڵ.... ئێستا ئەوە



بابەتە گرنگەکە نییە: ئەمانە هەموو گوفتارن، ئێستا پێویستمان بەکردارە. بابەتی گرنگ ئێستا سەفەرکردنە بۆ سویسرا! بەیانی سەفەر دەکەم. ... ئای ... خۆزگە دەمتوانی ئێستا سەفەر بکەم، سەرلەنوێ دەبووژێمەوە، ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکەمەوە. دەبێ ئەوە بسەلمێنم... دەبێ پاولینا بزانێ من هێشتا دەتوانم ببم بە پیاو، ئەوەندە بەسە.... ئێستا کاتی ئەوە بەسەرچوو ئەمڕۆ سەفەر بکەم... بەڵام سبەی.... من شتێك لەناخم دایە، دەبێ ئەو شتە ڕووبدات! ئێستا دە ڕیالی زێرم هەیە، من بە پانزە فلۆرین دەستم پێکرد! • ئەگەر عاقڵانە و بەتێفکرین هەڵسوکەوت بکەم.... ئایا دەکرێ هێندە منداڵێکی بچووك بم؟ من تێنەگەیشتم، ئایا من مرۆڤێکی لەناوچوو و سەرگەردانم؟ بەڵێ، تەنها ئەوەندە بەسەر عەقڵم هەبێ و ددان بەخۆم بگرم، تەنها جارێك لەژیانم.... تەنها پێویستم بەوە هەیە ! دەبێ یەکجار لە ژیانم خاوەن ویستێکی بەهێز بم، بۆ ئەوەی لەیەك کاتژمێردا ژیانی خۆم بگۆڕم. هێزی ویست بابەتێکی زۆر گرنگە، تەنها ئەوەندەم بەسە بیر لەوە بکەمەوە لە حەوت مانگی ڕۆلتنبێرگ چیم بەسەرهاتووە، بەر لەوەی بەتەواوی وێران بم، ئەمە نموونەیەکی نایابە بۆ مکوڕبوون: هەموو شتێکم دۆڕاند... چەند فلۆرینێك ماوە هێشتا لەگیرفانەکەی سەر سنگمە، لەبەر خۆمەوە وتم" ئەوەی هەمە بۆ نانی ئێوارە بەشم دەکات" بەڵام کاتێك سەد هەنگاوێك ڕۆیشتم لەو بیرکردنەوەیە پاشەگەز بوومەوە، گەڕامەوە، فلۆرینێکم لەسەر مانك دانا (ئەمجارەیان مانك)



بەڕاستی کاتێك مرۆڤ سەرکێشی دەکات، هەستێکی نامۆ و دەگمەنی لەلا دروست دەبێت، تەنیا، لە وڵاتێکی بیانی، دوور لە نیشتمان و هاوڕێیان، نازانێ ئەم ڕۆژە چی بخوات، ئەمە دەڵێم کاتێك سەرکێشی دەکات، لەو حاڵەتەی بەدوواین فلۆریم، کەچی بردمەوە، دوای بیست خولەك لەگازینۆکە دەرچووم، سەد وحەفتا فلۆرین لەگیرفانم بوو، ئەمە ڕۆڵی دوایین فلۆرین بوو! ئەگەر خۆم ملکەچی داڕووخان دەکرد، ئەوا بەپێی پێویست ئازایەتییم نەدەبوو بۆ بڕیاردان.

بەیانی، بەیانی هەموو شتێك کۆتاییی دێت!

لە٢٢ / ٦/ ٢٠١٦
ئەم وەرگێڕانە تەواو بوو

